# ئاینی کۆن و کۆچکردن لە کوردستاندا

کۆکردنەوە و نووسینی
عەبدوڵڵا قەرەداغی
(مەلا عەلی)

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی راگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی




بەڕێوەبەرێتی
چاپ و بلاوکردنەوەی
سلێمانی

# ئاینی کۆن و کۆچکردن لە کوردستاندا


- ❖ نووسەر: عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی)
- ❖ بابەت: مێژوویی
- ❖ پیتچنی: نووسەر
- ❖ نەخشەسازیی بەرگ: ئەکرەم محەمەد ئەمین
- ❖ نەخشەسازیی ناوەوە: نەورۆز جەمال ئەمین
- ❖ سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
- ❖ قەبارەی کتێب: A5
- ❖ ژمارەی لاپەڕە: ٣١٦
- ❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٤٣)
- ❖ تیراژ : (٥٠٠) دانە
- ❖ چاپ: چاپخانەی کەمال
- ❖ نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- ❖ ژمارەی سپاردنی (١١٧٤)ی ساڵی ٢٠١٣ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی پێدراوە.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**
**گردی ئەندازیاران**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

## کوردستان

کوردستان یەکێکە لە کۆنترین ئەو جێگایانەی کە یەکەمین کۆڕ و کۆمەڵی ئادەمیزادی تێدا نیشتەجێ بووە، وەکو خوزستان و نێوان دوو ڕووبار، زەوی کورد و کوردستان دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی ئاسیای خۆرئاوا.

یەك وڵات پێك ناهێنێت. زەوی کوردستان دابەش بووە بەسەر ئێران و تورکیا و عێراق و سوریادا و بەشێك لە سۆڤییەت وەك ئازەربایجان و ئەرمینیا.

وشەی کوردستان باوەڕپێکراو نییە لە ڕووی قانوونی و دەولییەوە، بەکار ناهێنرێت لە نەخشە و پەرتووکی ئەتەڵەسیدا، کوردستان دەکەوێتە هێڵی درێژی (٣-٤) پلە لە خۆرهەڵاتەوە (٣٧-٤٨) پلە لە باکوورەوە.

بەپێی خشتەی ناوچەی لێکۆڵینەوەی کوردی لە پاریس (٠٠٠ر٥٠٠)کم[٢] یە، کە لە ساڵی (١٩٤٩)دا دیاریکراوە. زۆری کە باسی سنووری کوردستانیان کردووە، (جەلال تاڵەبانی) لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی (٤٠٩٦٥٠)کم[٢] یە و درێژیی کوردستان لە باکوورەوە بۆ باشوور بە (١٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر، پانتایی تێکڕای بە (٢٠٠) دووسەد کیلۆمەتر و لە بەشێکی باشوورییەوە و لە باکوورەوە زیاتر دەبێت.

دكتۆر عیسمەت شەریف وانلی لە کتێبی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا پێوانەی کوردستان بە (٥٠٠ر٠٠٠)کم[٢] دادەنێت.

هەروەها مینۆرسکی دەڵێت: دەشێت گەلی کورد لە دەسپێکی مێژوودا لە خۆرهەڵاتەوە (خۆرهەڵاتی ئێران) ڕووەو خۆرئاوا (کوردستانی ئێستا) کۆچی کردبێت و تێیدا نیشتەجێ بووبێت، ئەم بۆچوونەش لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامیدا و لە (مادەی کورد)دا بڵاوکراوەتەوە، دواتریش لەو ڕاپۆرتەدا کە پێشکەش بە کۆنگرەی بیستەمی خۆرهەڵاتناسی کردووە لە برۆکسل لە ساڵی (١٩٣٨) باسکرا، ئاماژە بەوە دەکات کە کورد نەتەوەی میدییەکانن کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینییەوە لە ناوچەکانی باشووری دەریای قەزوینەوە بەرەو خۆرئاوا بۆ کوردستان کۆچیان کردووە، پاشان لەدوای ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی ئاشوور لە ساڵی (٦١٢) پ.ز لە میسۆپۆتامیادا بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبوونەتەوە.

بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم بۆچوونە، د.جەمال ڕەشید ئەحمەد، دەڵێت: ئەگەر ئێمە دان بە ڕاستی ئەم بۆچوونەدا بنێین، ئەوا پێویستە کە پەیوەندی نێوان کوردەکانی ئێستا و دانیشتووانە کۆنەکانی کوردستان کە لەپێش میدییەکاندا لە کوردستاندا نیشتەجێ بوون، لێکدابڕین، ئەوانیش بریتین لە گوتییەکان، لۆلۆییەکان و سوبارییەکان... هتد.

مینۆرسکی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەمانە لەبەردەم ئەوەدا کە لەپێش هاتنی ئەم نەتەوە کۆچەرییەدا لە کوردستاندا نەتەوەیەك، یاخود چەند نەتەوەیەکی تێکەڵ هەبوون کە لەژێر ناوی هاوشێوەی ئەو نەتەوەیەدا، وەکو

(كاردۆ) كەوا تێكەڵ بەو نەتەوە نیشتەجێبووانە بووە كە لە ناوچەكەدا هەبوون، بەشێوەیەكی هەمیشەیی بەدرێژایی مێژوو ئاوێتە بوون و نەتەوەیەكیان پێكهێناوە.

ئەوا بێگومان مێژووی گەڕاندنەوەی نەژادی كورد بۆ كۆمەڵە كۆنەكانی وەك گوتی، لۆلۆیی، كاشی، میدی، نایری و... هتد بۆچوونێكی بەهێزتر دەبێت لە بۆچوونەكانی دیكە و ئەمەش بۆچوونی زۆرێك لە مێژووناسانە.

لە ڕوویەكی دیكەوە پرۆفیسۆر (كۆردیین) پێی وایە، كاردۆخییەكان باوانی سەرەكی و ڕاستەوخۆی كوردە هاوچەرخەكانن و خودی كاردۆخیش ناولێنانێكی نەتەوە زمانەوانییە و لەیەك كاتدا واتایەكی ئەتنیكیشی هەیە، بەڵگە مێژووییەكان ئەوە دەسەلمێنن كە ناولێنانی (كارد) ناولێنانێكی نەتەوەیی نییە، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی (كاردا)، كە لە نووسینە مێخییەكاندا ناوی هاتووە.

زنیوفۆن باسی ئەو ناوچەیەی كردووە كە كاردۆخییەكانی تیابوون و (بۆتان)ی ئێستا دیاریكراوە. بە تێگەیشتنی ناوەڕۆكی وشەی (كورد) كە بە مانای (كۆچ-الرحل) دێت.

كورد واتایەكی فراوانتری هەیە، كە چەند كۆمەڵێكی كۆچەریی لە نەتەوەكانی تریشی لەخۆگرتووە، بەڵام (كاردۆ) چەمكەكانی فراوان نییە، بەڵكو بەپێچەوانەوە دوای ئەوەی كە ئەو ناوچەیەی بە (كاردۆ) ناودەبرا، ناوی (جزیرة ابن العمر)ی لێنرا، بەتەواوەتی بەرەو نەمان و ونبوون چوو.

بەم شێوەیە تێکڕای ڕما و بەڵگە زیندووەکان پشتگیریی ئەو ڕاستییە دەکەن و ئاکامگیریی ئەم لێکۆڵینەوەیەش بریتییە لە:

١- ڕەچەڵەکی کوردەکان لە کۆمەڵێکی وەك (کیرتییەکان)، یاخود (کارۆخی)یەکان، یان (کارداکا) ڕاستەوخۆ سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو پەیوەندییەکی نەژادی و شارستانییەتیان لەگەڵ سەرجەم کۆمەڵەکان و دانیشتووەکانی وڵاتەکەیان وەك لە قۆناغە دیاریکراوەکان لە مێژوودا، هەیە.

٢- ناوی (کورد) بەشێوەیەکی پەرەسەندووی ناوی (کاردۆ)، یان (کردۆ) دانانرێت.

٣- وڵاتی کورد نیشتمان بووە بۆ کۆمەڵێك خێڵ کە بەڕەگەز ئێرانی نەبوون، بەڵام دواتر ڕەگەزی ئێرانی زاڵبووە بەسەریدا.

٤- وشەی (کورد) بەدرێژایی مێژوو بۆ گەلی کورد بەکارهاتووە، بەڵام پێش تەواوبوونی مەرجە نەتەوەییەکانی کورد بەواتایەکی تایبەتی بۆی بەکاربراوە.

٥- ئەو قۆناغەی کە کۆمەڵە جۆراوجۆرەکان لە کوردستاندا تێیدا نیشتەجێ بوون، بریتین لە:

أ) قۆناغی پێش هەزارەی چوارەمی پ.ز، کە تێیدا (کاشییەکان و لۆلۆییەکان و گوتییەکان و هورییەکان دانیشتووی کۆن و بنەڕەتی کوردستان) بوون و کەوتوونەتە بەر کاریگەریی سۆمەری و ئەکەدییەکان لە هەزارەی (سێیەم و دووەمی پێش زایین).

ب) قۆناغی پەیدابوونی نووسین.

ج) دەرکەوتنی هیندۆئەوروپییەکان (میتانییەکان)، کە چینی باڵادەست بوون لە وڵاتی سوبارتۆ لە نیوەی هەزارەی دووەمی پ.ز.

میدی بەوپێیەی کە زمانی چینی باڵادەست بووە لە وڵاتی کۆهستان و بڵاوبوونەوەی ئەخشیدی وەك پەرەستن و زمانێکی ئاینی لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمدا دێت، دەتوانین بڵێین هەموو ئەو کۆمەڵانەی باسمان لێوە کردن، لە دانیشتووە ڕەسەنەکان و کۆچکردووە تازەکان لە گەلانی هیندۆئەوروپییەکان لە چەند قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویدا ڕۆڵی دیاری خۆیان بینیوە لە تەواوبوونی خەملینی مەرجە نەتەوەییەکانی (کورد)دا. بۆیە کوردەکان ڕاستەوخۆ ناگەڕێنەوە سەر کۆمەڵێکی دیاریکراو بەتەنیا.

نووسین لە چاخە مێژووییەکاندا هاتەکایەوە، ئەم قۆناغە کە تاوەکو ئێستا بەردەوامە، ماوەی پێنج هەزار ساڵ تەمەنی مرۆڤایەتی داگیرکردووە، تەنیا (١٪)ی ژیانی مرۆڤی برد و (٩٩٪)ی ژیانی مرۆڤ لە چاخەکانی پێش مێژوودا بووە.

چاخی بەردین دابەشکراون بۆ دوو چاخی گرنگ، یەکەمیان: چاخی بەردینی کۆن (Paleolthic)، دووەمیان: چاخی بەردینی نوێیە (Neolitbic)یە و چاخی بەردینی ناوەڕاست لەنێوانیاندایە.

## چاخی بەردینی کۆن دابەش دەکرێت بۆ:

### ١- چاخی بەردینی کۆنی خواروو (Paleolithic Lower):

کە بریتییە لەم قۆناغانە:

### أ) قۆناغی ئەبڤیلی:

ئـامێری ئـەم سـەردەمە بریتییـە لـە پاچەکۆڵەی دەسـتی و بەشێوەی پیاکێشانی بەرد بە بەردا دروسـتکراوە. سـەرەتا لـە شـوێنەواری (ئـەبڤیل)ی هەرێمی سومی باکووری فەڕەنسا دۆزراوەتەوە و پاشماوەی ئەم قۆناغە تا ئێستا لە کوردستاندا نەدۆزراوەتەوە.

### ب) قۆناغ کلاکتۆنی:

ئامێری ئـەم قۆناغـە، لـە ئـامێری قۆنـاغی ئـەبڤیلی پێشـکەوتووترە و بەردێکی دروستکراوە و ئەستووریی دەگاتـە (١٣)سـم، سـەرەتا لـە شـوێنی کلاکتۆنی سەر بە هەرێمی ئەبسکس دۆزراوەتەوە، کە کەوتووەتـە خۆرهـەڵاتی وڵاتی ئینگلتەرا.

### ج) قۆناغی ئاشولی:

درێژترین قۆناغی بەردینی کۆنە، نزیکەی دووسەد هەزار ساڵی خایاندووە، ئامێرەکانی ئەم سەردەمە بریتین لە: پاچەکۆڵەی دەسـتی شـێوە هێلکـەیی و بەردە شەستێ، پاشماوەی ئەم قۆناغە لـە شـوێنەواری بـەردە بەلەکـەی نزیـک چەمچەماڵ دۆزراوەتەوە.

## ٢- چاخی بەردینی کۆنی ناوەڕاست (Middl Palaeolithic):

پاشماوەی ئەم چاخە لە ئەشکەوتی شانیدەر و هەزارمێرد دۆزراونەتەوە، مێژووەکەی بۆ (٣٠-٨٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، گرنگترین ئامێری بەردینی ئەم سەردەمە پاچەکۆڵەی دەستییە و لەسەر شێوەی دڵ دروستکراوە. ئەم چاخەش دەکرێت بە دوو قۆناغەوە:

### أ) قۆناغی مۆستێری:

سەرەتا لە مۆستیری وڵاتی فەڕەنسا دۆزراوەتەوە و بەرهەمی مرۆڤی نیاندەرتاڵە و ئامێرەکانی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١- بەردە ئەستێ لاتیژی کەوانەیی و لاکەی تری ڕێك و کولە و بۆ بڕینی گۆشت بەکارهاتووە.

٢- سەرەتیرەی شێوە سێگۆشەیی، لایەك یان دوو لای تیژە و بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵ بەکارهاتووە.

### ب) قۆناغی لیفالوازی:

ئامێرە بەردینەکانی ئەم قۆناغە نارێك بوون، تەنیا یەك لایان تیژ بووە. بە بەردبووی نیاندەرتاڵی لە نزیك شاری شتوتگارتی ئەڵمانیا لە ساڵی (١٧٠٠)دا دۆزرایەوە.

## ٣- چاخی بەردینی سەروو (Upper palacolithic):

لەم چاخەدا جیاوازی لەنێوان ئامێری بەردینی چاخی مۆستیری و ئـامێری ئەم سەردەمەدا بەدی ناکرێت، چونکە بەرهەم و پیشەسـازیی مـرۆڤ کـارێکی بەردەوامـن و بـە هـاتنی سـەردەمێك ڕاسـتەوخۆ بەرهـەم و پیشەسـازییەکان نەوەستاون.

ئەم چـاخە ماوەیـەکی کـەمی لـە سـەردەمی بلایسـتۆینی داگیرکـردووە. هەروەها لەم چاخەدا مرۆڤی ژیر شوێنی مرۆڤی نیاندەرتاڵی گرتەوە. ئەم چاخە لە کوردستان پێی دەوترێت (ژیاری برادۆستی)، بەهۆی دۆزینـەوەی پاشمـاوەی ئەم چاخەوە لە شاخەکانی برادۆستی هەرێمی کوردستاندا، پاشماوەی ئەم چاخە لە ئەشکەوتەکانی (زەرزی) لە چەمی ڕەزانی پارێزگای سلێمانی و ئەشکەوتی هەزارمێرد و ئەشکەوتی (پاڵـە گـەورە) و ئەشـکەوتی (کیوانیـان)ی نزیـك ڕەوانـدوز و ئەشـکەوتی شانیدەرچـینی[٢] دۆزراونەتـەوە. تاقیکردنـەوەکانی کاربۆنی (١٤) لەسەر پاشماوە ئۆرگانییـەکانی ئـەم چـاخە لـە کوردسـتاندا، دەریخستووە، کەوا دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی نێوان (٢٥٠٠٠-٣٤٠٠٠) ساڵ پ.ز. ئەم قۆناغە لە پاشماوەکانی قۆناغی ئورگەنیشی ئەورووپاوە نزیکە. ئەم چاخەش دەکرێت بە سێ قۆناغەوە:

### أ) قۆناغی ئورگەنیشی:

ناوی ئەم قۆناغەش لە شوێنی ئورنیاك لە حەوزی کارونی سەرووی وڵاتـی فەڕەنساوە هاتووە. ئامێری ئەم قۆناغە لەچاو چاخەکانی تردا ڕێکوپێکترە، لـە

ئەفغانستان و عێراق و ئیسپانیا و ئەڵمانیا دۆزراونەتەوە. هونەری وێنـەکردن لە ئەشکەوتەکان سەری هەڵدا.

**ب) قۆناغی سولیژی:**

پاشماوەی لە زۆر ناوچەی ئەوروپادا دۆزراوەتـەوە. مێـژووی دەگەڕێتـەوە بـۆ (١٢-١٥) هەزار ساڵ پ.ز.

**ج) قۆناغی مەجدەلین:**

دوا قۆناغی چاخی بەردینی کۆنی سەرەوە و سەرەتا لە شوێنی مەکدالین و ئەشکەوتی مادلینـەوە هـاتووە، کەوتووەتـە هـەرێمی تورسـاك لـە ناوچـەی دوردونی لە باشووری فەڕەنسا. لەم قۆناغەدا چەقۆ و بەردەئەستێ و کونکەری بەردینی ڕێك کراوە و دروستکراوە.

**٢- چاخی بەردینی ناوەڕاست:**

لـەم قۆناغـەدا، مـرۆڤ چـووەتە قۆنـاغی بەرهـەمهێنان و خـواردن و کشتوکاڵکردن و بەخێوکردنی ئاژەڵ و نیشتەجێبوون لە گونددا، لـە نزیکـەی شانزە هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە دەستی پێکردووە و ماوەیەکی کەمی خایاندووە.

**٣- چاخی بەردینی نوێ:**

لە قۆناغی کۆکردنەوەی خواردنەوە بەرەو قۆناغی بەرهەمهێنانی خـواردن هەنگاوی ناوە، شێوازی ژیانی مرۆڤ گۆڕاوە و چووەتە ئاسـتێکی پێشـکەوتوو.

ئامێرە بەردینەکان تیژ و لوس و داندار بوون تا وەکو مشار بەکاربێن و لە جۆری بەردی زەق دروستکراون. هەروەها ئاژەڵەکانی مەڕ و بزن و مانگا و بەراز لە شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤماڵیی کران لە ماوەی نێوان ٦٥-٨٥ هەزار ساڵ پێش زایندا. لەم چاخەدا مرۆڤ مەکینەی بەشێوازی جۆراوجۆر لە قوڕ دروستکردووە و پاشان لە ئاگردا سوورکراوەتەوە، بۆ ئەوەی توندوتۆڵ بێت بۆ هەڵگرتنی شلەمەنی و خۆراك.

## ئامێرە بەردینەکانی بەردەبەلەکە:

دەکەوێتە دووریی (٣) کیلۆمەتر لە باکووری خۆرهەلاتی شارۆچکەی چەمچەماڵ... سەرەتای ساڵی (١٩٤٩)ز. مێژووی ئەم شوێنەوارە بۆ چاخی بەردینی کۆنی سەروو قۆناغی ئاشوڵ، واتە (١٥٥) هەزار ساڵ لەمەوپێش و بە کۆنترین شوێن لە کوردستان و میزۆپۆتامیا لەقەڵەم دراوە.

بەردەبەلەکە بە مانای بەردی وەستاو دێت، بەردێك نیوە وەستاوبێت، پانی و بەرزییەکەی چوار مەترە و بەشی خوارووی داخوراوە و بەردەبەلەکە بریتییە لە بەردی ئەستێ.

بەردەبەلەکەی نزیك چەمچەماڵ، یەکێکە لەو شوێنەوارانەی کە بۆ قۆناغی ئاشوڵی چاخی بەردینی کۆنی خواروو (Lower Palaeolithic) دەگەڕێتەوە. مرۆڤی ئەم جێیە مرۆڤی نیاندرەتاڵ بووە و هێشتا مرۆڤی ژیر (Homosapience) پەیدا نەبووە. ئەم شوێنەوارە بە کۆنترین شوێنەوار دادەنرێت لە کوردستان و میسۆپۆتامیادا.

مرۆڤی ئەو کاتانە ژیاون کە سەدەی بەردی پێ دەوترێت، لە ئەشـکەوت و لابەلای بەردەکاندا، بە کۆکردنەوەی بەری درەخت و ڕاوکردن. ئەمانە ناودەبـەن بە (سەدەی بەردی کۆن و ناوەڕاست و خواروو، بەشی ناوەڕاسـت ناودەبـەن بـە سێ سەدەی لەسەریەك، ئەوانەش پێش (الأبقيلـی و الأبثيلـی و الأسـتولی) و بەشی ناوەڕاست بە دوو سەدە، ئەوانەش (ئەل موستێری و اليفولوازی).

بەشی سەرەوە بۆ پێنج سەدە، ئەوانـەش (ئـەلبیر و کـوردی، ئـەلورکنتی، ئـەلکرافیتی، ئـال سـووتیری و ئـەگملولیی). سـەدەی سـەرەکی دووەم لـە سەدەکانی پێش مێژوو بە ناوی سەدەی ناوەڕاست، کە لە سـنووری (١٦٠٠٠) ساڵانی ڕابردوو دوای نەمانی سەدەی بەستەڵۆك و ئەم سـەدەیە لـە عێراقـدا، هەندێك لایان وایە کە (٥٠٠٠) پێنج هەزار سـاڵ پ.ز و لـە (٣٠٠٠) سـێ هەزار ساڵی پ.ز تەواوبووە. کە خەڵکی دێهات کشتوکاڵیان دەکرد.

ئـەو شـتانەی کـە لـە (بەردەبـەلکا) کەوتووەتـە بـاکووری خۆرهـەڵاتی چەمچەماڵ بە دوو کیلۆمەتر. کتێبی ژمارە (٣)، دەستنووسەکانە.

ئیران دور عهدیا ستاندو تأريخ قوامە و پادشاهان پـیش اسـلام، دانـەری: دکتۆر محەمەد واد شکور، مامۆستای زانکۆ.

ماکس مولەر (Max Muller) باوەڕی وایە کە جێگا بـانی خـوارووی باکووری هندوکش و حەوزی دەوری ئەکسوس، یان جەیحون بووە.

بەپێ سروودی و لـەڕووی جوگرافیـاوە وا دەردەکـەوێت ئارياییـەکان لـەم جێگایەدا ژیاون لە پێشەوە:

١- ڕول کوبها (Kubha) له دەوری کابل بووه. یۆنانییەکان پێیان وتووه ڕول کوفن (Kufn).

٢- دەوری ڕود کرومـــو (Kroumu) لـــه جێگەیەکـــه کـــه کرامـــۆ (Krooumu) ڕەنگه ڕووی ئەفغانستان بێت.

٣- ڕود گومـــاتی (Gomati) لەگـــەڵ ڕود گومـــل (Gumel) لـــه ئەفغانستانی خوارووودا بێت.

٤- ڕودی کاسووتی (Sweti) له جێگەیەکی ســواو هـــو (souvutu) هاتووه، بەتلیموس ئەوەی به سوداستوست له ئەفغانستانی خوارووودایه.

٥- ڕووباری ڕود ڕاسا (Rassa) که ئـەوی بـه ڕودگـز (Konar) لـه چترال (Chetral) داینا‌وه لـەنێوان ســووتی و کـوب دانـی و لـه سەرچـاوه یۆنانییەکانەوه به ناوی (خواسپس) هاتووه.

٦- ڕووبـــاری ڕود تریشـــتان (Trishtana)، یـــان ئـــانی تابـــه (Ani-Tabhai) له ئەفغانستان.

٧- ڕووباری ڕود سپتەســندو (sapta Sendhu)، کـه لـه ئاوێســتادا هپته هند و Hopta Hendu هاتووه، بـه واتـای حـەوت (ڕووبـار)، یـان حەوت ئاو باوەڕی له حەوت ڕووبارەوه، که دوو ئاوه وشك بووه و پەیمان ئێســتا لەوەوه ماوه ناوی پێنج ڕووبار، یان به پەنجاب له سروودەکانیدا هاتووه.

١- ویتاستا (vitasta)، یان ڕووباری هیداسب (Hedasp) که ئەمڕۆ جەهلەمی ناوه.

٢- ئاسكینی (Assikni)، یان چاندارتاگا (chandarutaga)، یان نابی ئەمرۆیە.

٣- پاروشن (Paroushni) پاراوی ئەمرۆیە.

٤- ویپاس (wipass)، یان بەهاسی ئەمرۆیە.

٥- سووتوردی (soutourdi)، یان مستجلی ئەمرۆیە.

لە کتێبی ودابار هندی قەبائلە، اری ئەلات بە شەڕکەر و ئازا لەوانە ناوی تیرەی بەهارات (Baharat) لە پەنجا برا دەژیان.

هەروەها باسی قەبیلەی پەکتاها (paktatha) و تیرەی پەنکەجانا (pankojana) و باسی پێنج تیرە و هۆزێکی دیکەش دەکات.

## ئایین و ژیان له سه‌رده‌می ودای:

١- خانـه‌واده‌یان کـولا (Kula) خـاوه‌ن مـالّ مه‌رکـه‌زی دروسـتکردنی کۆمه‌لاّیه‌تی ئاری بووه، که سه‌رپه‌رشتی مالّی باوك بووه، ناوی باوك به زمانی ودای پاتی (Pati)، واته خاوه‌ن ده‌سه‌لاّت و پـارێزه‌ر، ده‌پـتری (Pitri)، واتـه خـۆراك په‌یداکـه‌ر، بـاوك به‌رپرسـیاری قوربـانی و ته‌ربییـه‌ت و مه‌زهـه‌بی منداڵه‌کانی بووه، دایك ماتری (Matri)یان پێ وتووه، که‌یبانووی مالّ بووه.

٢- گوترا (Gotra)، واته عه‌شیره و دوای خانه‌واده پله‌ی عه‌شیره‌ت بووه.

گوتیا به‌واتای جێگای پارێزگاریکردنی گاگه‌ل، ئارییه‌کان خاوه‌نی مـالاّت بـوون، بۆیـه به‌یه‌کـه‌وه گاگـه‌لیان له‌وه‌ڕانـدووه، کۆمـه‌ڵێك لـه‌و عه‌شـیره‌ته سه‌رۆکێکیان هـه‌بووه پێیـان وتـووه گـوترا پـاتی (Gotra pati). ئه‌گـه‌ر چه‌ندکه‌سـێك مالاّتیـان به‌یه‌کـه‌وه بووبێـت و یـه‌کێك له‌وانـه سه‌رپه‌رشـتی کردبێت، پێیان وتووه کولا.

٣- گشـتی (Goshti) چـه‌ند خانه‌واده‌یـه‌ك لـه یـه‌ك گـوترا مالاّتیـان هه‌بووبێت و پێکـه‌وه بـووبن پێیـان وتـوون گشـته (Gshta)، یـان وارجـا (waraja)، گشـتی لـه عه‌شـیره‌ت گـه‌وره‌تر بـووه و لـه چـه‌ند گوترایـه‌ك پێکهاتووه.

٤- گرامه (Grama) لـه کۆبوونـه‌وه‌ی چـه‌ند گشـتییه‌ك پێکهـاتووه، سه‌رکرده‌ی ئه‌مه‌ش سه‌رداریه بووه، پێیان وتووه گرامنی (Gramani).

٥- وه‌یس، یان وه‌یسه (Wisa)، ئه‌مـه‌ش لـه گرامایـه‌کی تـر بـوو بـه سه‌رۆکه‌که‌یان وتووه (وه‌یس پاتی).

٦- جانــه (Jana) لــه چــەند کۆمــەڵێکی وەیســە پێکهــاتووە، لــەو ناوچانانەدا پێان وتووە جاناپادا (pada Jana) و بە سەرکردەکەشیان وتووە (ڕاجان)، بەواتاش بنەڕەتی حوکمڕانی ئاری وەك لە ســەرەوە باسمــان کــرد لــە باوکەوە کە سەرۆکی ماڵ بوو، پێکهاتووە تا فــەرمانڕەوایان کــە پاشــا بــووە، پێیان وتووە (ڕاجانا).

ســەرۆك عەشــیرەت و تــیرە و پیــاوە دینییــەکان لــە مەجلیســی شــارا کۆبوونەتەوە بۆ مشاوەرەکردن و بەو ئەندامانەیان وتووە- ڕاجانــا، یــان ڕاجــا، یان سبها= شورا بووە سیمتی (Semeti) ناوی مەجلیسی پیاوە دینییــەکان بووە.

هەندێك لەو ئارییانە بەرەو هیندستان ڕۆیشتن، پاش شەڕ و شــۆڕێکی زۆر لەگەڵ دانیشتووانی ئەوێــدا، خۆیــان جــێگیر کــرد لــە بــاکووری هینــد، تــا ناوچەکانی خواروی بنگال بلاوبوونەوە، ئەمــەش لــە هــەزارەی یەکــەمی پ.ز لــەڕووی ئــیش و کــار و دروســتبوونی ســەرۆکەوە لەپێشــتر بــوون لەوانــەی دانیشتووی هیندی پێش ئەمانە لەوێش ڕەسمی چینایەتییان دروســتکرد، کــە چوار شێوە بووە:

١- چینی بەرهەمهێنان، یان دینییەکان.

٢- چــینی کشــتریا (kshhatriya)، یــان شــەڕکەران و فــەرمانڕەوا و شاکان بووە.

٣- چینی وئی سیا (Waisa) بازرگان و جوتیاران.

٤- چینی سورا (Sudras) چینی گشتی و پاشاکان و کۆمەڵ.

## ژنهێنان و ژن بەشوودان:

لە نـەمانی ئارییەکانـدا بەشـێوەیەکی دیمـوکراتی و زۆر خـۆش ژنهێنـان هەبووە. کچ و کوڕ یەکتریان پەسەند کردووە پێش هێنـان، بـەپێی خورەوشـت مارەکردن هەبووە. زاوا و بووك جلی جوانیان لەبەر دەکرد و زاوا دەستی بـوکی دەگـرت و دەچـوونە زیـارەتی ماڵـە دۆسـتەکانیان، پاشـان لەسـەر بـەردێك دادەنیشتن و زاوا بە دەنگێکی بەرز دەیوت: من پیاوم و تۆ ژن. من ئاسمانم و تۆ زەوی من و تۆ بەیەکەوە دەژین لە من و تۆ منداڵمان دەبێت.

پاشان سواری گالیسکەیەك دەبوون بە گوڵی جـوانی کردگـار ڕازابـووەوە، گای سپی ڕای دەکێشا. ئارییەکان تەنها یەك ژنیان هێناوە، کچی گەورەتر بـە شوودراوە.

**باوەڕ و ئاینی ئاریایی لە سەدەی ودایدا:**

خۆر و مـانگ و ئاسمان و کێـو و ئەسـتێرەکانیان پەرسـتووە و بـۆ ئەوانـە قوربانییان کردووە.

گرنگترین خوایان ئەمانە بوون:

١- ئایندرا (Indra): خوای گشتی برووسکە و شەڕ بووە.

٢- وارونـا (Waruna): خـوای گشـتی ئاسمـانی پـڕ ئەسـتێرە، کـە ناونیشانی خوای هەمووی بۆ خۆی دانابوو.

٣- ئاگنی (Agni): خوای گشتی ئاگر.

٤- سوما (Suma): چەشنە مەشروویێك بووە. دروشاوە چەشنە گیایەکی کێویی بووە لەگەڵ شیر و هەنگویندا تێکەڵیان کردووە. خۆشی و گەرمای داوە بە ئەو لە خواردنەوەدا. ئەم مەشرووبە بە مەشرووبی خواردنەوەی خواکان داناوە سروودیشی لەسەر بووە.

## سەدەی ئامیش:

پێشتر وتمان لە دەورەبەری سێ هەزارەی پ.ز بەشی ئاری ئێرانی کە لە دەستەی ڕەگەزی هیندۆئەورووپی بوون و بەشێك بەرەو کێوەکانی هنەکش (هندول) ڕۆیشتن لەگەڵ ئەماندا زمان و دین و باوەڕ و ڕازی پێکەوەیان بووە.

## مهرپەرستی (میترایسم):

موهر فریشتەی ڕاستی و لێهاتووی دژی کاری خراپە و خووڕەوشتی فریشتەی موهر-ڕاستی، گەورەی، لەپێشتر، سەرکەوتنە بە باوەڕی ئێرانییەکان. موهر یان میترا یەکێکە لە یەزدان و یارمەتی ئاهورامەزدا دەدات و لەگەڵ ئەهریمەندا شەڕ دەکات. یۆنانییەکان بوون موهرپەرستیان لە ئێرانییەکانەوە گەیاندە هەموو جیهان هەتا سەدەی چوارەمی پ.ز. پاش ئەوە موهرپەرستی لە یۆنان و ڕۆم هەبووە.

## میتر:

خوای گەورە و یەکێك لە خواکانی ئێرانییەکانە. هیندی ئەورووپی لەکاتی کۆچکردنیاندا لە بنەڕەتی جێگاکانی خۆیانەوە هێناویانە و پەرستوویانە. لەم

خودایەوە کۆنترین پەرتووکێکی پیرۆزی هینــدی بــە نــاوی ڕێــك ودا بەشــێوەی میترا ناوبراوە. لە ئاوێستادا وشەی میترا لە ئێران، لە یەکەم ســەدەی زاینیــدا بە (موهر) گۆڕاوە و بەشێوەی خوای خۆر دەرکەوتووە.

## ئەنگرە مینو -ئەنگرەمن- ئەهریمەن:

لە سەرووشیان ئاینی مــەزدینا لــەڕووی بیرکردنــەوەی هەرکەســێك -دوو هێزی دژ بەیەکتر- کە هێزی باشە و هێزی خراپە ئەو دووانەش -سپنتا مینــو ئەنگرەمینویە. واتەی ئاهورامــەزدا، ئاهورا= هەست خــۆش- مــەزدا-مــزدا- مز= مسی گەورە، دان= دانا. مەزدا= دانای گــەورە. ئاهورامــەزدا واژۆیــەکی بەسەر یەکەوەیە کە لە دوو وشە پێکهاتووە، ئاهورا بە واتای هەستی خۆشــی (خۆشی) ئەمە واتاکەیەتی و مەزدا بە دانای گەورە- دروست بووە.

بەم شێوەیە بە واتای ئاهورامــەزدا- دانــای گــەورەی خۆشــی بــەخش، یــان خۆشی دان. ئاررووی بەهەشت (باشترین ڕاستی).

هرمن= (کرداری باش) هەوڵدانی باش و لەلایەکی دیکە مەزدا ئاهورا بە واتای ئورمزد= پەروەردگار شەمش= شمس= خۆر.

پێشەوایان، ئاینی زەردەشت بە ناوی (مگیان)، یان (مگــوی)، یــان مــاژ ناوبراون. عەرەب کردوویانە بە مەجوس.

ئاینی زەرادەشتی لە سەدەی پێنجەمی زاینیدا لەناو کوردەکان بەشی نــاو کرەکان -ناوی- ئاهورامەزدا لەم ئاینــەدا کــەم بــووە. لــەجێگای ئــەو نــاوە، ئاهورامەزد و ئورمز هاتە کایەوە.

خوای لێهاتووی و ئەنگرە مینویـە (ئەهریمـەن) خـوای خراپـە و پیسـی و میترا خوای ڕووناکی لە ساڵی (٣٣١)پ.ز خوالماش گیرانی و یۆنانی وەك یـەك بوون وەك (وروان) بە (کرنووس).

ئاهورامەزدا بە (زئوس) پاڵەوانی سەرکەوتوو دەوترا گانا بە مـەراکلوس. خوای ئاناهێنا بە ئاوتیس.

میترا لە بابل بـە ناونیشـانی شەمسـی دەیانپەرسـت بـەهلیوس پەرسـتن شەیتان، بە ناونیشانی ئاینێکی تایبەتی لـە ئێرانـدا لـەژێر پـەردەی ئـاینی زەردەشتیدا بەشێوەی نهێنی هەبووە تا هاتنی ئیسلام.

بنەڕەتی شەیتان پەرستی لە ئەهریمەنەوە، کە کردەوەی جادووی بێ بـاوەڕی بە پاداشت و ئازار بنەڕەتی بووە.

مـیترا: پەرسـت یـاوەر بـە جادووگـەری و ڕۆح و ڕۆژی زیندووبوونـەوە (قیامـەت) و جیهان لەناوچوون بووە.

ئاینی زەردەشتی بەهۆی شا ساسانییەکانەوە دوو جدار گەشـەدرابوو و دژی ئاینەکانی تر دژایەتی کردووە تا هاتنی ئیسلام.

کورد: لە شار و دێهاتدا لە فەرمانڕەوای ساسانییەکاندا ئاینی زەردەشتیان پەرستووە، ئەوەش بەهۆی موغەکانەوە بەشێکی زۆر چوونە سەر ئەو ئاینە.

لە ڕاستیدا خوای لێهاتووی تەواوی کورد (موهر) بـووە، کـە بـە سـۆزەوە پەرستوویانە، گفتوگۆی ڕاستی کوردی (مـوهر) مـیر ئـەلێین، بـەو خودایـە سوێندیان خواردووە، خوای سەرکەوتن و پاڵەوانییەتی، خـوای ڕزگارکـەر، بـە واتای هەمان خوای خۆر کە ئەویان پەرستووە.

## ئاینی مەسیحی:

لە سەدەی سێیەمی زاینیدا لە شاری کەرت (Kart) لەلایەن کەشیش مارمایەوە بڵاوکراوەتەوە، کەرت کەوتبووە نێوان داقوق و هەولێرەوە، پێشتر گوایە دانیشتووانی ئەو شارە درەخت و لقی بتی مسیان پەرستووە.

شاپوری دووەم: دوژمنی سەرسەختی هەموو ئاینەکانی جیا لە ئاینی زەردەشتی بووە. لە ساڵی (٤٣٢)ز-دا شاری کەرتی وێران کرد. سەرەڕای ئەو لێدان و وێرانکردنە ئەو شارە لە ساڵی (٣٥٩)ز-دا بووە ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحییەت لەناو کوردەکاندا.

تۆفیق وەهبی دەڵێت:

شاری کەرت شارێکی کورد و کوردنشین بووە. ڕەنگە ئەم ناوە ساسانییەکان لە (ماد)ەوە وەریان گرتبێت وەك -خشاترو- کرتا بە زمانی کوردی بە واتای کۆشکی شاهان، یان کۆشکی فەرمانڕەوا.

دەڵێت: من، جێگای شاری کەرت بەو کەلاوە کۆنانە دەزانم بە ناوی جلیندی (Julindi) کەوتووەتە باکووری خۆرئاوای سلێمانییەوە.

مارسبا: یەکێکە لە بڵاوکەرەوەکانی ئاینی مەسیحی لە سەدەی پێنجەمی زاینیدا. لەناو کوردەکاندا لە ساڵی (٤٨٥)ز. دەڵێت: ئەوان خۆر دەپەرستن مارسبا- دانیشتووی بث گلایا (Beith Galaya) لە بلاشبر (Balashpar)، کەوتووەتە ناوچەی هەڵوان (Halwan) بلاشبر شکو والاش (Walash) ناوی کۆنی قەسری شیرینە.

بش گلایا: واژەیەکی ئارامییە بە واتای (نیشتمان) گالیس (Gals) ڕەنگە بەشێوەی باگالایا (Bajalaya) لە سەرەتای ئیسلامدا لە ڕووباری خابوور لە باکووری موسڵ جێگایەك هەیە لە مێژووی عارەبدا بە ناوی باجالایا ناوی بردووە و بە کوردی پێی دەوترێت باجەلان، ناوی تیرەیەکی کوردە لە ناوچەی هەڵوان.

## پەرستگاکان:

پێشتر ئەشکەوتەکان لە کوردستانی باشووردا کە پەیوەندییان بە میرتا پەرستییەوە بووە، بەبێ شك جێگای زانین و فێربوون بووە... کۆمەڵی میترا بەلای زورەوە بۆ (تەشریفاتی مەزهەبی)، واتە خەڵوەکیشان، بەردیان ئەتاشی وەك ئەشکەوت لە نزیك کانی، یان ئاوی ڕۆیشتوو ئەو جێگایەیان دەستنیشان دەکرد بۆ ئەو مەبەستە. لە نزیك دێی بەلکجار ئەو ئەشکەوت و ئاوە هەیە و کۆشك لە ڕێگاکەدا هەیە (دەرەدوین).

## ئەمشا سپندان:

ڕەوشتەکانی ئاهورامەزدا ئەمشاسپێندانی ناوە، لە نووسینەکانی ئاوێستادا ئاهورامەزدا خاوەنی پیرۆزیی و چاکەیەکی بەپایانە لەنێوان ئەواندا سەد ڕەوشتی پیرۆز هەن کە هەریەکە لەو ڕەوشتانە ئەمشاسپێندە و بە هەموویان دەوترێت مشاسپندان. وشەی مشاسپند لە ئاوێستا بەشێوەی ئەمشە سپنت هاتووە لەسێ بەش پێکهاتووە:

۱+ مشە +سپنتە

١- پیتی نەبووە= (حەرفی نەفی) واتا هەر وشەیەك لەپێشەوە بێـت ئـەو لای دەبات= نەفی دەکات.

مشە= لە ڕیشەی مر بە واتای مردن.

ئەمشە بە واتای= بیّ مەرگ ئەمر.

سپنە= مقەدەس= (پیرۆزە پاکەکان).

ئەم وشەیە لە زمانی ئاوێستادا بە کۆمەڵ دێت، بەواتای هەمووی ئەمشـا سپیدان= پالمانی نەمر.

ناوی ئەمشا سپیدان و مانای ئەو شەش ئەمشا سپیدان، بریتییە لە:

١- بەهمەن.

٢- ئاوی بەهەشت.

٣- شەهری وەر.

٤- سپندارمد.

٥- خورداد.

٦- ئامرداد.

١- بەهمەن:

یەکەمین ئەمشا سپندە، شێوەی بنەڕەتی ئەم وشەیە وهومن دەبێت کە لـە دوو وشە پێکهاتووە (وهو) من و هو بە واتای باش.

٢- ئاوی بەهەشت:

لەواتەی ئاو سپیتادا ڕووی بەهەشت ناوی دووەمینە، ئەمشا سپیندە ئاشە و هەشت دەبێت کە لە دوو وشەی ئاشە بە واتای ڕاستی و پاکی ڕژێم و قانوون و هیشتە (ڕەوشتی بەرزیەتی)، بەواتای باشترین دروستکردووە.

ئاوی بەهەشت پیئاشەوهیشت = باشترین ڕاستی و پاکی ڕژێم و سحرکار.

٣- شەهری وەر:

لە ئاوێستادا وشەی شەهری وەر (فەرمانڕەوا) بەشێوەی خشتر و ئیرەیە بووە لە دوو وشەیە خشتر بەواتای شەهرەیار و ئیرەیـە بـە واتـای هێـز و خواسـت و ئـیرادەی دروسـتکردووە شـەهری وەر= خشـتروئیرەییە= هێـزی شـەهرەیاری (فەرمانڕەوایی= ئیرادە و توانا).

٤- سپندارمد:

چوارەمین ئەمشاسپیندار، ئەوەش سـپیندار میـدیان سـپنتە ئەرمـەئیتی دەبێت. سپنتە ئەرمەئیتی دوو وشەیە سپنتە بە واتای پـاك و ئـەرمئیتی بـە واتای مدر لە ئەوین پێکهاتووە، وشەی ئار ئەمیش دوو بەشە بە واتای ڕاستی و دروستی و باوەڕکردن و ئیتی بە واتای باوەڕ.

٥- خورداد:

خردات یان هئوروتات له دوو وشه (هەئوروو+ تات) پێکهاتووه. هئـور بـه واتای ڕاستی و لێهاتوویی و تات نیشانەی (تأنیث)ە .

هئورتات= هئورد+ تات، لێهاتوویی ڕاستی.

٦- ئامرداد:

وشەی ئامرداد، یان ئـەمرتات لـە سـێ بـەش پێکهـاتووه، بـەم شـێوەیه ئەمرتات= ١+مر+تان= پیتی نەبو= حرف نفی+ مەرگ شـتی چـوارلا. شـتی چوارلا بریتییه له هەوا، ئاگر، ئاو، خاك= زەوی له ئاینی میترادا پیر و ژن.

سبینی (Sabians)= سبینی ئەمانه ئەم چوار شتەیان پەرسـتووه، لـه پەرتووکی ئەواندا به ناوی:

سکاندولا (Skandola) هەیه و وێنەی چـوار جانـەوەریان نیشـانداوه، وەك: زەردەواڵه، شێر، دووپشك، مـار. ئەم چوارەش لەگەڵ چوار شتی چـوارلادا بەم شێوەیەن، زەردەواڵه، هەوا، شێر، ئاگر، دووپشك، ئاو، مار، زەوی.

له هەرچوارلاشەوه با و هـەوا دێـت لـه خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا، بـاکوور، باشوور.

یەزیدی موریه: بەقەد فندقێك لـه خـۆڵی سـەر گـۆڕی شـێخ عـودەی دروست دەکرێت یەزیدییەکان ڕۆژی دوو جار بەیانیان و ئێواران ماچی دەکەن، ئەوەش پێی دەڵێن (بەرائەت)= پاکانه.

تانجی، یان تاژی، یان تازی بەدیلکەتەکانی کوردی وای پێ دەڵێن، بە سەگێك کە بۆنی زۆر بەهێز بێت، بەمانای بنەڕەتی بە ئەو دەڵێن تیژڕەو کە لە ڕیشەی ئاوێستادایە= تاج (Tach) بە مانای تیژڕەو.

سەرچاوەی سەرچنار:

لە کۆندا جێگایەکی پیرۆز بوو، لە پێش ئیسلامدا، جێگای پەرستگای ئاناهیتا بوو، کە سەرچاوەیەکی بەپیت بوو، ڕەنگە ئەم سەرچاوەیە هەمان پەرستگا ئانیا (Aneia) بوو بێت کە ئاسترا بۆیە پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە لە نزیکی کەرکوك بووە.

ئانیا لە واژوی ئانابیتسی (Anaibis) وەرگیراوە، کە وشەیەکی یۆنانییە و ئانا هیتا (Anaahita)یە لە نزیك پەرستگاکە وەیەت هەیە بە ناوی زەرگەتە (Zargata) زەرگەتە ڕەنگە لە واتای ئازارکەدە (Azarkata)وە وەرگیرابێت. بە واتای ئاگردان= ئاتشکدە.

میران= بە کوردی بە واتای میهران، کە لە میتراوە وەرگیراوە، واژەی میترا لە سەرەتای یەکەی سەدەی زاینی بەدواوە بە (مهر) بەکاردەهێنرا، میتر، کە باسکرا ناوی خوای گەورە پارێزگار و پشتیوانی پەیامدوو و ستایش بووە.

مهران لەکاتی ساسانییەکانەوە هەبووە، ئێستاش ئێرانی و ئەرمەن بەکاری دێنن، لە کوردیدا بە گەورەپیاوەکان وتراوە میر و میران. ڕەنگیشە لە وشەی عەرەبییەوە وەرگیرابێت، وەك: ئەمیر.

ئەو ناوە هەر لە کۆنەوە هەبووە (بەروو، بلکا) بەعسیەکی ئەمریکی لە دانشگای شیکاغو پێنج (پێیان) هەڵکەند هەندێ شتی بەردیان بۆ دۆزرایەوە، وەك: ئێسقانی فیل و یەك شاخ و گا و مەڕ و بزن.

دەبێت دوای بەستەڵۆکی دوای بۆ پییت لەنێوان (١٠٠٠٠٠) و (٦٠٠٠٠) هـەزار سـاڵانی ڕابـردوو بێـت. کاتێـك وەرگێرانـی تابلیتـە هیتییـەکانی سەرچاوەیەکیان لەسەر گەلی هۆری دەرخسـت کـە لـە بـاکووری خۆرهـەلاتی ئێستای سوریادا دەژیان، نیشانی ئەوەن هۆرییـەکان سـوپایەکی سـەربازیی و ئابوورییەکی بەهێزیان هەبوو، (خومـاریی) خواوەنـدی سـەرەکی ئەنجومـەنی خواوەنـدی هۆرییـەکان لـە شـاری ئـورکی-ی پایتـەختی هۆرییـەکان فەرمانڕەوایەتییان دەکرد.

لە هاوینی ساڵی (١٩٩٢- ١٩٩٣)دا پاش (٧-٨) ڕۆژ پشکنین لە گردی مۆوانی باکووری خۆرهـەلاتی سـوریا بوسـیلاتی و هاوسـەرەکەی و مـۆرێکی لوولەییان دۆزییەوە، پاش لێکۆڵینەوەیـەکی ورد بۆیـان دەرکـەوت کـە لـەو شوێنەدا کە لەڕاستیدا شوێنی ئورکیش بووە و زیاتر لە (٦٥٠) شوێن مـۆری بەردی لوولەییان لەسەر دەفر و کەمۆڵەدا دۆزییەوە، ئـەویش بـۆ ناسـینەوەی خاوەنەکانیان بووە و بۆ (٤٣٠٠) ساڵ لەمەوپێش دەگەڕێتەوە، هۆرییەکان لـە نزیکەی (٢٢٠٠) ساڵ پێش زاینی لەو شوێنەدا ژیاون.

ئورکیش پایتەختی سیاسی و ئابووری خورییەکان بووە. (گێرنودفال هەڵم) پرۆفیسۆر لە زمانەکانی خۆرهەلات لە زانکـۆی فێـرس بـۆرڵ لـە باڤاریـا و سەرۆکی پەیمانگای خۆرهەلاتی ناوەڕاست و یەکەم شارەزا لە زمانی هۆری لـە جیهاندا، بەبێ هـیچ گومانێـك دووپـاتی کـردەوە کـە گـردی مـۆزان شـاری ئورکیشە، لەدوای نزیکەی (٣٠) سـاڵ لـە لێکۆڵینـەوەی مێـژوویی زمـانی هۆرییەکاندا زۆر بەدڵنیاییەوە هۆرییەکان گرنگییەکی زۆریان پـێ دەدرێـت و

شایستەی ئەو گرنگیپێدانەن، کاتێك بۆ سـیلاتی و هاوسـەرەکەی لـە سـاڵی (١٩٧٦)دا دەستیان کرد بە کنە و پشکنین لە سوریا، مەبەستیان دۆزینەوەی پایتەختی هۆرییەکان بوو.

١٢٣- گردی مۆزان گردێکـی گـەورەی سەرسـوڕهێنەرە و بەرزییەکـەی (٢٧) مەترە و (١٢٠) هکتار زەوی داگیرکردووە. گردێکە جێگـای تێبینییـە بەو قەبارەیە، لەناو زەوی ژوورەکەدا مۆرێکیان دۆزییـەوە (تـوپگیش پادشـای ئورکیش)ی لەسەر نووسرابوو، ناوی پادشـا و نـاوی شـارەکە دەسـت کـەوت، نووسینەکانی سەر شوێن مۆرەکان نیشانی دەدەن کە لە سـەدەی (٢٣)ی پ.ز ژیاوە، لەپێش هەموو پاشا هۆرییەکانی تر کە ناسـراون لـە مـانگی (١١)ی ساڵی (١٩٩٥)دا دۆزینەوەی ئورکیش-یان دەرخست.

پۆپیکش ناوێکی هۆرییە، لەکاتێکدا ناوی هاوسەرەکەی (ئۆکنیتۆم)ە، کە ناوێکی ئەکەدییە بەناو کچی لازەوە دێت، بوسیلاتی وای بۆ دەچێت لەوانەیـە ئەمە شوکردنێکی شاهانە بێت.

هۆرییەکان لـە نزیکـەی هـەزارەی سـێ پ.ز ژیـاون، لـە هـەمان کاتـدا سۆمەرییەکان لە باشوور و سامییەکان ئیبلا لە باکووری خۆرئاوا ژیاون.

بوسیلان ڕوونیکردەوە کە شارەزایانی زمان بڕوایان وایە پەیوەندی لـەنێوان زمانی کۆنی هۆری (کە نـە سـامییە و نـە هیندۆئەوروپییـە) و لـە زمـانی جۆرجیادا هەیە. لەوانەیە هۆرییەکان لە ناوچەی قەفقاسەوە دەرکەوتبن و بەرەو ناوچەی ئەنادۆڵ هاتبن. خەمڵاندنی دانیشتووانی ئـورکیش (١٠-٢٠) هـەزار

کەس بووە، بوسیەتن بڕوای وایە کە شارەکە نزیکەی (١٥٠٠)ی پ.ز چۆڵکراوە.

هۆرییەکان ئارین و سامی نین، هەموو هۆرییەکان ئاریین کە هاتوونەتە خوارەوە زۆر جێگایان بەدەستەوە بووە، وەکو نوتری نزیک ئارەبخا و دەشتی شارەزوور لەدواییدا باسی لێوە دەکەین.

## سیاسەتی ئاشوورییەکان لە کوردستانی کۆندا

سیاسەتی ئاشوورییەکان لە کوردستانی کۆندا بەدیلگرتن و کۆیلەکردن و پەنجەبڕینی ئەو کەسانەی وەکو چاندنی چەندەها هۆز و خەڵك و نەتەوە هەندێك لە مێژوونووسان لە سەردەمی ئاشووری نوێدا کۆیلە بۆ ماڵەکانی ئاشووریان لەنێوان (٣ بۆ ٤) کۆیلە بوون. جگە لە ژمارەیەکی بە شومار کۆیلە کە فەرمان پاشاڵی هەیان بووە لە کاروباری دەوڵەتدا کاریان پێ کردوون. ئەمەش جگە لەو گەنجە کوڕ و کچانەی سووتاندوویانن. هەروەها زۆر کۆمەڵی نیشینگەی جولەکە لە ئێران و ناوچەکانی کوردستاندا یەکێکە لە ئەنجامەکانی سیاسەتی ڕاگواستن و تێکەڵکردنی گەلان و نەتەوەکانی ناوچەکە لەسەر دەستی ئاشوورییەکان.

کۆنترین کرداری زانراوی کۆچاندن لە مێژوودا تا ئێستا، کۆنترین کرداری لەو جۆرە کە زانیاریمان لەبارەیەوە هەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاشایەتی بنەماڵەی سێیەمی ئوور (٢١١٢-٢٠٠٤)ی پ.ز، لە کۆی پێنج پاشای ئەم بنەماڵەیە سێیان هەموو لەشکرکێشییەکانیان بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان

بووه. ئەو ئۆردووگایانەی لە نزیك شاری نیپور (Nippur )ی کۆن بۆ ئەو خەڵکە ڕاگوێزراوانە دروستکراون کە لە ئەنجامی شەڕەکاندا ڕایان پێچاون. ئەمەش خەڵکانی کوردستان بوون یەکەمین کرداری لەوجۆرە ئاراستەی ئەوانە کراوە، یەکەمین ئۆردووگای ڕاگوێزراو و بەتالانبراو بۆ خەڵکی کوردستان دروستکراوە.

یەکەم پادشای ئاشوور سیاسەتی بەکۆمەڵ کۆچاندن و دوورخستنەوەی گرتووەتە بەر ئەداد نیو ڕای یەکەم ساڵی (١٣٠٧- ١٢٧٥) پ.ز لە هێرشەکەیدا بۆ سەرنشینی خانیگا کبائد ئەنجامی داوە، هۆیەکەشی جیابوونەوەی سەربەخۆیی هەڵدانی (واساشاتتا)ی پاشای ئەم شانشینە بوو لە دەوڵەتی ئاشووری، وڵاتەکەی خستە ژێر دەستی خۆی، دەڵێت: (واساشاتتا) خۆی و خێزانی و کوڕی و گەلەکەیم بەدیل گرت و هێنامن.

شالمانسەری یەکەم (١٢٧٤- ١٢٤٥) پ.ز کوڕەکەی بە ناوی توکولش نیورتای یەکەم (١٢٠٨-١٢٤٤) کوڕی شالمانسەری لەسەر ئەم سیاسەتە بەردەوام بوون.

تیگلات پلایسەری یەکەم (١٥٢-١٠٧٧) پ.ز باسی هەڵاتنی کاقوخەیەکانی وڵاتی شوباری دەکات لەدەست سوپاکەی و پەنابردنیان بۆ شاری شیریش دەڵێت: (عارەبانەکانم و هێزەکانم بردە سەر شاخە سەختەکە و بەناو ڕێگا ماندووکەرەکانیدا ڕێگایەکم بە قوڵنگە برۆنزییەکانم کردووە، جادەیەکم بۆ ڕێ ڕۆیشتن بۆ عارەبانەکانم و هێزەکانم کردەوە).

له سەردەمی ئاشووری نوێشدا (٦١٢-٩١١) پ.ز بردنی مـادەی خاو لە کوردستانەوە بۆ وڵاتی ئاشوور زۆر برەوی هەبووە.

٢٢- تیگلات پلایسەری سێیەم (٧٢٧-٧٤٤)پ.ز لە کوچـاندا لەوانـەی پێشتر زیاتر ڕۆیشتووە، تەنها لە یەك لەشکرکێشیدا (٦٥٠٠٠) هەزار میـدی لە وڵاتی میدیاوە ڕاگواستووە، ناوهێنـانی ژمارەیـەکی زۆر شـار و شارۆچـکە دەڵێت: (وڵاتی) ژێر ناوچەکانی میدییە بەهێزەکان، وەك بـە تـۆڕ دام پۆشـین هەتا دەگاتە دوورترین سنووریان.

ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانیانم سـەربڕی (٦٥٠٠٠) هـەزار کەسـم بـە خۆیـان و کەلوپەلیانـەوە، ئەسـپەکانیان، ئێسـترەکانیان، حوشـترەکانیان (باکتریایی)یەکانیان، مەڕوماڵاتیان بە بڕی لە ژمارە نەهاتوو، ڕاپێچـا. نـەك هەر میدیا، بەڵکو (٢٠٠٠٠) کەسم لە سوریاوە هێنا بۆ چیاکانی زاگـرۆس، (١٨٠٠٠) کەس لە ڕۆخی چەپی دیجلەوە ڕاگواسـت بـۆ سـوریا، (١٥٤٠٠٠) هەزار کەسم لە باشووری میسۆپۆتامیاوە ڕاگواست، هەندێ خەڵکی دیکـەیان لە جێگایانی دیکەوە دەهێنا بۆ جێگای کۆچکردووەکان.

٢٣- سـارگونی دووەم (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) دەڵێـت: خـەڵکی خارخـار، کیبایای شارداریان و وەرناوە و ئەم شارەیان گرت و تاڵانیـان کـردن، خـەڵکی شـوێنانی تـر کـە داگـیری کردبـوون، هێنـامن و لـەوێ نیشـتەجێم کـردن،

فەرمانبەرم کرد بە فەرمانڕەوایان، هەروەها (خەڵکم بە خۆیان و کەلوپەلیانەوە) لە وڵاتی خۆیان لە پێنج مینا (لە وڵاتی خاتستی نیشتەجێم کردن).

سەرباری کۆچاندنی دانیشتووان، ڕەفتاری سووتاندنی شار و ئاوایی و فەوتاندنی باخ و بێستان و شینایی. بۆ ئەوەی نائومێدبن لە گەڕانەوەیان.

گیای (کوی یمسو)ی سوێریان کردووە بە زەوی شارە وێرانکراوەکانەوە تاوەکو جارێکی تر نەتوانرێت ئاوەدان بکرێنەوە و ژیانیان تێدا دروست بێتەوە.

تیگلات پلایسەری سێیەمیش پاش باسی کۆچاندنی ئەو (٦٥٠٠٠) میدییەی ئاماژەیان بۆکرا، دەڵێت: (شارەکانیانم وێران کرد ) تارومارم کرد، ئاگرم تێبەردا، کردمنە گردۆڵکە و وێرانە.

٢٤- سارگونە ئاشووری لە شوێنێکی تردا لەبارەی خارخارەوە دەڵێت: (چەکی خواوەند) ئاشوور، سەردارم، وەك خواوەند بۆیان دانا (خارخار)م ناونا (کار-شاروکین)، لە (٢٨) شارداری وڵاتی میدییە بەهێزەکانەوە سەرانەم بۆ هات و وێنەی خۆم لە (گار-شاروکین دانا) یان شارەکانی کیشیلشو، کەنیداو، بیت باکایا و ژاریام گەمارۆدا، گرتمن، ئەمانیشم چاك کردەوە و ناوم نا (کارنابو، کاریسین، کار ئەددە، کارعیشتار)، کە هەموویان ناوی خواوەندە ئاشوورییەکانی تێدایە... فەرمانبەرەکانم بەسەریانەوە کرد بە فەرمانڕەوا، ناوم نایەوە (کارنیورتا).

١- حانشي- ولآتی حسییه‌كان بووه نزیك میپانییه‌كان.

٢٥- ئاشوور ناسیرپالّی دووه‌م، له هه‌موو پادشاكانی تر زیاتر به‌توندوتیژتر ناسراوه، له هه‌موشیان وردتر باسی به‌كۆمه‌لّكوشتنه‌كانی خۆی كردووه. بۆ نموونه له شالآوه‌كه‌یدا بۆ سه‌ر شاری -ئامه‌سال- له زاموا ده‌لّێت: له شالآوه‌كه‌یدا له شاره‌كه‌دا (٨٠٠) هه‌شتسه‌د جه‌نگاوه‌ریانم به شمشێر به‌زه‌ویدا دا، به لاشه‌كانیان كۆلآنه‌كانی شاره‌كه‌یانم پڕكرد، خانووه‌كانیانم به خوێنیان ڕه‌نگ كرد، زۆریانم به زیندوویی گرت و (ئاشوور ناسیرپالّ، پالّه‌وان، وه‌ك بالّدار كه‌وته دوویان (واته خه‌لّكی هه‌لآتوو)، لاشه‌كانیان له‌سه‌ر شاخی نه‌یصیر (پیره‌مه‌گروون) له‌سه‌ر یه‌ك كه‌لّه‌كه‌م كرد، ٣٢٦ جه‌نگاوه‌ریانم سه‌ربڕی. حه‌وت شاره‌كه له‌ناو جه‌رگه‌ی شاخی نه‌یصیر بوون وه‌ك قه‌لآكانیان مه‌حكوم بوون، داگیرم كردن، دانیشتووانه‌كانیانم سه‌ربڕی و كه‌لوپه‌ل و مه‌ڕومالآتیانم برد، شاره‌كانم به ئاگر سووتاند، گه‌ڕامه‌وه ئۆردووگاكه‌م و شه‌وم (له‌وێ به‌سه‌ربرد). هه‌روه‌ها سه‌ری كوژراوه‌كانم به قه‌د داره‌كانه‌ی (قه‌دپالّی) چیاكه‌دا هه‌لّواسی، كوڕ و كچه لاوه‌كانیانم له ئاگردا سووتاند. له باسی (كیرخی)شدا له باكووره‌وه ده‌لّێت: (خه‌لّك) بۆ پاراستنی ژیانی خۆیان به شاخی سه‌ختی مانكییا هه‌لّگه‌ڕان، به‌دوایاندا چووم و له ناوه‌ڕاستی ئه‌و شاخه سه‌خته‌دا هه‌زار جه‌نگاوه‌ریانم سه‌ربڕی، شاخه‌كه‌م به خوێنیان ڕه‌نگ كرد. شارێكی گرنگی لۆلۆبییه‌كان بووه له زاموادا، پایته‌ختی ئه‌و میرنشینه بووه

فەرمانبەرم کرد بە فەرمانڕەوایان، هەروەها (خەڵکم بە خۆیان و کەلوپەلیانەوە) لە وڵاتی خۆیان لە پێنج مینا (لە وڵاتی خاتستی نیشتەجێم کردن).

سەرباری کۆچاندنی دانیشتووان، ڕەفتاری سووتاندنی شار و ئاوایی و فەوتاندنی باخ و بێستان و شینایی. بۆ ئەوەی نائومێدبن لە گەڕانەوەیان.

گیای (کوی یمسو)ی سوێریان کردووە بە زەوی شارە وێرانکراوەکانەوە تاوەکو جارێکی تر نەتوانرێت ئاوەدان بکرێنەوە و ژیانیان تێدا دروست بێتەوە.

تیگلات پلایسەری سێیەمیش پاش باسی کۆچاندنی ئەو (٦٥٠٠٠) میدییەی ئاماژەیان بۆکرا، دەڵێت: (شارەکانیانم وێران کرد) تارومارم کرد، ئاگرم تێبەردا، کردمنە گردۆڵکە و وێرانە.

٢٤- سارگونە ئاشووری لە شوێنێکی تردا لەبارەی خارخارەوە دەڵێت: (چەکی خواوەند) ئاشوور، سەردارم، وەك خواوەند بۆیان دانا (خارخار)م ناونا (کار-شاروکین)، لە (٢٨) شارداری وڵاتی میدییە بەهێزەکانەوە سەرانەم بۆ هات و وێنەی خۆم لە (گار-شاروکین دانا) یان شارەکانی کیشیلشو، کەنیداو، بیت باکایا و ژاریام گەمارۆدا، گرتمن، ئەمانیشم چاك کردەوە و ناوم نا (کارنابو، کاریسین، کار ئەدەد، کارعیشتار)، کە هەموویان ناوی خواوەندە ئاشوورییەکانی تێدایە... فەرمانبەرەکانم بەسەریانەوە کرد بە فەرمانڕەوا، ناوم نایەوە (کارنیورتا).

١- حانشی- ولاتی حسییەکان بووە نزیك میپانییەکان.

٢٥- ئاشـوور ناسـیرپالی دووەم، لـە هـەموو پادشـاکانی تـر زیـاتر بەتوندوتیژتر ناسراوە، لە هەمووشیان وردتر باسی بەکۆمەلکوشتنەکانی خۆی کردووە. بۆ نموونە لە شالاوەکەیدا بۆ سەر شاری -ئامەسال- لە زاموا دەلێـت: لە شالاوەکەیدا لـە شـارەکەدا (٨٠٠) هەشتسـەد جـەنگاوەریانم بـە شمشـێر بەزەویدا دا، بە لاشەکانیان کۆلانەکانی شارەکەیانم پڕکـرد، خانووەکانیـانم بـە خوێنیان ڕەنگ کرد، زۆریانم بە زیندوویی گرت و (ئاشوور ناسیرپال، پالـەوان، وەك بالدار کەوتە دوویان (واتە خەلکی هەلاتوو)، لاشەکانیان لەسەر شـاخی نەیصـیر (پیرەمـەگروون) لەسـەر یـەك کەلەکـەم کـرد، ٣٢٦ جـەنگاوەریانم سەربڕی. حەوت شارەکە لەناو جەرگەی شاخی نەیصـیر بـوون وەك قـەلاکانیان مـەحکوم بـوون، داگـیرم کـردن، دانیشـتووانەکانیانم سـەربڕی و کەلوپـەل و مەڕومالاتیانم برد، شارەکانم بە ئاگر سووتاند، گەڕامەوە ئۆردووگاکەم و شەوم (لەوێ بەسەربرد). هەروەها سەری کوژراوەکانم بە قەد دارەکانەی (قـەدپالی) چیاکەدا هەلواسی، کوڕ و کچە لاوەکانیانم لـە ئـاگردا سـووتاند. لـە باسـی (کیرخی)شدا لە باکوورەوە دەلێت: (خەلك) بۆ پاراسـتنی ژیـانی خۆیـان بـە شاخی سەختی مانکییا هەلگەڕان، بەدوایاندا چووم و لە ناوەڕاستی ئەو شاخە سەختەدا هەزار جەنگاوەریانم سەربڕی، شـاخەکەم بـە خوێنیـان ڕەنـگ کـرد. شارێکی گرنگی لۆلۆییەکان بووە لە زاموادا، پایتەختی ئەو میرنشـینە بـووە

که ئاراشتوا میری بـووه. بـه‌ڕای سـپیه زۆر پاشماوه‌کـانی لـه هـه‌مان گـردی (نه‌مه‌ڵ)ی ئێستایه له شاره‌زوور.

٢٧- له ئه‌نجامی یه‌کێك لـه‌و ڕاپه‌ڕینانـه، سـارگون ده‌ڵێـت: (کیبابـا - فه‌رمانڕه‌وایی خارخار، گه‌مارۆم دا، گرتم، خۆی و خـه‌ڵکی ولاته‌کـه‌یم بـه‌تالان برد)... زۆریان به ئه‌شکه‌نجه کوژران، یان بـه خۆیـان و خێزانیانـه‌وه بـۆ دوور ولات دوورخراونه‌ته‌وه، هه‌روه‌ك سارگۆن ده‌ڵێت: ئاشوور- لیئـوی کـاراللا (و) ئیتتی بێ ئاللابریا، نیری ئاشووریان داماڵیبوو (به‌ری ئاشووریان) بـه‌ردابوو، ئاشوور- لیئوم که‌وڵ کرد و خه‌ڵکی کـاراللا هـه‌موو لـه‌وێ بـوون، ئیشـتیم له‌گه‌ڵ خێزانه‌که‌ی ڕاپێچا و له حه‌مات نیشته‌جێم کردن، خه‌ڵکی شاره‌کان...م له شوێن خۆیان پچڕی و له‌ریمه‌شعدو ولاتی حسییه‌کان نیشته‌جێم کردن.

ئاشوور ناسیرپالیش له هێرشه‌که‌یدا بۆ زاموا ده‌ڵێت: (بوبو، کوڕی بوبـا) فه‌رمانڕه‌وایی شاری نیشتون، له شاری ئه‌ربیلا (مانه‌وه ولـیر) کـه‌وڵم کـرد و پێسته‌که‌یم به‌سه‌ر شورای شاردا هه‌ڵخست.

خارخار ڕه‌نگه هه‌ڵه‌بجه‌ی ئێستا بێت، که ناوی هاتووه به هارهار و کاراخار و خارخار (مه‌لا عه‌لی).

## شاخی پیرەمەگروون (زەردەشتی):

ناوی پیرەمەگروون لە کتێبی گەشتەوانەکاندا و نەخشەکۆنەکان بە ناوی (پیر عومەر گەدروون) هاتووە. خامازی (Hamazi) بەناوبانگ بووە خەمزە ولاتی لوللو لە ئوروناتاسینو دریش دەبێتەوە.

ئەو ساڵە خوارووی کوردستان ولاتی خامازی (Hamazi) خافرێ بەناوبانگ بوو، هەتا دوای پەیدابوونی لوللو گوتوو گەلانی تر بەزیاد لە چوار سەدە ناوی هەردەمێنێت، خامازای ئەوەندە بەهێز بوو لەکاتی خاتانیش (یان خادانیش-Hatanish)ی پادشایدا بەشێکی ولاتی دوو ڕووباری گرتبوو نیشانەیەکی تری بەهێزی ئەو ولاتە ئەوەیە کە شاری (ئیبلا)ی سوریا کە نزیکی (٨٠٠)کم دوور بوو لێی داوای سەربازی مەشقپێکراوی کردبوو لە زیزی (Zizi)، پادشای خامازی نزیك سلێمانی بوو، بەراوردیش کراوە لەگەڵ گوندی (خەمزە)ی ناوچەی ئەزمڕ، لە ڕاستیدا شێوەیەکی ناوەکەی هەیە ئەویش خافزی (Hamze)، کە دەکرێت هەروا بە (خامزی) یان (خەمزە)ش بخوێنرێتەوە، بۆیە دوور نییە هەروا بە (خامزە) خۆی بێت، لەو کاتانەدا ناوچەی پارێزگای سلێمانی (خامازی)ی پێ دەوترێت، لەوانەیە خەڵکی خامازی هەر ئەو گەلە بووبن کە لوللو ساڵ لەدوای ساڵ دەیان تواندەوە، بەمەرجێك خەڵکی خامازی لولویی نەبووبن.

سەبارەت بە لوللو دەڵێت (لە ئوروناتاسینو) ولاتی (لوللوبی)، واتە ولاتی لوللوبی لە ئوروونا (u-iu-na) تا صینو (si-nu) درێژ دەبێتەوە، خوێندنەوەی ناوی دووەمیش گومانی تێدایە (برگەی صی) دێڕێکی دەقەکەی

تریش دەڵێت کە وا ڕێگای ناو وڵاتی لوللوبیی (٩٠) بیرو بە واتای (٩٦٢) کیلۆمەترە، دیارە ئەمە درێژایی هەموو ڕێگاکانی ناو وڵاتەکەیە.

نارام سین کوڕی مانیشتوسو، بە شەڕ ڕووی کردە وڵاتەکانی نزیك و دووری ئەکەد: (ئاوانی) و (ئارمان) لە باشووری وڵاتی (لوللو)و لە خۆرئاوادا (ئیبلا) لە ژووروویشدا گەیشتە ناوەوەی کوردستانی تورکیا.

زنجیرەی سێیەمی ئور... (شولگی) پادشای (٢٠٤٨-٢٩٥)پ.ز بوو دە جار لولو بوون وێران کرد و سێ ساڵ لەشکرەکەشی کە دەزانین (٢٦، ٤٥ و ٤٥)یەمی ساڵی حوکمی لەم سی ساڵەدا سیمورم (Simurum)، شیموروم، وتمان نزیك پردی لەڵیدا وێران کرابوو، ئێمەش دەڵێین دووجار، چونکە ساڵی (٤٥)می شولکی ئەم ناونیشانەی هەیە (ئەو ساڵەی سیموروم و لولوموم بۆ نۆیەمین جار وێران کران) لە ساڵی (٤٦)ەمیشدا ئەم دوو وڵاتیمان لەگەڵدا بوون:

کارخار بە بەرواری ئێمە خوارووی کەرکوك و هەولێر لە خۆرئاوای نەخشەکەی ئانوبانی لە دەربەندی بێلولەی نزیك گوندی شێخان نەخشێکی هەڵکەندراو هەیە کە بە ساکاری کراوە و هەروەك هەموو ملیکی سەرکەوتنی هەر باسی سەرکەوتنی پادشایەك بەسەر دوژمنەکانیدا دەکات، لای هەندێك زانا نووسینەکە هی پادشایەکی ترە و وێنەکان هی پادشایەکی کۆنترن، ناوی کابراکە بەچەند شێوەیەك خوێندراوەتەوە: تار... دون نی- تار... تی)، (× - بی ڕی نی، شیر پیرنیی)، (... ئیر پیر ین)، بەگشتی هەموویان باسی سەرکەوتنی پادشا دەکەن، یەکێکیان نەبێت ئەویش وەرگێرانە کۆنەکەیە،

کـابرا نـاوی بـاوکی دەهێنێـت، کـە یـان (ئیسـککی)یـە، یـان (ئیککیـپ شاخمات)ە، ئەویش بەپێی وەرگێڕانەکە لە نـەخش و نووسـینەکەش دیـارە کـە میلەکە کۆنترە لەوەی ئانوبانی نی. ڕەنگە ولاتی لولومی و ئادائوش یەك بەش بووبن و دووەمیان هەروا لوللومی تێدا ژیابێت، هەرچەندە تێگلات پـلا سـەر خاکی لوللومی و ئادائوشی هەریەك بە جیـا دانـاوە ناشـزانین ئەگـەر کێـوی سارائوش بێت یا نا. دیارە کە سارا دائوش هەر (سـورداش)ی ئێسـتایە، واتـا سورداش پەیوەندی نییە بە (سوور-تاش) واتا بەردی سـوور وەك لـە هەنـدێ سەرچاوەی کوردیدا باوە شوێنی موراتتاش لە سورداشەوە نزیـك بـوو، ڕەنگـە ناوەکـەی ئێسـتا فـەوتابێت، جگـە لەمـەش نـاوی وەك ئەمانـە هێشـتا لـە ناوچەکەدا ماوە وەکو ئەشکەوتەکانی (تەشویتاش)، کە بەپێی تایبەتییـەکی زمانی کوردی دەتوانین ئەسلّکە بە (تەشـیۆتاش) بـزانین (تەشـوژش) ئەگـەر بڕگەیەکی سەربەخۆ بێت هەمان کۆتایی ناوی جووەکانی (ئاسانیو)و ئالانیوی هەیە.

ناوی کیوی ییبیغ (Ebih) هـاتووە، کـە بـە مـرین زانـراوە لـە سـالّی (٨٨٠)پ.ز دوومـــیری زامـــۆی، ئامیکـــا (Ameka) و ئاراشـــتوا (Arashtua) یان (ئاراشتو) یاخی بوون، ئەمجارە ئاشوور ناسیرپالّ لە یەکەم ڕۆژی مانگی (سیمانو)، واتا ناوەڕاستی (ئایار) لە کیلیزییەوە دەرچوو، لەزێ پەڕییەوە گەیشتە دەربەندی بابیتی، ڕووباری ڕادنو (Radanu)ی بڕی پاشان گەیشتە کێوی سیماکی (Simaki) و سەرانەی وەرگرت لـە ولاتـی داکـارا، پادشا بەدرێژایی سیماکی ڕۆیشتووە، لە ڕووباری تورانات پەڕییـەوە بـە پەلـە

نزیك کەوت لـە ئامـالی (Ammali) یـان مـاملی (Mamli) پەناگـەی ئاراشتوا، ئاشوور ناسیرپاڵ شارەکەی گرت و بە لاشـەی (٢٠٠) جـەنگاوەریان (شەقامەکانی شارەکەیانی پڕکرد بە خوێنەکەیان خانووەکانیانی ڕەنگ کرد)، دوای ئەوەی کەلوپەل و دیلی زۆری دەستکەوت، شارەکەی سووتاند.

هەر لەو ناوچەیە شـاری خـودون (Hudun) و (٢٠) دێـی دەوروبـەری گرت، نەك تەنها شارەکانی تالاّن کرد و سووتاندی، بەڵکو کوڕ و کچەکانیشی (فڕێدایە ناو ئاگر)، شـاری کیسـیرتو (Kisirtu) کـە گونـدی (قسـرش)ی ئێستایە و شاری کابرایەك بە ناوی سابینی، یـان زابینـی (Sabini) بـووە، هەروەها (١٠) دێ (نووسراوە) شاری دەوروبەری گرت و هەمـان تالاّنکـاریی و سووتاندنی کردووە. پاشان دەڵێت: شارەکانی بارابیەکان کە کیرتیارا ئەوانـەی دوورا (هـــی دوورایـــەکان) و بوونیاییـــەکان تـــا دەربەنـــدی خاشمـــار (Hashmar)ی وێران کرد و سووتاند، ئامیکاو ئاراشـتوا لـەو مەیدانـەدا بوون وەك پادشا دەڵێت، بەڵکو هەموو میرانی زاموا بەشدار بوون تیایدا، لەم لەشکرکێشییەدا، ئەمانە هەموویان سەرانەیان دا بە پاشای ئاشوور.

١- رادانو: (عزیم)و لقەکانییەتی -لێرەشـدا نـاوی تـەیناڵ .Spieser .P.25

٢- تورنات: (سیروان)ە، لێرەدا تانجەرۆیە.

٣- خاشمار دەربەندیخانە لای سپایزەر.

ئەم ناوەش بە (کاش) زانراوە بە واتای (هـەڵۆ)، پادشـای بـابلی (ئیـا-مەکین-زێری) خەڵکی خاشمار بووە (کوڕی بیت-خاشمار) دوای گرتنی کیسیرتو

پادشا لە خاکی ئاراشتوا دەرچوو بە ناو دەربەندی نێوان کێـوە بـەرزەکانی لارا (Lara)، یـان-لارە- و بیـدیرگی (Bidirgi) بـەرەو زامـری (Zamri) شاری ئامیکا ڕۆیشت، پادشا شارو کە بە (شاری پادشایانی ئامیکـای ولاتـی زاموام ناو دەبات، واتا پایتەختی).

کامیکا پەنای بـردە بـەر کێوێـك و ئاشـوور-ناسـیرپاڵ دوای تـالانکردنی شارەکە لە ڕووباری لاللو (Lallu) دەپەڕێتەوە بەرەو کێوی ئیتینی (Etini) دەڕوات، ئەویش بە خاکێك کە بەسەخت دەهاتە بەرچاوی. کۆشکەکەی گرت و تالانێکی زۆری دەست کەوت.

ڕۆژی دوایی لە ڕووباری ئیدیر (Edir)یەوە لـە ناوەڕاسـتی کێـوی سـوو (Su) (یان سوانی Suani) و ئیلانیو (Elaniu) دوو لەشکر پێکاچـوون ئاشوورییەکان هەمان دەستکەوتەکانی پێشووی کێوی ئیتینیان دەست کەوت، لەوانە گایەکی مسین بوو.

لە ڕووبەری قەلاکـەدا قـەلای ئامیکـا: زامـرۆ (Zamru)، ئاراسـیتکو (Arasitku) ئامارو (Ammaru)، پارسـیندو (Parsindu) ئیریتـۆی (Ireitu)، سوریتو (Suritu) لەگەڵ (١٥٠) دێی دەوروبـەری وێرانکـرد و سووتاند، لە شەڕێکدا پەنجا جەنگاوەری ئامێکا لەسەر دەستی ئاشوورییەکان کوژران و سەرەکانیان بە درەختەکانی حەوشی کۆشکەکەی ئامێکا هەڵواسران (٢٠)ی تریشی بەزیندوویی دیواری کۆشکەکەیانی بەسەردا ڕووخاند.

ئاتا (Ata)ناوێك غارەکانی ئـارزیز (Arziz) کـە پایتـەختی بـوو، وە ئارسیندو (Arsindu) بن کێوی نیشپیی لەژێر دەستدابوو. ئەم کابرایە هەر

لەو ناوچانەدابوو. دوو شارەکەی سـەرەوە و (١٠) دێـی دەوروبـەری ئەمانـەش هەموو سووتێنران، پادشا گەڕایەوە زامری. لاشەی ئـەو خەڵکـە کـە (٥٠٠) کەس بوون جەنگاوەر بەو ناوەدا بڵاوکرایەوە. دوای وێرانکردنی شاری ئات لـیلا (At lila) پادشا ئاوەدانی دەکاتەوە. ئـەی کـات بـە عـەمباری دانەوێڵـەی ناوچەکە ناوی شارەکە دەگۆڕێـت بـۆ زوور-ئاشـوور، واتـە قـەڵای خواوەنـدی ئاشوور. ڕووباری لاللو لای سپایزەر (گوگە سورە) و دوای ئەو کێوی (ئێتینی) دێت، کێوە بەرزەکەی خۆرئاوای پێنجوینە، ڕووباری (ئێدیر) کە لێی پەڕییەوە (قزلجە)یەو کێوەکانی (سوان) و (ئیلانیو) کێـوی (کـانی مـیران) و ئـەوەی خۆرهەڵاتی پارسیندو کە شارێکی ئامێکا بووە و بە (پارەزان)ی داناوە.

(سپایزەر) وڵاتی (ئاتا)، کە میری (ئارزیزو) بـوو لـە ناوچـەی (سـۆرین) داناوە خوارووی خۆرهەڵاتی زامری.

دوایەمین شەڕ دژی خەڵکی مێسو ڕاکردووەکان بوو (سپایزەر) مێسوی بە (وەڵانە= وەلدانە) داناوە گوایە لە عەربەت یان بێستان سـوورەوە بـۆی چـووە، بوو بە دۆڵی دووکانیان) ئەگەر زنجیرەی سیماکی گڵـەزەردە (بـەرانانی) بێـت، ئەوا (مێسو) لە دەشتی سلێمانی یان دەشتی عەربەتدایە.

ئاتیلا (واتە دوور- ئاشوور) کە سپایزەر بـە بـەکراوای دانـابوو. ئاراکـدی لەوانەیە خورماڵ بێت- (سپایزەر) کارکدی بە گروی (بنگرد)ی نزیك (کـانی پانکە)ی داناوە.

ئارکدی= دەبێت خورماڵ بێت- زۆر بەڵگە پشتگیری دەکەن کە خورماڵە.

دوور -تالیتی- (چەمچەماڵ).

بابێتی (بازیان). بیروتو (گۆپاڵە).

لالاگـا لاگـا (تولۆبـولاق) گۆپاڵـە، دوور لولومـای (کێلەسـپی... واتـا کەنەکەوەی ئێستا). بارا گردەبۆر. ئازازی، ئاساریی، شاسری، (نزیك سلێمانی) ئامالی، (نەمەڵ). کیصرتو (قسرت)، ئاراکدی (بنگردی نزیك کانی پانکـە و خورماڵ، میسصو (وەڵانە) دەشتی سلێمانی پانی عەربەت، زاهـری (ناوچـەی دەوروبەری ئەحمەد کمالوان لە پێنجو. پاسیندو (پارازان)، وڵاتـی ئاتـا، واتـا شارەکانی ئاریزو، ئاسیندو (نزیك کێوی سورێن) ئاتلیلا (بەکرئاوا)، دەربەنـد و وڵاتی خاشمـار (دەربەنـدیخان)، کێـوی ئـازیرو (ئـەزمڕ)، کێـوی سـیماکی (گۆیژە) بەرانان.

نیشپی (هــەورامان)، لارا (کوردیـوان) میـدریکی (خۆرهـەڵاتی ئـەو)، ئیتینی (خۆرئاوای شاری پێنجوین)، سواتی و ئیلانیو (کێوی کانی مـیران) و ئەوەی خۆرهەڵاتی لە ناوچەی پێنجوین، ڕووباری لاللو (گوکە سوور)، سپایزەر پێی دەڵێت تەنکییە.

ڕووباری ئیدیر (قزڵجە).

شالمانیسەری سێیەم (٨٢٤-٨٥٨)پ.ز کوڕی ئاشور ناسیرپاڵ ناوی مازاسوا بەکاردەهێنێت، هەروەها لە کاتی ئەودا (زاموای ناوخۆ) پەیدا دەبێت.

لــە چـوارەم ســاڵی فەرمانبەرایەتیـدا، واتـا سـاڵی (٨٥٥) لـە کێـوی (کوللار)، واتە زنجیرەی ئاسۆس -کێوەڕەش پەڕییەوە، دابەزی بۆ زاموای ناوخۆ، دوو میری زاموایی ئەو ناوچەیان فەرمانبەرایەتی دەکرد.

## نەورۆزنامەی کوردی ئەدیبان

| تۆفیق وەهبی | دکتۆر کامەران بەدرخان | ئەبدورەحمانی زوبیحی | ئەیوبیان |
|---|---|---|---|
| نەورۆز | ئازار | خاکە لێوە | نووسان |
| گوڵان | گوڵان | نامەبەر | گوڵان |
| باران بران | ئایار | جۆزەردان | زەردان |
| گەرماجمان | حوزیران | پوشپەڕ | پەڕان |
| گەلاوێژ | تیرمە | گەلاوێژ | گران |
| بەرەو پایز | تەباخ | خەرمانان | سوران |
| میران | ئایلرن | ڕەزبەر | بەرات |
| گەلاڕێزان | چریاپیشین | خەزەڵوەر | وەران |
| ئاگردان | چریاپاشین | سەرماوەرز | ساران |
| سەهۆڵ بەندان | چلەی پیشین | بەفرانبار | بەفران |
| نازستان | چلەی پاشین | ڕێبەندان | بەندان |
| پولان | شوبات | ڕەشەمە | پۆلان |

**١٥٩٣ی کوردی بەرامبەر ١٩٨١ی مەسیحی**

**١٤٠١ی عەرەبی، ١٣٦٠ی پارسی، ٤٤٧٤ی ڕەمەش**

کوردستانی باشوور لەشکرکێشییەکەی ئاشوور ناسیرپاڵی دووەم بۆ سەر وڵاتی زامووا. نووسینی (Phraim. A. Spet sea) شیروان ئەحمەد لە ئینگلیزییەوە کردوویەتییە کوردی، یاسین تەپە لە شارەزووردا لە هەموویان گەورەتر بووە. شێوەکەی لاکێشییەو پێوانەکەی (٦٠٠×٦٦٠) پێیە و بەرزییەکەی (٦٠) پێ. خەندەقێکی پانی ئاو چواردەوری شوێنەوارەکەی داوە لەگەڵ دوو جۆگەلەی بچووك کە لێرەوە دەڕژێتە ناو تانجەرۆوە.

گردی بەکرئاوە بەرزترە لە یاسین تەپە، بیرێك دەکەوێتە چاڵە هەڵکەندراوەکەی باشوور. بیرەکە بە خشتی سوور هەڵچنراوە، دەکەوێتە دووری (١٣٠) پێ لە دەستپێکردنی لێژاییەکەی ئێستا. ڕووبەرەکەی (٢٥) پێیە و بەرزییەکەی (٥٠)پێ، تێکڕای بەرزییەکەی ناتوانرێت بزانرێت.

دەفرێکی سواڵەتی ڕێککراو کە بۆ سەروەریی فارسەکان دەگەڕێتەوە لە قووڵایی (١٤)پێ دۆزرایەوە، بەهۆی ئەمەشەوە دەتوانیت دەستنیشانی دروستکەرانی بیرەکە بکەین کە بۆ هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە.

ئاشوورییەکان توانا و هێزی زیادیان بەکارهێناوە لە کار و کرداری نابەرامبەر و دڕندایەتی لەگەڵ (ئامالی) و هوودون و (کیسیرتو) لەگەڵ شارۆچکە بچووکەکانی ناوچەکە، کە پێویستە لای ڕاستی چەمی تانجەرۆ بیاندۆزینەوە، گردەکانی وەکو گردە گچکە و شەکرتەپە شاهیدی ئاسەوارن لەم ناوچەیەدا.

دەربەنـدی (هاشمـار) کـە ئاشـوور ناسـیرپاڵ نـاوی هێنـاوە لـەدوا دوای داگیرکردنەکانیدا هەر دەربەندیخانە. هـەموو ڕووداوەکـانی (ئاراشـتوا) ڕۆڵـی خۆی گێڕا لە کەناری ڕاستی تانجەرۆوە.

لەو شەڕە هەرەگران و بەگڕوتینەدا کە لە دژی پادشای زامـری (ئـەمیکا) هەڵگیرسا دوای شکانی (ئەمیکا) (١٥) شارۆچکە بەپێی ژماردنی قـەڵاکان کەوتنە ژێردەستی ئاشوورییەکان بە مەملەکەتی ئامیکا و شارەزوورەوە.

ئاشوور ناسیرپاڵ هەستا بە دروستکردنەوەی شارە کۆنەکەی (ئەتلیلا)، کە دووبـارە نـاوی نایـەوە (دوور ئاشـوور) کـە مەبەسـتی سـەرەکی لەوێـدا بـۆ کۆکردنەوەی دانەوێڵە بوو.

لەوانەیە ئەمە تەنیا مەبەست بێت بۆ شارەزوور و پێویست بـە دڵەڕاوکـە ناکات لە دانانی (دوور ئاشوور) بە بەکرئاوا.

یورغـان تەپـە: دەکەوێتـە (٤) کیلۆمـەتر و (٧٠٠) مـەتری باشـووری خۆرئاوای کەرکوکەوە. ئەم شارە لە هەزارەی دووەمی پێش زایـین نـاوی نـوزی بووە، بەڵام لە هەزارەی سێیەمی پ.ز-دا نـاوی گاسـوور بـووە، دەوری شـەش هەزار تابلۆی بزماریی تێدا دۆزراوەتـەوە، کـە بـاس لـە جموجـۆڵی سیاسـی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئاینی و جوگرافی ئەو سـەردەمەی ناوچـەکە دەکـەن، هەروەها کۆنترین نەخشەی تۆبۆگرافی لە شاری نوزیدا دۆزراوەتەوە، کە زنجیرەی چیای حەمرین و چیاکانی پشـتی کـەرکوك لەسـەر نەخشـەکە دەستنیشـان کراون.

هەروەها جێگای ژمارەیەك شارۆچكە لە باشووری چیای حەمرین لەگەڵ جۆگا ئاوەكان، ئەوانەی لە زێی بچووكەوە هەڵكەندراون بۆ ئاودێریی و ئاوەدانیی، لە زێی بچووكەوە هەڵكەندراون بۆ ئاودێریی و ئاوەدانیی دەشتەكانی كەركوك بەرچاو دەكەون، لە سەردەمی عەباسییەكاندا، یەكێك لەو جۆگە گەورانە بەناوی (جدول الفیل)، واتە جۆگەی فیل لە مێژووی ئیسلامدا ناوی هاتووە، دوای دۆزینەوەی نەخشەی شاری نوزی، دەركەوت جۆگەی فیل لە هەزارەی دووەم، یان سێیەمی پ.ز-دا دروستكراوە. ئەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی پان لە نەتەوە دێرینەكانی كوردستان.

شاری نوزی لە سەردەمی هەزارەی دووەمی پ.ز-دا خاوەن شارستانێتی و هونەرێكی پێشكەوتوو بووە، بەتایبەتی لە بواری پەیكەرتاشیدا.

## چەرمۆ:

دەكەوێتە دووری نزیكەی (١٠) كیلۆمەتری زنجیرەی چیای بازیان لە باشوورەوە و (١١) كیلۆمەتر لە خۆرهەلاتی چەمچەماڵەوە.

ساڵانی (١٩٤٨، ١٩٥٠، ١٩٥٤، ١٩٥٥) تیمێكی ئاسەوارناسانی زانكۆی شیكاغۆ بە سەرۆكایەتی دكتۆر بریدۆد پشكنینیان لە چەرمۆدا ئەنجام دا و دەركەوت ئاسەوارەكە دەگەڕێتەوە سەردەمی (٦٧٠٠) ساڵ پ.ز. هەندێكی دیكە لایان وایە كۆنترە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (٧٢٠٠) ساڵ پ.ز. هەندێ بەڵگەی دیكەی هەن لە بواری خانووبەرەدا، زۆر زۆر كۆنتر هەیە لەچەرمۆ لە كوردستاندا، دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠) هەزار ساڵ لەمەوپێش، كۆنترین شوێنەواری

خانووبەرە، سەرەتای لە کوردستانی باشووردا دۆزرابێتەوە دوانزە هەزار ساڵ لەمەوبەرە لە (زەڤیاچەمی) لەدێی شانیدەر، لەسەر قەراغی زێی گەورە.

ئاسەواری (کەریم شاهر) دەکەوێتە نزیکەی (٢) کیلۆمەتری باکووری چەرمۆ، کۆنترە و خانووبەرەی سەرەتایی تیا دروستکراوە.

چەرمۆ بە یەکەمین مەڵبەندی کشتوکاڵکردن لە جیهاندا دانراوە، چەندین ئامرازی چاندن و دروێنەی تیا دۆزراوەتەوە، گەنم و جۆ و نیسك و نۆکی تیاکراوە.

کەواتە کوردستان یەکەمین و کۆنترین شوێن بووە لە جیهاندا کە شارستانێتی کشتوکاڵی تیا پەیدا بووە، کشتوکاڵ لە چەرمۆ زۆر کۆنترە لە کشتوکاڵی میسرییەکان و چینییەکان و گەلێ شوێنی تر لە چین (٣) هەزار ساڵ پ.ز کراوە لە میسر (باکووری ئەفریقا ١١٥٥) ساڵ پ.ز کشتوکاڵ کراوە.

لە چەرمۆ نزیکەی (٢٥-٣٠) ئاسەواری خانوو دۆزراونەتەوە بەگوێرەی پشکنینەکان دەرکەوتووە کە یەکەمین خواوەند کە (ژن) بووە، لە چەرمۆدا دۆزراوەتەوە. شوێنەوارناسان ناوی (خواوەندی دایك)یان لێناوە، واتە دوای دوو هەزار ساڵ ئەو پەیکەرە بە زۆر شوێندا بڵاو بووەتەوە.

پسپۆڕانی شوێنەوار لەو باوەڕەدان بیری ئەستێرەناسی، (فلکیان) لای خەڵکی چەرمۆ دانیشتووانی کۆنی کوردستان هەبووە و جموجۆڵ و هاتوچۆی ئەستێرەکانیان کردوونەتە نیشانە و کاتی دەرکەوتنیان دیاری کردوون و پرۆسەکانی کشتوکاڵکردنی وەك چاندن و دروێنە و هەندێ شتی تریان لەسەر

ئەو بنەمایە کردووە. ئەو بەردە خڕەی کە لە ئەشکەوتی شانەدەری دۆزرایەوە (١٢) هێڵی لەسەرە، بەلای زۆربەی شوێنەوارناسانەوە تەقویمی قەبەری بووە.

دەربارەی ئاژەڵ و گیانەوەری کێوی، ناوچەی چەرمۆ دار و دارستانێکی چڕ بووە و زۆر گیانەوەری کێوی تێدا هەبووە.

لەو سەردەمانەدا ناوەند و باشووری عێراق ئاوەدان نەبوون و مرۆڤ لە کوردستانەوە بەرەو خواروو کۆچی کردووە.

تاکو سەردەمی سۆمەرییەکانیش وەك شەپۆلی مرۆڤی دووەم یان سێیەم، خەڵکی کوردستان چوونەتە باشووری عێراق، بەڕای هەندێ زانای وەك تەها باقر لە کوردستانەوە چوونەتە ئەوێ.

لە دێی چەرمۆ ئێستا بتی بچووك و لە قوڕ دروستکراو دۆزراونەتەوە کە بۆ پەرستن بەکارهاتوون. شێوەی ئافرەتیان هەبووە. بەڕای زانایان دەبێت خواوەندی دایك بووبن و پەیوەندی بە پەرستنی خاك و پیت و بەرەکەتییەوە هەبووە، کە لەناو میللەتانی ئەو چەرخەدا باوبووە.

## کەرکوك:

لە چەرخی هورییەکان ناوی ئارانی بووە، دوای هاتنی سامییەکان بووە بە گارمای و دواتریش -کارکا- بەگوێرەی هێندی مەتریاڵی ئێتنۆگرافی، دڕندە و باڵدار پەرستن باوبووە، لەمانە پەرستنی شا شێر و شا هەڵۆ، ناوی ئەمەی دوایی، بەڕای ئورڤیلیچیفسکی، لە ناو خێڵی هەمەوەندا ماوەتەوە کە ئێستاش هەر لەم ناوچەیەدا دژی، ئەم جۆرە پەرستنە لەوێ هەر بەردەوام بووە و لە

دەوری ئەخمینییەکاندا جێگـەی بـول گرپەرسـتن چـۆڵ کـردووە لای ئێرانـی و مادەکان پەرستنی چەند خواوەندێکی جۆراوجـۆر بـاوبووە، کـە ڕەنگدانـەوەی توخم و هێز و دیاردەکانی سرووشت و دەوروبەر بوون، کاریگەریشـیان لەسـەر کۆمەڵگا کرابوون بە خواوەندی چاکەکەر یان زیانبەخش، دواتـر یـەکێك لـە خواکان بەرزتر بـووەوە جێگـە و بایـەخی زیـاتری وەرگـرت، بـووە خواوەنـدی سەرەکی و هەرە بەهێز، وەکو چۆن ئەمە لـە حاڵـەتی خواوەنـدی ئاسمـان، یـا بەدیاوس و ئەهورە ڕوویدا، ئەم دیاردەیەش بوونی خواوەنـدێکی مـەزن لـەناو کۆمەڵێ خواوەندی تردا بە زاراوەی هینـوتییزم ناودەبرێـت. لـە هەمووشـیان زیاتر میترا خواوەندی خۆر و ڕووناکی، ئەمەش گەیشـتە ئاسـیای بچـووك تـا ڕۆما.

ئینگلس گوتەنی، خوای تاك و تەنیا بەبێ شای تاك و تـەنیا هـەرگیز بـە کوپیایەکی کت و متی زۆرداری تاکو تەنیای خۆرهەڵاتییە.

ئێستاش لە گونـدی هـەورامانی تـەخت وا جـەژنێکی کـۆنی زەردەشـتی ماوەتەوە بە ناوی جەژنی (کومسا)، کە ساڵانە لە کۆنە پەرستگایەکدا بەناوی (چلەخانە) دەیگێڕن، لە ڕۆژی ئەو جەژنەدا خەڵکی ئەم ناوچـەیە کۆدەبنـەوە، پیاو ماقوڵ و سەرەك خێڵەکان لەناو چلەخانەدا کە لـە یـەك ژوور پێکهـاتووە هەریەکە لە شوێنی تایبەتی دادەنێن، گوایە پیر شالیار خۆی جێگای بـۆ ئـەم کەسانە دیاری کردووە، خواردنێکی تایبەتی بۆ ئەو ڕۆژە دەکەن کە لە بـرپێش و جەرگ و ناوی حەیوانەوە ئامادەی دەکەن، سماقە و هەناری بەسـەردا دەکـەن، لەدوایدا زیارەتی گۆڕی پیر شالیار دەکەن.

هاتنی جولەکە بۆ کوردستان بـۆ بڵاوبوونـەوەی ئاینەکـەیان، لەوێـدا لـە هەمان کاتی پەیابوونیان بوو لە میسۆپۆتامیا و ئێران و ئاسـیای بچـووکدا، ئەمەش بەهۆی شاڵاوی دوو شەپۆلی جوولەکەکانەوە بوو بۆ ئەم نـاوە، کـە لـە ئەنجامیدا کۆمـەڵە و گرووپە ئاینی و دوورەپەرێز کاتی خۆیان لە سەرانسـەری ئەم هەرێمە بەرفراوانە دامەزراند.

یەکەمین شەپۆلی ئەمانە دوای هێرشەکەی شای بابل (نەبو خودنەسر) بوو ساڵی (٥٨٧) پ.ز بۆ سەر دوو مەملەکەتی جوەکان و ئیسرائیل و یـەهودا و بە دیلگرتنی بەشێکی زۆری دانیشتووانەکانیان و هێنانیان بـە کۆیلـەیی بـۆ بابل. دوای ڕووخاندنی دەستەڵاتی بابل، گەلـێ لە جوەکان بـۆ وڵاتـی خۆیـان گەڕانەوە، بەڵام زۆریشیان مانەوە کە تا ئەوساکە بە پانایی دەوڵەتی ئەخمینیدا بڵاوبووبوونەوە.

دووەمین بڵاوبوونەوە و دەربەدەری جوەکان لە ئەنجامی لەشکرکێشـییەکەی (تینوی) ڕۆمـانیدا بـوو، کـە سـاڵی (٧٠)ی زاینـی فەلەسـتینی داگیرکـرد، ئەمانەی دوایی بەشی زۆریان ڕوویان کردە وڵاتی فارس لەگەڵ ئەوانەی پێشـتر لە ناوچە جیاوازەکانی ئەم وڵاتەدا جێگیر بوون و یەکیان گرتەوە، ئاینەکـەیان ئاینێکی نەتەوەیی ئیتنیکی بوو، مرۆڤی جـوو دەبوایـە لـە دایـك و باوکـەوە جوبێت.

ئامانجی سەرەکی ئەمان پاراستنی پاکی و خاوێنی ئایین و ڕەگەزیان بـووە، لـە دەوری عەباسـییەکاندا جـۆرە ئۆتۆنۆمییـەکیان پێـدرا، جولەکـەکانی

کوردستان بە ئارامی قسەدەکەن و نووسین و خوێندنەوەشیان بە زمانی ئارامییە.

لە ساڵی (٧٤٥) پ.ز ئاشوورییەکان ژمارەیەکی زۆری جولەکەیان برد و لە ناوچەکانی مادی ئێراندا بڵاوەیان پێ کردن.

خەزەرەکان، میللەتێکی زمان تورکی بوون و لەسەر کەناری خۆرئاوای دەریای خەزەر (قەزوێن)دا دەژیان، ئاینی جولەکەیان وەرگرت.

هەروەها تاتەکانی ئێرانی و کارایمی تورکی ئێستاش هەر ماون و بە ڕەگەز پەیوەندییان بە جوەکانەوە نییە، کەچی بە ئایین جولەکەن، بۆیە ناکرێت گریمانی ئەوە نەکەین کە ڕەگەزی جۆراوجۆر لەناو جوەکاندا هەن، یەکێکیش لەمانە ڕەگەزی کوردییە.

## ئاینی مەسیحی:

(مارماری) لە سەدەی سێیەمی زاینیدا لەناو خەڵکی غاری و شەهرکەرد[1] کە بتپەرست و دارپەرست بوون، پڕوپاگەندەیان بۆ مەسیحییەت کردووە. ئەم شارەش دەکەوێتە نێوان هەولێر و تاوق، ئاینی زەردەشتی تاقە ئاینی ناوچەکە نەبووە.

مارسایا لە ساڵی (٤٨٥) مەسیحییەتی لەناو کوردەکاندا بڵاوکردەوە، کە هەتاویان پەرستووە. تۆفیق وەهبی دەڵێت: ئەم هەتاوپەرستانە زەردەشتی نەبوون، ئەم ئاینە لە سەدەی یەکەمی زاینییەوە کەوتووەتە ناوچەی دەستەڵاتداریەتی مەزدایزمەوە، هەر لەو کاتەوە زۆرانبازیی نێوان ئەم دوو

ئاینە دەستی پێ کردووە، مەسیحییەت وردە وردە جێ پێی خۆی لەوێ داگرتووە. دوای هاتنی ئیسلام قەدەغە کرا، ئیسلام نابێت ببێت بە مەسیحی.

شای ئەرمینیا: تیرایداتی سێیەم لە سەدەی چوارەم-دا مەسیحییەتی کرد بە ئاینی دەوڵەتی خۆی، ئەم دەوڵەتەش بەشێکی کوردستانی دەگرتە خۆ، بەڵام کوردەکان، بەتایبەتیش لە جێگەکانی دوورە دەسەڵاتی وەکو (هەورامان) بەرەنگاری ئەمانە بوونەوە و هەر بە زەردەشتی مانەوە. ئاینی مەسیحییەکان لەبەر جەور و ستەمی زەردەشتییەکان ڕایان کرد بۆ سەر چیاکان و ئێستاش ئاسەواری دیر و کلێسەکانیان بەسەر شاخەکانەوە ماون، بەتایبەتی بۆ سەر شاری هەولێر فشاری زۆر کرا، چونکە هەولێر هەر لە زووەوە بووبوو بە سەنتەرێکی گرنگی مەسیحییەکان، دوای هەولێر بۆ مەسیحییەکانی خۆرهەڵات (کەرخابیت سلوخ)، کەرکوکی ئێستا بە پلەی دووەم دەهات.

بەشێوەی گرووپی ئیتنو-ئاینی نزیکەی بە هەموو کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە، ئاسوورییەکان میللەتێکی سەربەخۆن و زمانی خۆیان (سریانی) پاراستووە، کە دەچێتەوە سەر زمانی خۆرئاوا لە گرووپی باکووری خێزانە زمانی سامی، ئاسوورییەکان دەبن بە نەوەی ئارامییەکان، کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە سوری، یان سوریان ناویان هاتووە، هەرچی ئەمانە بە خۆیان دەڵێن (ئاتورای) ئاسوورییەکان، هەندێکیان بە هەڵە و زۆریشیان لەبەر ناوبانگی ئیمپراتۆریای ئاشووری، خۆیان دەبەنەوە سەر ئاشووریان، کەچی ئارامییەکان باپیرە گەورەی ڕاستەقینەیان، نەك هەر لە ئاشوورییەکان

کەمتر نەبوو، بەڵکو لە مێژووی کولتووری خۆرهەڵات و جیهاندا ڕۆڵێکی پـڕ شانازییان بینیوە.

ئاسوورییەکان زۆربەیان نەسۆرین و لە ناویانـدا پەیڕەوکـەرانی مەزهـەبی تریش هـەن -یـاقوب (ئـەرتودوکس)، کلـدانی و مـارونی. لـە کوردسـتاندا نەسۆریی، یاقوبی و کلدانی دەژین.

## مەڕوانییەکان:

دەوڵەتی (دوستەکی)یان لە کوردستانی ناوەڕاسـت (جزیـرە و دیاربـەکر) دامەزراندووە، شاری (نارتین) بوو بە پایتەختی ئەم میرنشینە کـە لـە سـاڵی (٩٨٢)ەوە هەتا (١٠٨٦) لەئارادا بووە، دەوڵەتێکی بە هەموو مانای وشـەوە سـەربەخۆ بـوو، سـەنگی سیاسـی خـۆی لـە ناوچـەکەدا هـەبوو، پەیوەنـدی دیبلۆماسی لەگەڵ سی دەوڵەتی گەورەی ئەوساکەدا هەبوو، عەباسی، فاتیمی و بیزەنتی. خاوەنی سکە و پارەی خۆیان بوون لە مزگەوتەکانیشیاندا خوتبـەی خۆیانیان خوێندووەتەوە. تەواو سەربەخۆ بووە.

زانست دانی تەنیا بـە سـی ئـایینی جیهانیـدا نـاوە: بـوودی، مەسـیحی، ئیسلام، بەهۆی ئەوەی ئەمانە هیچ سنوورێکی نەتەوەییان نییە و لەناو گەلـێ لە میللەتانی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە.

سەر بە زەید کورشی عەلی، کوڕی زەینەل عابدین کـوڕی حوسـێن کـوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵبە.

کوردەکان ئاینیان - ئاینی زەردەشتی بـووە، (٢٠٠) سـاڵ پـێش ئیسـلام هەبوون. هاتنیان بە کوشتن و سووتاندن و داگیرکردن- دەبێت واز لەو ئاینـەی خۆیـان بهێـنن. د.مەسـعودی گـوڵزاری لــە کتێبەکەیـدا (کرماشـاهان و کوردستان) بەرگی یەکەم.

## کورد لە پەیدابوونی ئیسلامەوە:

ئیسلامەکان لە سەرەتادا نەیانتوانی ڕێگایەك بۆ گۆڕینی دینە تازەکـەیان بدۆزنەوە. لە سەرتاسەری جێگا کوردنشینەکان کوردان پاڵەوانانە بـەرەنگاری عارەب بوونەوە. دوای ئەوەی مداین لــە سـاڵی (١٦)ی کۆچـیدا بــە دەسـتی سەعد کوڕی وەقاس داگیرکرا. یەزدی گوردی سێیەم هــەڵات و خــۆی گەیانـدە زەهــاو. کوردەکــانی لــە کوردســتاندا یارمەتییــەکی زۆری یــەزدی گــوردی سێیەمیان دا. سەعد کوڕی وەقاس، هاشم بن عەتەبەی بن ئەبی وەقاس-ی بــە (١٢) هەزار کەسەوە ناردە سەر سوپای ئێران، سوپای ئێـران و یـەزدی گـورد لەو کاتەدا لە ناوچەی زەهاو بوون، عارەبەکان بە سـەرۆکایەتی قـەعقاع بـن عمر بـەرەو زەهــاو ڕۆیشـتن، پـاش شـەڕێکی خوێنـاویی و کوشـتارێکی زۆر عـارەبەکان سەرکەوتن بەسەر سوپای ساسـانیدا. یـەزدی گـورد کشـایەوە بـۆ نەهاوەند. لە ساڵی (١٨)ی کۆچی مەندی کوڕی وەقاس سێ لە شکری نـاردە جزیرە بە سەرۆکایەتی (عیاز بن غانم)- شارەکانی ناوچـەی جزیـرەی هــەموو گرت تەنها (عـین تـەمر) نـەبێت نـەیانتوانی بیگـرن. لـە کۆتاییـدا شـارە کوردنشینەکانی سنجار، ئورفە، حـەران، دەهــا، نەنسـیبین، ڕەقــە، مــاردین،

دیاربەکر بە دەستی عیاچ گیران و دوای ئەوە لەشکرێکی ناردە سەر مەڵاتییە و ئەوانیشی داگیرکرد. لە ساڵانی (١٨-٢٣) کۆچی لەشکری عارەب بە سەرۆکایەتی (عەزەرە بن قەیس) بەرەو شارەزوور ڕۆیشتن، کوردەکان پاڵەوانانە بەرەنگاریان وەستان و کوشتارێکی زۆریان لە عارەب کرد و ناچار عارەبەکان پاشەکشەیان کرد و کشانەوە.

لە ئەهوازیشدا، کوردەکان دلێرانە بەرامبەر عارەب وەستان. عومەر ناچاربوو لە شکرێکی گەورەتر بە سەرۆکایەتی (عەتەبە بن فرقد السلمی) ڕەوانەی شارەزوور (سامغان) بکات، دوای شەڕێکی گەورە و خوێنڕشتنێکی زۆر لە هەردوولا شارەزوور گیرا بە فەرمانی تایبەتی عەتەبە زۆر بێبەزەییانە لەگەڵ کوردەکاندا ڕەفتاریان دەکرد و لەسەریان دەدان.

بلازدری نووسیویەتی، (عەتەبە) لە موسڵدا بە فەرمانی عومەری خەلیفە خاکی کوردکانی داگیرکرد و قەڵاکانی تێکدان، کوردەکان دلێرانە لەپێناوی پارێزگاری خاکی خۆیاندا شەڕیان لەگەڵ عارەبدا کردووە و زۆریان لێ کوشتوون، ئەمڕۆش لە کوردستاندا لە (هەورامانی لهۆن) و هەورامانی تەخت، لە قەڵادزێ و لە چەند جێگایەکی دیکەی ناوچەی سلێمانی و هەولێر، گۆڕستان هەیە بە ناوی گۆڕستانی دۆڵی کافران و دۆڵی ئەسحابەکان، دۆڵی کافران بە گۆڕستانی کوردەکان دەڵێن. سلمە بن قیس الأشجعي، شەڕی لەگەڵ کوردەکانی ناوچەی ماسەبزان و سیمرە، لە لوڕستاندا کردووە، لەم شەڕەدا هەرچەندە زۆر لە عارەب کوژراون، بەهۆی زۆریی لەشکرەکەیانەوە عارەبەکان سەرکەوتنیان لە ساڵەکان هەژدە و بیست و سی ك.ق (جارد و عەبدی) بۆ

داگیرکردنی ناوچەی دارابگرد و نشاو ئەهواز ڕۆیشتووە. تووشی شەڕێکی گەورە بووە، دلێرانە کوردەکان، ئێرانییەکان بەرەنگاریان بوونەتەوە، پاش شەڕێکی خوێناویی و پاش ئەوەی عارەبەکان ناو دارابگردیان داگیرکرد، لە داخی ئازایەتی کوردەکان بەزەییان بە ماڵ و منداڵیان نەهاتووەتەوە. زۆر دڵڕەقانە لەگەڵیاندا جولاّونەتەوە بەکوشتن و سووتاندن. پاشان لە ساڵی (٢٥) ك.ق کوردەکان لەژێر فەرمانی عارەبەکاندا دەرچوون، خزستان و فارس بۆ ڕزگاربوونیان لەژێر دەستی عارەبدا شۆڕشیان بەرپاکردووە. لە ساڵەکانی (٢٠ و ٢٢)ی خەلافەتی عومەردا مەرزوبانی ئازربایجان دووچاری هێرشی لەشکری عارەب بوو بە سەرۆکایەتی (حذیفة بن الیمان و صغیرة بن شوعیبة)، کە هەردوو سەرکردەی سوپای عارەب بوون، شەڕێکی خوێناویی لەنێوان ئەوان و مەرزەبانی ئازربایجان لە دەوروبەری (ئەردەبیل) ڕوویدا، پاشان ڕاوێژ کرا و پێکهاتن، مەرزەبان لەپێناوی ڕزگاربوون لە کوشتن و تالاّن و سووتاندن و وێرانکردنی (ئاتەشگە)کان شارە کوردنشینەکان، ساتروان و بلاسنجان و سسبلان بۆ ئەم مەبەستە هەشتسەد هەزار درهەمیان دا بە لەشکری عارەب.

دیسان لە فەرمانڕەوای عوسمان و عەلی-دا هەر شەڕوشۆڕ بووە، لە زۆر جێگا کوردەکان دژی داگیرکەرانی عارەب شۆڕشیان کردووە. سەرکوت کراون تا فەرمانڕەوای دەوڵەتی ئەمەویە و عەباسییەکان، کوردەکان شۆڕشیان کردووە. لەپێناوی ئازادی و سەربەستیدا. بەشێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە لێدراون.

له سالّی (١٩)ك. (٦٤٠)ز هورمزانی پادشای خۆزستان داوای یارمەتی له کوردەکانی موکریان و ئازەربایەکان و هەمەدان و کرماشان کرد له شەڕێکی قورس له دزپول، له کوردی موکریان و سێ تیرەی زۆر گەورەی کورد که کوردی ڕەوەند، شول و زۆردلان بوون پێکەوه نا و زۆر پالّەوانانه شەڕیان لەگەلّ داگیرکەراندا کرد. کوردی شاهین و گیل به هاواری هورمزانەوه چوون.

مێژوونووسەکان باسی زۆر لەو هێرشەی عارەبیان نووسیووه. وەك ابن اثیر، و رجلان و تەبەری و زۆری دیکه. هۆنراوەکه به نووسینی پەهلەوی بووه. لەهجەکەشی لەهجەی هەورامییه.

له سالّی (١٦)ك ربعی بن الافكل و ابن الهرشمه لەدوای گرتن موسلّ. هێرشیان کرده سەر کوردەکان له کێوەکانی ئەو دەوروبەرەدا. هەموو قەلآی کوردەکانیان گرت و دەلّێن (ثم فتحت بقية اعمال الموصل وجميع معاقل الأكراد وسار الجميع للمسليمن)، هەموو دەوروبەری موسلّ و هەموو قەلآو بنکەی کوردەکان هەموویان بوونه مالّی موسولّمان. ناوچەکانی خاپور، هەکاری، ماردین، ئاگری گرت. هەر لەو سالّە هێرشیان برده سەر کێوەکانی کوردستانی دەورووپشت شارەزوور و کەوتنه داگیرکردنیان.

شەڕی ماسپیدان ئازین کوڕی هەرمز له کوردەکان لەشکرێکی ڕێکخستبوو، شاری ماسپیدانی کردبووه جێگای کۆبوونەوەی لەشکرەکەی. لەملاوه (ضرار بن الخطاب) به لەشکرێکی زۆرەوه چووه سەر ماسپیدان و له دەشتی ماسپیداندا شەڕ دەستی پێکرد و کوشتارێکی زۆر کرا، ئازین به دیل

گیرا. چرار دەستبەجێ سەری بڕی و لەشکر شکا، دوای ئەوە شەڕ و کوشتارە کەوتە لای سیروانەوە.

شەڕی دینەوەر و سمیرە لە ساڵی (١٧)ك ابو موساکە لە شەڕی نەهاوەندا سەرکەوتووبوو. هەر لەو ساڵەدا چووە سەر دینەوەر کە شارێکی گەورەی کوردەکان بوو، بەناچاریی پێکهاتن و دینەوەر کەوتە دەست ابوموسا و شیروان بەرێککەوتن لەگەڵ عارەبدا رێککەوت. دوای ئەوەش سمیرە لە ساڵی (٢٢)ك لە ئازربایەکان شەڕێکی قورس کرا. کوردەکان زۆریان لێ کوژرا، پاش شەڕ شوێنەکانیان داگیرکرا لەلایەن عارەبەوە.

لە ساڵی (٢٣)ك (عەزورە بن قیس) چووە سەر شارەزوور، زۆریان لێ کوشتن و زۆریشیان بە دووپشك مردن.

پاشان عەتەبە بن فرقد چووە سەر شارەزوور و گرتی. حوسێن حوزنی لە کتێبەکەیدا وای نووسیوە، لەشکری عارەبە لە باڵەك و کێوەکانی قەندیلدا، هەزار کەسیان بە دووپشك مردن، کوردێکی زۆریش لەو شەڕانەدا کوژران (دحلان الفتوحات الأسلامیة) جلد-یەك، لاپەڕەی (١٣٧)دا دەڵێت: (وقتل خلقاً کثیراً من الأکراد)، خەڵکێکی زور لە کوردەکان کوژران.

ساڵی (٢٣)ك ساریە بن ریم لەشکرێکی زۆری بردە سەر کوردەکان لە نساو دارابگە، پاش شەڕێکی خوێناویی داگیرکەران و تالآن و کوشتنێکی زۆری لێ کردن.

ساڵی (٢٣)ك ابوموسا چووە سەر ئەو کوردانەی کە لە پیرۆزەوە، نهار تیشر، ئەهواز و منازر کۆبووبوونەوە، کوشتارێکی زۆری لێکردن.

ساڵی (٢٣)ك سەلمە بن القيس الأجشعي، چووە سەر کوردەکان و کوشتارێکی زۆری لێ کردن، هەرچی بەردەست کەوت کوشتیان، دِحلان دەڵێت: (قطع النسلی کردن)، واتە منداڵیان نەهێشتن. پاش کوشتن و سووتاندن، تاڵانێکی زۆریان دەست کەوت. پاش شەڕ و کوشتار زۆربەی زۆری ئەو جێگایانەیان داگیرکرد، کەوتنە ناردنی عارەب بە ماڵ و دەست و پێوەندیانەوە، دەستیان گرت بەسەر زەوی و ئاوی ئەو جێگایانەدا، چونکە بە هیچ جۆرێك لە کوردەکان دڵنیا نەبوون، بێوچان خەڵکێکی زۆری عارەبیان بە ماڵەوە دەنارده سەر کوردستان بۆ نیشتەجێبوون، کوردەکانیش سەرەڕای کوشتن و تاڵان و بەدیلبردنی کچ و ژنیان. خۆیان کۆکردووەتەوە و شۆڕشیان کردووە، ئەم شتانە بەردەوام بوو تا هاتنی ئەمەوییەکان، عەباسییەکان. ئەمین زەکی لە کتێبەکەی خۆیدا (مێژووی کورد و کوردستان) لەم بارەیەوە دەڵێت: لە پەیدابوونی ئیسلامییەتدا و هەر لە یەکەم جارەوە کوردەکان پەیوەندییان بە ئیسلامەوە کردووە. باوەڕیان وابوو کە ئەم دینە تازەیە باشە و بە ئاسانی قبووڵیان کرد.

ئەگەر پەیوەندی ببووایە هەموو ئەو شەڕانە نەدەکرا و کوشتار و سووتاندن و بەدیلبردنی کچ ڕووی نەدەدا، لەڕاستیدا کوردەکان لەسەر ئاینی زەردەشت بوون، باوەڕیشیان بە دینەکەی خۆیان هەبوو، بەزۆر ئیسلام کراون، ئەم ڕاستییە لە نووسینەکاندا دەردەکەوێت. ئەوە شەڕی جەلەولا سەد هەزار کوژراو، شەڕی شارەزوور دوو جار قەڵادزە و کەرکوك و هەموو ناوچەی

کوردستان -که تەنها بە کوشتن و لەناوبرن و بردنی ژن و کچ و ماڵیان هەرچی بوو بردیان.

تەنانەت لە هەوراماندا پاش کوشتن و گرتن و بە دیلبردن بەزۆر ئیسلامکردن تەنها بەدەم ئیسلام بوون بە دڵ لەسەر دیانەتی زەردەشتی بوون تا ساڵی (٨٠٠)ك. لە هەموو چوار ڕیانێکدا بە سەدەها سەری مرۆڤ و قاچ و دەستت دەبینی، کە بۆ ترس وایان لە گیراوەکان کردووە.

جێگای سەرەتای ماد ئازربایجان بووە هەتا ئازربایجانی ئێستای سۆڤییەت، ئازربایجان خۆی لە وشەی مادی (ئاتروپاتین وەرگیراوە).

## مێژووی لیدیا:

دەوڵەتێك بووە لە ئاسیای بچووك کە لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پ.ز ژیاون، کیاکسار (٤٠) ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە. بە هاوکاری لەگەڵ بابل-ئاشووریان ڕووخاند.

ماد و لید شەش ساڵ شەڕیان بووە لەدواییدا ڕۆژ گیرا و شەڕ وەستا، پادشای لید (ئالیات)ی ناوبووە دوای پێکهاتن و شەڕ وەستاندن (ئاستیاگی کوردی کیاکسار) کچی ئالیاتی هێنا- ئاستیاگ (٣٥) ساڵ پادشا بووە. دوای ئەو فەرمانڕەوایەتی لەدەست ماد سەنرایەوە.

مادەکان (١٢٨) ساڵ حوکمی ئاسیایان کردووە. بە قسەی هیرودوت، هەرچەند بەپێی فەرمانڕەوایی ئەو چەند مەلیکە وا دەرناچێت، دەبێت (١٥٠) ساڵ بێت. سەڵتەنەتی سۆمەرییەکان (٢١) پادشا بوون. ئاوێستا کتێبێکی پیرۆزی ئاینی زەردەشتە، بە زمانێك لە زمانە کۆنە ڕەسەنەکانی ئێرانی و

ڕیشەی هیند و ئەوروپایی نووسراوە، زەردەشت هاوچەرخی داریوشی یەکەم بووە. ئاوێستا: دەکرێت بە چوار بەشەوە -وەکو (یسنا) و (وندیداد - ویدوداد) و (یەشت)ەکان و (ویسپرد).

زمانی ئاوێستا زمانی ماد نییە، بەڵکو زمانی ئاوێستایە، کۆمەڵە لقێکی زمانی (ئەسکیت و ئاسیای ناوەڕاست) بەیەکەوە دەبەستێت، لەلایەن زۆربەی لێکۆڵەرەوەکانی شورەوی و خۆرئاوا ئاوێستا بە زمانی ناوەڕاست دەزانن. هەندێکی دیکە لە زانایان باوەڕیان وایە -ئاوێستا زمانی مادبووە.

هۆزێك چەندە هەزاران ساڵ بەیناوبەین قسەیان بە زمانێك کردووە، گۆڕاوە، زانەکەیان و هۆزەکەش هەرماوە وەك (میر) لە سەرەتاوە قیبتی بووە بوو بە (یۆنانی پاشان بە عەرەبی) لەگەڵ ئەوەشدا کە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە لەناو نەچوون لەوڵاتی خۆیاندا دەرنەکراون بەبێ گۆڕان تا ئێستاش ماونەتەوە.

## (٢٣) سەدەی پ.ز نارام سین:

هاتووە شەڕی لەگەڵ گۆتییەکان کردووە، پاشان شکاوە. سەرکردەی گوتییەکان (ئانریدا دازیر) پێشەوای گوتییەکان توانیویەتی لەناوجەرگەی ناوچەی خواروی (بین النهرين) حوکمڕانی بکات و (نیپور) شاری پیرۆزی سۆمەرییەکان بگرێتە ژێر دەستی خۆی و نارام سین، لەم شەڕەدا لەناوچووە. بەم جۆرە (شارکالی شاری، کوڕی نارام سین) ڕۆژگاری بە قازانجی خۆی گێڕاوە. بەهەر جۆرێت زەوی و زاری تایبەتی خۆی، واتە (بين النهرين)ی پاراست.

(سارلاگاب) پێشـەوای گۆتییـەکانی گـرت، لـەدوای مردنـی (شـارکالی شاری) شەڕ و شۆڕێکی زۆر سەخت کەوتە نێوان میراتگرانـی تـاج و تـەختی ئاکادەوە، (٢٢٠٠-٢٢٠٢) لەم ساڵەدا (نارام سـین) کـوژراوە. سـیموروم بـە قسەیەکی تر (زابان)، کە ئێسـتا پێـی دەڵـێن ئـاڵتون کـۆپری، شاسـن لـە سەرەتای هەزارەهای یەکەمی پ.ز-دا لەو ناوچەیەدا بووژایەوە.

بیروڕایەکی تر دۆزراوەتەوە، دەڵێت: کۆنترین ناوی (ماد) لە زاراوەی نەژادی (مـاکت-پ) کە بە زمانی عیلامی تازەیە و لەگەڵ وشـەیەکی ئـەو زمانـەدا یان (ماتا-پ) مانای مادەکان و -ماد دەگەڕێتەوە، ئەمە شاردراوەتەوە.

ساڵی (٨٨٣-٨٨١ و ٨٨٠) پ.ز ئاشوور ناسیراپاڵی دووەم پاشای ئاشـوور لەشکرکێشی دەسـت پـێ کـرد، بـۆ سـەر ناوچـەکان و بـەردەوام بـوو. ئـەم لەشکرکێشییە (ئاشوور ناسیراپاڵی دووەم) لە دەستدرێژییەکانی تـر بـەهێزتر بوو، (٨٨٣)پ.ز لەم ساڵەدا ئەوەندە دەستدرێژیی و لەشکرکێشییان نـەکردە سەر ناوچەی زاموا، پادشای ئاشوور لەڕێگەی (کیروری)یەوە چوو بـۆ ناوچـەی زێی گەورە.

لۆلۆییـەکان مانـای ئـەم لەشکرکێشـییەیان زۆر بـاش لێـک دابـووەوە، دەیـانزانی کـە ئەمـە یەکـەمین هـەنگاوی نەخشـەی داگیرکـردن و تـاڵان و بەدیلگرتنی ئەوانە.

(٨٨١)پ.ز بۆ ئەم مەبەستە بەهەموو توانایەکەوە بۆ بەرەنگاریکردنیان و بەهێزکردنی خۆیان کەوتنە خۆ، پێشەوای هۆزی (ناسیکو) بەشی داگـار کـە بە زمانی ئەکەدی پێیان دەوت (نور-ئاداد)، بوو بە سەرکردەیان، ئەو خەڵکی

سەرانسەری وڵاتی (زاموای) لە دەوروبەری خۆی کۆکردەوە و لەشکرەکەی وەکو حەسار لێکرد، بەڵام ئاشوور ناسیراپاڵ مۆڵەتی بە نورئاداد نەدا، ئیشوکاری خۆی بەئەنجام گەیاند، بە لەشکرێکی گەورەتر لە لەشکری (نور ئاداد)ەوە مەرکەزی زاموای داگیرکرد و هێنایە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، نورئادادات ناچار بوو پەنای بردە بەر کێوەکانی (ئاشوور ناسیراپاڵ) تا کێوی نسیر کە لۆلۆییەکان (کی نی پا)ی پێ دەڵێن، چووە پێشەوە بەپێی باس و بەسەرهاتە بابلی و ئاشوورییەکان کەشتی (نوح) لەدوای تۆفان لەسەر ئەو چیایە گیرساوەتەوە (ئەم کێوە بەتایبەتی بە هی گۆتییەکانیان دەزانی).

ئاشوور ناسیراپاڵ (٣ پادشای بچووکی زاموای لەسەر ڕێگای خۆی لەتوپەت کرد) بەم جۆرە (داگار) پادشای (نورئاداد) و پادشای (موسا سنا)، کە مەرکەزی ئەو قەڵای (بووناسی) یان (بوونائیس) بوو و پادشای (کیرتیارا) کە مەرکەزی ئەو لە قەڵای (لاربوسا) بوو، هەموو مەڕوماڵاتێك کە لە کێوەکاندا شاردبوویانەوە، تاڵانی کرد. ئەو کاتە ئەمیرەکانی زاموا ملیان بۆ کەچ کرد.

ئاشوور ناسیراپاڵ ئەمجارە وازی لێهێنان و وڵاتەکەی بەست بە وڵاتی ئاشوورەوە، ئەمەش (٨٨١)پ.ز بوو. (زاموا یان مازاموا) لە بەشی ژووورووی ئەم کیشوەرەوە (ماننا)یان پێ وتووە.

دوو میرنشین خەرج و باجیان نەدا کە خرابووە سەریان، لەشکر کرایە سەریان (ئامالی) و قەڵای ئاراشتوای داگیرکرد و تاڵان و کوشتارێکی زۆری نەك تەنیا لەنێو بنەماڵەی (پادشاکانی) ئاراشتو، بەڵکو میرنشینەکانی

دەوروبەری (کیرتیارا)ش کە (بار) مەرکەزەکەیان بووە و (سابینا) مەرکەز - خودون و موساسینا کە مەرکەزی (بووناسی) بوو تا دەگاتە گردنەکانی (خاشمار) تالانی کرد، بەلام داگارا سەری دانەنەواند و بەلێنی دانێ خەرج و باجیان بداتێ.

لە شوێنەکانی تردا شوێنەواری دانیشتووانی ناوچەکەی برد. خەلکی پێگەیشتوو و ئیشکەری بەتالان برد و (منداڵەکانی لە ئاگردا سووتاند)، پاشان ئەمارەتی (ئامکا) و قەلاکەیان (زارو) گرت پاشان -پادشا (ئاتا) ناوچەکەی کەوتبووە دامێنی ژووروی کێوەکانی (نیشپو)، کە (داگارا) کەوتبووە خوارووییەوە. ئەمەشیان تارومار کرد.

قەوارەی کۆمەلایەتی سەرزەمینی یەکێتی (ماد) لە سەدەی هەشتەمی پ.ز لە قۆناغی گواستنەوەی کۆمەلگای سەرەتاییەوە بووە بۆ قۆناغی بەندایەتی، دابەشکردنی کۆمەلگا لە ڕووی سەرەتاکانی زەوییەوە دەستی پێکردبوو، کیشوەری بچووك بچووك کە هەریەکەیان سەرۆکێکی هەبوو - دروست بووبوون، بەلام لەهەمان کاتدا بەشکردنی هۆزایەتی هەر مابوو، لەشکر کۆکردنەوە لەناو هۆزەکاندا پێك دەهات.

قەلاکان شوێنی دانیشتووانی هەر جێگەیەك و لەوە دەچێت بارەگای (فەرمانبەران) بووبێت. بوونی ئەم قەلایانە نیشانەی پەیدابوونی ناکۆکی و شەڕ و بگرە و بەردەی نێوان پادشایان و دەوڵەتە وردەکان بووە. ئەم قەلایانە بۆ شەڕی ناوخۆیی بووە، نەك بۆ پشتگیری لە ئاشوورییەکان.

(٧٤٤)پ.ز -تیگلات پالاساری سێیەم- پاشای ئاشوور -پەی ماری- نامارا. پێشتر ئاشوورییەکان کە جێگاکانیان داگیر دەکرد، خەڵکێکی زۆریان سەردەبڕی و ئەوانی کەش بە ڕووتی زنجیریان دەکردن و دەیان بردن بە ئازار دەیان کوشتن. لە جێگاکانی دیکەوە خەڵکیان دەهێنا و جێنشینیان دەکردن لەو جێگا تازانەی داگیریان دەکردن، بەڵام لە سەردەمی ئەمدا بەم شێوانە دەیانکرد.

(٧٤٤)پ.ز لەشکری ئاشوور ڕوویان کردە بەشی ژوورووی ڕووباری -دیالە-و چوونە سەر خاکی (پارسوا). زامەوای خوارووی پێشوو- لەو سەرزەمینەدا گەلێك خەڵکی لێبوو ئێرانی نەبوون. ئەو ناوچانە (بیت کاپسی) بەیت سانگی، بەیت ساگی، یان بەیت کزکی، خەڵکی لە شاخەکان خۆیان شاردبووەوە، هەندێك لە قەڵاکاندا شەڕیان دەکرد. ئاشوورییەکان دێهاتەکانیان دەسووتاند و تاڵانیان دەکردن. هەروەکو کاکی -پادشای بەیت زانی سی تاکی پادشای بەیت سانگی، پادشاکانی کە توانییان لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیاندا خۆیان لە کێوەکاندا شاردبووەوە.

ئەو کۆمەڵەی گیران لەبەر ئەوەی بە سەختی بەرەنگاریی ئاشوورییەکانیان دەکرد. زۆر بە ناسۆر و ئەشکەنجە دەیانکوشتن. بەشێك لەو سەرزەمینە داگیرکراوە بوو بە خاکی ئاشوور. ناویان نا (حاکم نشینی پارسوا). بنکەیان لە قەڵای (نیکور) بوو، لە بەیت زانی کە بەشێك بوو لە حاکم نشینی تازە. ژمارەیەك لە دیلەکانی ئازاد کرد، بەڵام لەپێشدا پەنجەکانی بڕین تاکو جارێکی تر نەتوانن شەڕیان لەگەڵدا بکەن.

غالەش (تونی) فەرمان (سومور زوو) کە کەوتبووە دەراوێکی لقـەکانی خوارووی خۆرهەڵاتی دیالەوە، کوشتنی لەشکرەکەی و داگیرکردن (سـومونزو) و بەیت همبان، کە ئەوانیش هەر لە دەراوی دیالەدا بوون، خستە سـەر وڵاتـی ئاشوور.

پارسواو بەیت همبـان دوو ویلایـەت بـوون لـە (٧٤٤) پ.ز داگیرکـران و خرانە سەر ئاشوور، تا دوا حـوکمڕانی ئاشـوورییەکان بەشـێك بـوون لەسـەر ئاشوور.

(٧٣٨)پ.ز تگلات پالاسار، پاشـای ئاشـوور لـە ڕووداوی سـاڵی (٧٣٨) پ.ز نووسیویەتی کە ژمارەیەك لە گۆتییە دیلکراوەکان و دانیشتووانی بـەیت سان گی بوتی)، بەیت سانگی لە ژووررووی وڵاتی سـوریا و فینیقیـەی ژوورروو نیشتەجێ بوون، لەو کاتەدا ناوی هۆزەکان بەناوی ئاواییەکانەوە بووە، خەڵکی وڵاتی پارسوا بەپێی دۆخی ڕۆژگار بەرەبـەرە هـەموویان بـوون بـە ئاشـووری. تەنانەت دوای ئەوە چەند ماوەیەك بە وتەی بطلیموس، ئەو سەرزەمینە پێیـان دەوت (سوری مـادی). یۆنانییـەکان زۆربـەیان ئاشـوورییەکانیان بـە سـوری ناودەبرد.

(تیگلات پالاسار) پـاش داگیرکردنـی تـاران و هەمـەدان و هـەموو ئـەو ناوچانە -پاشان لەڕێگای ناوچەی بەیت زوو، ئـالزاش و بـەیت مـاتی، دەراوی ڕووباری دیالە وەرگەڕانەوە بۆ خاکی خۆیان.

## ماد- مادای:

بەمانای وشە، ئێرانی نەژاد. (٦٧٤)پ.ز ئەسکیتییەکان بەر لە ساڵی (٦٧٤)پ.ز، لە مادی مەرکەزیدا پەیدا بوون، پشتگیرییان لە مادەکان کرد کە وەستابوون بەرامبەر ئاشوورییەکان، بەتایبەتی مانناییەکان کە لەگەڵ ئەسکشەکاندا، هاوکار بوون، چەند سەرچاوەیەك دەڵێن عیلامییەکان ئامادە بوون یارمەتی ڕاپەڕینەکان بدەن. لە بەر ئەمە هەموو هۆزەکان بوونە بەرەیەکی یەکگرتوو و بەڕووی دەسەڵاتی ئاشوورییەکاندا ڕاوەستان.

لە ساڵی (٦٧٣)پ.ز مادەکان لەم ساڵەدا ڕاپەڕین بەرامبەر بە ئاشوورییەکان. سێ پێشەوای سێ جێگا بوون و یەك لە مادەکان کەوتنە گرتنی قەڵاکان کە بەدەست ئاشوورەییەکانەوە بوو.

لە ساڵی (٦٧٣) پ.ز لە سەرەتای ئایار، ناوەڕاستی ئاوریل، لەم ساڵەدا، ئەم سەر زەمینە فراوانە هەمووی یاخی بوو، خەڵکی سەرانسەری مادی مەرکەزی بەرپابوون و شۆڕشگێڕەکان دەستیان کرد بە پەلاماردان و هەڕەشەیان لە قەڵاکانی ئاشوور دەکرد و پەلاماریان دەدان.

لە سەرەتای مارسی (٦٧٢)پ.ز ناچار ئاشوورییەکان چەند نومایندەیەکیان نارد بۆ لای پێشەوای شۆڕشگێڕەکان، ئاشوورییەکان زۆر هەوڵیان دەدا دووبەرەکی بخەنە ناو یەکگرتووەکانەوە. بەو مەبەستە بەجیا جیا قسەیان لەگەڵدا دەکردن.

لە ساڵی (٦٧٣)پ.ز کێ سەرکردایەتی دەکردن، سێ کەس بوون، کشتریش و مامی تیا شور و دوساتی براشك. لەو باوەڕەدایین مامی تیاشور

ڕابەری ڕاپەڕینەکە بوو -مامی تیاشور و دیوك کە لە نووسینەکانی هیردووت باسکراوە بە یەك کەسی دادەنێن.

لە کۆتایی ساڵی (٦٥٢ و ٦٥٣)پ.ز ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور دووچاری مەترسیترین گێژاوی سیاسی خۆی بوو، هۆکەشی ڕاپەڕینی (شاماش موکین) برای ئاشوور پاناپاڵ کە لەلایەن ئاشوورەوە کرابوو بە پادشای بابل.

میسر: لە ئاشوور جیابووبووەوە. براکەی ئەم بەرێگایانەی لێ هەڵگیرابووەوە. خاکی ئالباد، کلدانی، ئارامی، خەڵکی کەناری دەریا لە ئاکابا-تاکوباب-سامێ-دەشتو پەیوەندی لە ئومانیگا شاری ڕاکردوو حوکمی عیلامی دەکرد. هەروەها پادشایانی گوتیوم و ئامور و ملوخا ئەمانە هەموو شاماش موکین هانیدابوون. بەم گوێرەیە ئاشوور پاناپاڵ دەستە و دائیرەی شاماش موکین دەکات بە سێ بەشەوە:

١- دەست و پێوەندەکانی ئاشوور، واتە بابلی و کلدانی و ئارامی دانیشتووانی دەرەوە، یان کەناری (بابل).

٢- عیلام کە هاوپەیمانێکی بەهێزی شاماش موکین بوو.

٣- پادشایانی گوتیوم و ئامورملۆخا، ئەم وشەیە بە زمانی ئاشووری بەمانای (پەنای گەورە) دەگرێتەوە، بە مانای (بەشەکانی جیهان) بووە.

ملوخا: واتە ئەفریقا. ئامرو واتە سوریە و فینیقیە و فەلەستین.

گۆتیۆم گۆتییەکان، مادەکان لەم سەردەمەدا (٢٢) ساڵ بوو کە کشتریتی= خشتریتا- یان بە وتەی هیرودوت (فرائورت) حوکمی کردووە، فرائورت دەستی کرد بە داگیرکردن هۆز بەدوای هۆزدا لە ئاسیادا و دەیهێنانە

ژێر ڕکێفی خۆیەوە. چووە سەر ئاشوور و لـە شـەڕێکدا کـوژرا و زۆریـش لـە لەشکرەکەی تیاچوو.

(٦٧٣)پ.ز سـەرەتای حـوکمی (فرائـورت) بـووە، ئـەم شـەڕەش ناسکیتییەکان، یارمەتی ئاشوورییەکانیان دا، پاش لەناوچوونی (گشـتریتی) یان فرائورت کوڕەکەی هاتە سەر حوکم (کیاکسار) بوو درێـژەی بـە شـەڕ دا دژی ئاشوورییەکان و ئاسـکیتییەکان یارمـەتییان دان، کـە ئاسـکیتییەکان (٢٨) ساڵ بـوو حکمڕانییـان دەکـرد بـەهۆی یارمەتیـدانی (مادیـا) کـوڕی (پروتـوتی) پادشـای ئەسـکیتییەکان یارمـەتی کیاکسـاری دا. (٦٢٥)پ.ز پـەلاماردانی ئاسـکیتییەکان بـۆ سـەر خـاکی (مـاد) و سـەقامگیربوونی دەستەڵاتیان لەم ساڵەدا بووە.

لە ساڵی (٥٨٥)پ.ز کیاکسار کۆچی دوایـی کـرد. بـە وتـەی هـیرودوت (٤٠) ساڵ حوکمی کردووە. لەدوای (٢٨) سـاڵ حـوکمی کیاکسـار مادەکـان میوانداریی سەرکردەکانی ئەسـکیتییەکانیان کـرد، هـەموویان کوشـتن. لـە ساڵی (٦٤٨)پ.ز ئاشـوور پاناپـاڵ تـوانی شـاماش مـوکینی و بابـل داگـیر بکاتەوە کە برای بوو و (کاندالانو) کرا بە حوکمڕانی بابل.

لە ساڵی (٦٣٢)پ.ز ئاشوور پاناپاڵ لە دنیا دەرچوو و (شین شاریش کون) مەشهور بە (ساراك) دوای پادشای ئاشوور لەسەر تەخت دانیشت.

ناپوپاك سـار: نـابو ئاپـا لوسـور لەلایـەن سـاراکەوە بـۆ قەڵاچـۆکردنی دوژمـنانی ئاشوور لە بابل دانرابوو.

نابو پولاسەر لەگەڵ کیاکساردا دۆستایەتی بەستبوو (پەیمانێکی) بەست و (ئامێتی تیدا)ی کچی کیاکساری خواست بۆ کوڕەکەی (نابوخودنووسەر).

لە مانگی ئابی ساڵی (٦١٢)پ.ز بەداخەوە ڕۆژەکە مەعلوم نییە شەڕ لە شەقامەکانی شاری نەینەوا گەرم بوو-حەساری شارەکە بەهۆی لافاوی ئاوەوە کە بەدەست دروستیان کردبوو، لافاوەکە هەندێکی لە حەسارەکە ڕووخاند کە لە خشتی کاڵ دروستکرابوو، هەر لەو ڕۆژەدا کە دوژمنان چوونە ناو شاری نەینەوا، (سین ئاریشکون) ساراك پادشای ئاشوور خۆی فڕێدایە ناو ئاگری کۆشکەکەیەوە و خۆی سووتاند.

شار گیرا و تالان کرا و ژمارەکی زۆر کوژران، ژنی دەوڵەمەندەکان کە بەدیل بران، داوێنیان دڕاندن، چونکە پێشتر ئاشوورییەکان وایان لە ژنە دیلەکان دەکرد.

لە (٢٠)ی ئەیلوولی سەرەتای سێپتامبری ساڵی (٦١٢) پ.ز کیاکسار گەڕایەوە بۆ ماد و نابو پولاسەر لە کەلاوەکانی نەینەوادا مایەوە.

هێشتا شەڕ کۆتایی پێ نەهاتبوو، هەندێك لە لەشکری ئاشوور بە سەرکردایەتی (شاروو باڵیت) برا بچووکی ئاشوور پاناپاڵ مامی ساراك، توانی لە کاتێکدا کە پەلاماری نەینەوا درا، لەو شارە بچێتە دەرەوە، ئاشوور باڵێت لە شاری (هران) کە لەو سەردەمەدا گەورەترین شاری ژوورووی (بین النهرین) بووە، خۆی شاردەوە، ئەم خورمشاری لە پاشایانی ئاشوور وەرگرتبووەوە، لەبەر ئەمە لایەنگری ئاشوور بوون.

(ئاشوور و باڵیت) لە سەردەمی ژیانی ئاشوور پاناپاڵ بووبووە کاهن (خوای سین) حەرانی بۆ خوایەك کە لە سوریا و (بین النهرین) زۆر ڕێزیان لێ دەگرت، بەم هۆیەوە دۆستایەتییەکی زۆر بەتینی لەگەڵ ئەو شارەدا هەبوو، لە پاییزی ساڵی (٦١٢)پ.ز لە حەران چووە سەر تەخت، پادشای ئاشوور پاشماوەی لەشکری ئاشوور ئەملاولا خۆیان گەیاندە ئەو کۆبوونەوەیە. پەیوەندییان بەست بە فیرعەونی میسرەوە بۆ (نخو)ی دووەم.

لە مانگی ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەری ساڵی (٦١٠)پ.ز مادەکان و بابلییەکان یەکیان گرت و پەلاماری (حرانی) دا و ئاشووربالیت و سوپای میسر کە پشتیوانیان بوون، بە نزیکبوونەوەیان چۆڵیان کرد (حران) بەئاسانی گیرا. تالان بە دوو جۆر بووە، لایەك تالانی و دیلەکانی بەردەکەوت، ئەوی تریان، شارەکە و حەسار و سەرزەمینەکە.

بەهاری ساڵی (٦٠٩) شەڕوشۆڕ بەبێ پچڕان هەر بەردەوام بووە، لەشکری ئاشووربالیت بە هاوبەشی سوپای (فیرعەون) پەلاماری (حران)یان دا و شەڕ دەستی پێ کرد، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون.

لە ساڵی (٥٨٥) پ.ز، لە کاتی شەڕکردن لەبەرینی ماد و لیدییەکان ڕۆژ گیرا، هەردوو لا ڕێککەوتن کە ئەم ڕووداوە ئیشی خواکانی سەرەوەیە و ڕازی نین بەم شەڕە و سوڵح کرا و ئاشت بوونەوە. ناوبژی ئەم شەڕەش بابل و کیلیکییە بوو. پەیمانی ئاشتبوونەوەیان بەست، سنوور بەدرێژایی ڕووباری - گالیس، قزل ئیرماکی، ئێستا دیاری کرا. ئەم پەیمانە بەوەی ئاستیاگ کورشی

کیـاکی و (ئاریانیـای) کچـی (ئایـاتی) خواسـت و مەحکـەم بـوو هـەموو ناکۆکییەکان لەبیر چوونەوە.

هەمان ساڵ کیساکسار کۆچی دوایی کرد. ئاهورا- مانـای (چـاك) مـزدا خیرمەند- هۆشمەند. ئاهورامەزدا- چاك و هۆشمەند.

لە نووسراوی ئاشوورییەکاندا بەگ بەمانای خوایە. زەردەشت: هەندێك لـە لێکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان کە لە ناوەڕاستی (سـەدەی پێنجـەم)ی پ.ز-ەوە ژیاوە. هەندێکی دیکە دەڵێن لە سەدەی چوارەمی پ.ز ژیاوە.

موغ لە ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتدا بە مانای (ئاگرپەرست).

ئاوێستا: ئەو خەتە کۆنەی ئاوێستای پێ نووسراوە (واتە خـەتی ئـارامی) کە زمانە ئێرانییەکان پێیان نووسیوە. لە سەردەمی داریوشـی یەکـەم، واتـە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایین پەیدا بووە.

دیو: بە زمانی هیندی و ئەورووپی بـە (خـوا)یـان دەوت، لـە فەرهـەنگی زەردەشتدا بە خوای درۆ (ئیبلیس) و دێویان دەوت.

## ئامۆژگاری زەرادەشت:

جیهان مەیدانی بەربەرەکانی دوو هێزی هاوتای وەکـو یـەکن، یەکـەمیان چاکە، کە ئاهورامەزدا ڕابەری دەکات و هێناویەتە کایەوە. خـوا یـان گیـانی ئازا، ئەوی تریان خراپەیە کە ڕۆحی پـیس (ئـانگهی و- ئینـو) بیرکردنـەوەی پیس ڕابەری دەکات.

گیـان پـیس هەمیشـە لەگـەڵ گیـانی پاکـدا لـە بەربەرەکانێدایـە. زەردەشـتەکان، ڕقەبـەری ئـەو هۆزانـەیان دەکـرد کـە ئـاری نـەبوون، ئەمـە ئامۆژگاری زەردەشتە.

هنینگ سێ مێژوو بۆ سەردەمی ژیانی زەردەشـت بـاس دەکـات. (٥٥٣-٦٣٠-٥٥١)پ.ز.

(٦٢٨-٥٤١-٦١٨)پ.ز.

ئەم سێ مێژووە بەو پێیە کە (٢٥٨) ساڵ بەر لە ئەسکەندەری مەکدۆنی، دەڵێت زەردەشـت بـووە. مردووەکانیـان بـەدارە مەیتەکانـەوە دادەنـا باڵنـدەی گۆشتخۆر و سەگ گۆشتەکەیان دەخـوارد و پاشـان ئێسـکەکانیان دەخسـتنە گۆڕەوە.

**سکوند:** گردێکە لە خوارووی کرمانشاوەیە، دارەمەیتیان لەسەر داناوە لە زەمانی زەردەشتەکاندا. لە ساڵی (٥٥٣-٥٥٠)پ.ز. شەڕ لەنێوان ماد و پارس هەبووە، ئەوەی هەیە سێ ساڵ لەلایەکی دیکەشەوە گوایە دوو ساڵ شەڕ بـووە لە ئەنجامدا ئاستیاگ شکاوە و کورش سەرکەوتوو بووە.

لە (٥٥١) پ.ز حکومەتی ماد تـەواو بـووە و نـەماوە. ئەمـەش بـەهۆی خیانەتی سەرکردەی لەشکری مادەوە کە ناوی (هارپاك) بوو. پادشاکانی مـاد خوشکی خۆیانیان مارە کردووە، چیژان تخمە: شۆڕشی کـرد و خـۆی کـرد بـە پادشا و وتی من لە خانەدانی (کیاکسارم) و لـە مادەکـان بـوو، لـە شـەڕی داریوش پارس و ماد بە سەرکردەی (تهمـا سـپادان) مـادی بەهەڵپـە چـیژان تخمەیان لە (ئەربیل) سەرزەمینی پێشووی ئاشـوور، نایـەوە نیشـانەی نێـرەوە

کوشتیان. ئاژاوە بگرە بەمە کۆتایی پێ نەهات ئەمەش لە ساڵی (٥٢١)پ.ز بووە.

ئەسکەندەر ئاسیای بچووکی داگیرکردووە، لەشکرەکەی داریو-ی لە ئیسوس ڕاوناوە. سوریا و فینقییە و فەلەستین و میسری هێنایە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، داریوشی سێیەم لەشکرێکی گەورەی کۆکردەوە بە هیوای بەر لە لەشکری ئەسکەندەر بگرێت و نەچن بۆ ناو چاڵمانی خۆرهەڵاتی کیشوەرەکەی پێش ئەوەی (داریوش) لە دیجلە بپەڕێتەوە، ئەسکەندەر لە فورات و دیجلە تێپەڕی.

یەکەیم ڕۆژی ئۆکتۆبەری ساڵی (٣٣١)پ.ز لە خۆرهەڵاتی دیجلە لە نزیک شاری پێشووی ئاشووری (ئاربل) لە کەنار ئاوی (گائوگامل) شەڕ لەنێوان ئەو دوو سوپایەدا دەستی پێ کرد. لەو شەڕەدا داریوشی سێیەم شکا پادشا ڕایکرد و چووە ئەکباتان، هەوڵیدا لەشکرێکی گەورە کۆ بکاتەوە، گەلێك لە ستراپ نشینەکان لەژێر فەرمانی ئەودا چووبوونە دەرەوە.

## ئەسکەندەر:

بەرەو خوار کشاو -بابل و عیلام و پارسی (پرسید)ی داگیرکرد، لەوێوە لە ڕێگای پارتاکناوە پەلاماری مادی دا، داریوش زانی ئەو یارمەتییەی کە لەلایەن (کادوسی و ئەسکیتە)کانەوە چاوەڕوانییەتی پێی ناگات، لە ئەکباتان دەرچوو بەرەو خۆرهەڵات ڕایکرد، لە ناوەندی ڕێگای سبس (sps) ساترابی باکتریا ئەوی لە پادشایی خست و کەمێك دوای ئەوە داریوش کوژرا لە (٣٣٠)پ.ز دا.

ئەسکەندەر لە ئێرانەوە خۆی لە ڕێگایەکەوە لە پارت کوتای، چوو بەشوێن داریوشدا و لە (رەغە=ری) پیاوێك ناوی (وکسودات) بوو داریوشی خستبووە ناو چاڵەوە. کوشتبووی لەبەر ئەوەی باوەڕپێکراوی ئەسکەندەر ناو دەبرا کردی بە ساترابی ماد.

### ئەردەشێری یەکەم:

دامەزرێنەری زنجیرەی ساسانییەکانە. ئەسکەندەر: بارسینای کچی داریوشی سێیەم و کوردمان و پاریساتیدا. کچی ئەردەشێری سێیەمی هێناوە (واتە سێ ژنی هێناوە). لیدی-کشوەرێك بووە کەوتبووە خۆرئاوای ئاسیای بچووکەوە، پایتەختەکتەیان (سارد) بووە.

### بەوتوی کورتسیا:

داریوشی سێیەم لە (گائوگامل) (٢٠٠) دووسەد هەزار پیاو و چلوپێنج هەزار سوارەی لەگەڵ بووە، کە شەڕی لەگەڵ ئەسکەندەر کردووە.

### کادۆسییەکان:

بەشێك لە کاسییەکان بوون. بە وتەی والری فلاك لەبارەی پاشای سەگ پەرستییەوە ڕەنگبێ ئەم سەگ پەرستییە تەنیا لەناو ڕاوچییەکان و ئاژەڵدارەکاندا باو بوبێت.

له سەدەی (٢٨)پ.ز لەوحەیەك له زەهاو دۆزراوەتەوە عائد بە (ئەننو= بانینی) قەراڵی (لۆلۆ و گۆتی) نووسراوە دەڵێت ناوچەی (هالمان کە وڵاتی حەڵوانی دەوروبەری ناوچەی زەهاوی ئێستایە، بەدەست لۆلۆوە بووە.

له سەدەی (٤٧) پ.ز لەوحەی دەربەندی گەورە لە قەرەداغ لەلایەن (میجر ئەدمونس)ەوە خوێندراوەتەوە، نارام سین لەدوای سەرغون هاتووە لە سەدەی (٢٨)پ.ز ساتۆنی- قەراڵی لۆلۆ هاوسەدەی نارام سین بووە، ڕەنگە لەشکری ئاکاد ئەم قەڕاڵەیان شکاندبێت. ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیدا دەڵێت (٤٧) سەدەی پێش زاینی ناوبردووە، خۆی (٢٢١٠) پ.ز-ە (نووسەر مەلا عەلی).

## میتانی:

بە قۆڵێك له کاسای دادەنرێت و ئارین، بەشێوەیەکی کە گوایە (سوبارو - سوبارتو) لەفراتی ناوەڕاستدا نێوان موسڵ و ترابلس بوون لە (١٦) سەدەی پ.ز. حکومەتێکی بەهێیان دروست کردووە، بەیەکێك لە حکومەتە گەورەکانی دانراوە، میتانی، یا تیغەش (واششوغانی) نامەیەکی میتاغی دۆزراوەتەوە (٦٠٠) دێڕ بووە، زمانی ئەو کاتە -ئاکادی بووە، مستشرق (IBORK) دەڵێت: زمانی ئەو کاغەزە زمانی (قەوقازی) بووە. پ.ز.

وڵاتی میتانی بە ناونیشانی (سوباری)ش بەناوبانگ بووە، لە ناوچەی کەرکوکدا چەند هەزار بەڵگەنامە دەرهەق بە (سوبار)ی و میتانی

دۆزراوەتەوە لە (بوغازکوی)ش گەلێ ئاساریان دۆزراوەتەوە، لەلایەکی دیکە دەڵێن ناوی ولاتەکەیان (هانی گالبات) بووە.

لە دەوری (دەستەلاتی ئاشوور ناسیرپالی سێیەمدا ئەم ولاتە زەوت کراو لەناوچوو. خەڵکی میسر بەم (میتانیا)نەیان وتووە (ناهارە) و لە تەوراتیشدا بە ئارام -ئاهرام ناوبراون، دوورنییە ناوی (نایری) لەم (ناهاری)وە هاتبێت، سوباری لە سنووری باکووری خۆرئاوای عیلام تا شاخی (ئامانووس) چووە.

بەشی خۆرئاوای (دیجلە) سوباری بە ناوی (هوریە)وە ناسراوە، ناوی سوباری بە پەلەدن بووە، نایری جێگای سوباری گرتەوە، شەڕی زریان بووە لەگەڵ ئاشووردا لە (٩١٠)پ.ز.

## مستشرق- مێجەرسۆن:

ولاتی نایری هەر بەشی لای زۆرتری زێی گەورە نەبووە، بەڵکو لە ولاتانی (دیاربەکر)و خەرپوت و دەرسیم و شاخانی بەتلیس و تورس نایریان پێ وتوون. ولاتی نایری لە دواییدا بووە بە کورد و ئەن، کە بە تەواوی (کوریەن) یا (کوردا).

## مەد:

لە زەمانی حکومەتی (فرائورتس) هەڵیکوتایە سەر ئاشوور و سەرکەوتوو نەبوو، لە ساڵی (٦٣٤-٧٠١)پ.ز حکومەتی میدیا دامەزراوە. (٦٢٢)ز قەیسەری ڕۆم (هەرقل- هراقلیوس) ڕووی کردە ئەرمنیا و کوردستان، لەشکری ئێرانی شکاند و تالانی کرد، ساڵی دوایش لە کوردستاندا لەشکری ئێرانی پارچە پارچە کرد و لە ساڵی (٥٢٧)ز. لە نزیک نەینەوا لە بەینی

هەرقل بە لەشکرێکەوە بەسەر شارەزووردا تێپەڕی چی شار و دێهات هەبوو سووتاندی، ئەمەش لە مانگی شوباتی ساڵی (٦٢٨)ز پاشان ڕووی کردە ئەردەڵان.

ناوی ئێران لە (اریا یان ایریا)وە هاتووە، بەواتای باش یان بەوەفا. هەشت شعبە و بەش، دابەش بووە لەمانە، شعبەی اریان یان هیندوئێرانییە، کە ئەمەش بووەتە سێ بەشەوە، بەشێکی بەرەو هیند ڕۆیشتوون، بەشێکی بۆ سەر خاکی ئێران و ناسراون بە ایران، بەشێکی دیکەیان لە ئاسیای ناوەڕاست دانیشتوو بوون کە پێیان وتوون (ایرانی کۆن).

ناویان بە سکای بەناوبانگ بووە، پێیان وتوون اسکیت، ئەو هەشت شعبەیەش ئەمانەن:

١- شعبەی ئاریانی یان هیندو ایرانی.

٢- شعبەی یونانی و مەکدۆنی.

٣- شعبەی ئەرمەنی.

٤- شعبەی ئەلبانی کە لە شبهی جزیرەی بەلقان بوون.

٥- شعبەی ئیتاڵی.

٦- شعبەی سلتی.

٧- شعبەی المانیا = انگلوساکون.

٨- شعبەی لیێوان و سلاوی و سلاوی خۆرئاواو، خۆرهەلات و باشووری ئەورووپایە.

بەشی ئێران لە قەومی ئاری بوونەتە چەند بەشێك، یان عەشیرەت، وەك: ماد، پارس، پارتی، باختر، سەغدی، ئارانی، ئالانی.

ئەمانە هەموو خزمی یەکن و لەیەك ڕەگەزن، کە ئارین. بەشی هیندۆئێرانی لە بەشی هیندۆئەورووپایە، ئەمانەش گوایە پێش دوو هەزار ساڵ پ.ز هاتوونەتە ئێران، هەندێك لە مێژووناسانی بە زیاتری دادەنێن، ئەمانە هەموو بە یەك جار کۆچیان نەکردووە، بەجیاجیا هاتوون و نێوانیشیان زۆر بووە.

## ئارای، پێش ئێران لە کوێ بوون و لەکوێوە هاتوونەتە ئێران

لە کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان دەڵێت: جێگای ئەسڵی ئارییەکان (ئیران لیج)ی ناوبووە، ئەم جێگایە لە سەرەتاوە ئاووهەوای خۆش بووە، پاشان هەوای گۆڕاوە و لە سالیکا دە مانگی زستان بووە. ناچار ئارییەکان کۆچیان کردووە لەبەر ساردی. لە ئاوێستادا ناوی (١٦) ویلایەت هاتووە، لەوانە ئێران واج و پەنجابی هیندی لە پەیکەری داریوش لە شاخی بێستوون ناوی هەر (١٦) ویلایەتەکە نووسراوە.

هەندێ باوەڕیان وایە کە ئاری ئێرانی و هیندی ماوەیەك لە سەغد و باختەر بوون و پاشان هندی لەلای هندوکوش لە دۆڵی پەنجابەوە سەرەوخوار بوونەتەوە.

ئارای-ئێرانی: لە دەوڵەتی ئەفغانستان، بۆ سیستان و خوراسان (گرگان) تا دەوری ئەلبرز ڕەی لەو ناوەدا بوون.

ئاری-سکای: لە ئاسیای ناوەڕاستدا بوون و بە کۆچەرییەوە خەریك بـوون، ژیانیان لەسەر کۆچەری بووە، پاشان بەرەو خوار هاتوون و لەگەڵ ئەو ئاریانەی کە لە ڕەگەزی خۆیان بوون، لەو جێگایانەی تیابوون بەشەڕ هاتوون و داگیریان کردووە و لەگەڵ عیلامییەکانیشدا بەشەڕ هاتوون.

لە بەشی خۆرئاوای ئێران خەڵکێکی دیکە هەبوون ناویان کاسو بووە.

## عیلام:

لە تەوراتدا ناوی هاتووە، مێژووی دەگەڕێتەوە بـۆ (٣) هـەزار سـاڵ پ.ز، دەوڵەتێکی زۆر گەورە بووە. کۆن پێیان وتووە عـیلام، ئـەو جێگایانـە عـیلام بوون: خوزستان، لوڕستان، پشت گوە، کێوەکـانی بـەختیاری. هەنـدێ دەڵـێن سنووری ئەم وڵاتە بەم شێوەیە بووە:

خۆرئاوای دیجلە، لە بەشی خۆرهەڵات بەشێك لە فارس، بەشی خۆرهـەڵات بەشێك لە فارس، بەشی باکووری ڕێگەی بابل بۆ هەمەدان، بەشـی خـواروی خلیجی فارسی تا بەندەر بوشهر.

شارە بەناوبانگەکانی:

١- ماداکتو (Madaktoo).

٢- خاید الو (Khaed Aloo)، دادەنرێـت کـە لـە جێگـای ئێسـتای خوڕەم ئابادی ئەمڕۆ بووبێت.

٣- شوش (Shosh)، کە بەناوبانگترین شار بووە.

٤- ئەهواز (Ahwaz): جەرەی هوز یان خوزە. پێشتر پێیان وتووە بازاڕی ئەهواز. دانیشتووانی شوش وڵاتەکەی خیان ناوبردوو بە انتران سوسونکا بەواتای انزان = شوڕش.

وشەی عیلام بە واتای کیسو یان کێوەکان، چونکە بەشێك لە خاکی عیلام لەناو کێوەکاندا بووە، لە زەمانی فەرمانڕەوای داریوشدا پێیان وتووە هودج، یان خورج، ئێستا پێی دەوترێت خوزستان، بەواتای وڵاتی خوزەکان، یان هۆزەکان.

زمانی عیلامی زمانی (انزانی) بووە، نووسینی مێخی تایبەتیان هەبووە.

**ئەکەد:**

دوای لەناوچوونی سۆمەر، حکومەتی ئەکەد دروست بووە، هەر لە زنجیرەی ئەوانن، دامەزرێنەری ئەم حکومەتە مانیشتو (Manishto) بووە، کە زنجیرەی کیشی دروستکردووە. لەگەڵ عیلامییەکاندا بەشەڕ هاتووە، سارگۆن وڵاتەکەی فراوان کردووە.

لە خۆرئاوا تا شام[1] و بەشی خوارووی خلیجی فارسی و باکوور تا کێوەکانی زاگرۆس یان کرماشان، ئەمرۆی گرتووە، یەکەم پاشایە کە ڕێگاوبانی دروستکردووە لەنێوان ئەم وڵات و شارانەدا بۆ بەستنیان بەیەکەوە.

---

١- ئەکەد: دوای لەناوچوونی سۆمەر حکومەتی ئەکەد دروست بوو، هەر لە زنجیرەی ئەوانن. ئەکەد و سۆمەر دوو لا بوون، سۆمەر ئارین ڕیشیان نەبووە، ئەکەد سامین ڕیشیان هەبووە، دوو بەرن بەهیچ جۆرێك یەك نین. نووسەر.

بایەخی بە مێژوو داوە، هەرچی هەبووە لـە قـانوون و مـەزهـەب و سـحر، هەمووی تەرجەمە کردووە لە پەرستگای (ارخ) دایناوە، دوای سەرگۆن، نـارام سین (NaramSin) شەڕی لەگەڵ قەومی لولو کـردووە، (ئەسـتیل)ێکـی نووسیووە. ئەستیل: بەو بەردە دەڵێن یەك پارچە پیتیان لە شاخدا بێت، شـتی لـێ نووسرابێت، مجەسەم بێت یان بەجیا.

پادشایەکی دیکەی ئەکەدی (انوبانی نی) لە زەهاو شەڕی کردووە و شـتی نووسـیوە. ئانوبـانینی، سـامی نییـە و ئەکـەدیش نییـە. ئـەم ئارییـە و لـە لۆلۆبییەکانە لە سەرپێڵی زەهاو شتی نووسیوە.

زنجیرەی سامی: خەڵکێك لە نـەژادی سـام لـە گـوتی خۆرهـەڵاتی زەهـاو دەوڵەتیان هەبووە، هێرشیان بردووەتە سەر (ئەکـەد)، ئەمانـە ناویـان گـوتی بووە، ئەکەد و باکووری خواروی هەموو بابلیان گرتووە. (١٢ یان ١٢٥) ساڵ فەرمانڕەوا بوون.

هاتنی ئاری بـۆ ئێـران مـەعلوم نییـە، پەیـدابوونی زەردەشـت و ئـاینی زەردەشت دوولایەنێکی زۆر هەیە لەنێوان مێژووناسەکانی ئەورووپاییدا، بۆ ئەم مەبەستە هەندێك زەمانی زەردەشت دەڵێن (١٦٠٠) سـاڵ پ.ز، بـەڵکو لـەوە پێشتریش دادەنێن. هەندێکی دیکە تا سەرەتای دەورەی هنمامێش و خوارتر.

هەنـدێکی دیکـە دەڵـێن پـێش سـەدەی (٧) پ.ز بـووە، نـاتوانین بڵـێین مەزهەبی ئاری چی بووە پـێش زەردەشـت، بەڵگـەش بـۆ ئـەوە پـێش سـەدەی (٨)پ.ز مهر (Mohr) خوای گشت خۆر لـە مەیدانـدا بـووە بـۆ پەرسـتن، هەندێك باوەڕیان وایە هورمزرد پەرسـتی لـەو سـەردەمەدا چـووەتە جێگـای

ئەوەی پێشوو. دەڵێن زەردەشت مەزهەبی کۆنی ڕاستکردووەتەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پ.ز-دا، وەك پەرستنی (با) هەوا، ئاو، ئاگر... هتد، دایان ناوە کە خۆر چاوی ئاسمان بووە و برووسکە کوڕی ئاسمانە، باوەڕ و مەزهەبی ئاری وەك سۆمەر و بابل و ئاشوور نەبووە.

ئاری ئەم سێ شتەی بەسیفاتی باس دانـاوە: ویـژدان بـاش، قسـەی بـاش، کردەوەی باش.

ئارییەکان کاتی هاتنیان بۆ ئێران بوونەتە چەند بەشێکەوە، هەر بەشە مەملەکەتێکیان بەڕێوە بردووە. وەك تیرە، تایفە، بەم شێوەیە ژیاون و هەرکاتێك مەترسی لەلایەکی دیکەی جیا لە ڕەگەزی ئاری ڕووی تێکردوون، یەکیان گرتووە لەمانە سێ تیرەیان زۆر بەهێز بوون:

ماد، فارس، پارتی، قسەیان لە یەکەوە نزیك بووە و دروستکردنی خانەوادە و تیرە و بەرەوژوور بەم شێوەیە بووە:

لە ئاوێستادا وا هاتووە، بەشی خۆرهەڵاتی باکووری ئێران بە چەند بەشێك دابەش بوون، لە خانەوادەوە دەست پێ دەکات، کە پێیان وتووە نافە (Nafa)، چەند نافەیەك تیرەیەکی لێ دروست بووە کە پێیان وتووە تۆما (Touma)، چەند تیرەیەك کە خزمایەتییان لەنێو یەکدا هەبووە عەشیرەتێکیان لێ دروست بووە، پێیان وتووە زن تو (zn too). قەوم لە چەند عەشیرەتێك پێکهاتووە پێیان وتووە ڕەیو (Rayou)، مەرکەزی خانەوادە پێان وتووە نما (Nma)، مەرکەزی تیرە تیرە= وەیس (Waiss).

به داته= دیو، جێگای عەشیرە گۆ (Geoo) بەواتای ڕەئیس تیرە، وەیس پت لەڕێگەی وەیس پتەوە هاتووە.

سەرۆکی عەشیرەت هەڵبژێراوە= انتخاب کراوە کە پێیان وتووە (دیو پت)، بەواتای سەرۆکی قەوم یان ویلایەت دیارە هەموو شت بە هەڵبژاردن بووە. وەك باسمان کرد بەم پلانەدا هاتووە، خانەوادە، تیرە، عەشیرەت، قەوم، ملەت، ئاریانی، هەرچەند ئاری دواکەوتووتر بوون لە سۆمەر و ئەکەد و بابل، بەڵام لە زۆر ڕووەوە لەوان پاکتر بوون، وەك ئەو سێ شتە کە دەبێت سفاتی مرۆڤ بێت، ویژدان، کردەوەی باش، قسەی باش، مەزهەبیشیان ڕاستگۆیی بووە.

مێژووی ئاری لە ئێراندا دەبێت بە چوار بەشەوە:

**عەهدی یەکەم:**

پێش سەدەی حەوتەمی پ.ز، لە نیوەی سەدەی حەوتەمی پ.ز کۆتایی پێ هاتووە.

**دووەم عەهدی ناوەڕاست:**

کە لە نیوەی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە دەست پێ دەکات تا حوکمڕانی سەفەوییەکان. ئەم عەهدی دووەمە دیسان دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکەمیان: پەیدابوونی مەغۆل و بەشی دووەم لە مەغۆلەوە تا هاتنی سەفەوی بۆ سەر حوکم.

**عەهدی سێیەم:**

لە زەمانی سەفەوییەکانەوە تا عەهدی مەشرووتییەت.

**عەهدی چوارەم:**

لە مەشرووتییەتەوە تا ئەمڕۆ.

**هیرودوت:**

مێژووناسی یۆنانی کە بەناوبانگە بە باوکی مێژوو، خەڵکی (هالیکارناس)ە، ئەوکاتە موستەعمەرەیەکی یۆنانی بووە لە ئاسیای بچووکدا. لە ساڵی (٤٨٤)پ.ز لەدایك بووە تا ساڵی (٤٢٥)پ.ز. لە نووسینەکانیدا زۆر ڕاست بووە و شتی نارێکی پێشتری ڕاستکردووەتەوە.

## کتازیاس (Ktzeas):

مێژووناسی یۆنانی و پزیشکی تایبەتی ئەو ئەردەشێری دووەم بووە. ناوبراو مێژووی ئێران و هیندی نووسیوە.

**گەزەنەفون:**

مێژوونووسی یۆنانی، لە ساڵی (٤٣٠)پ.ز تا (٣٥٢)پ.ز ژیاوە لە شاگردەکانی سوقرات بووە. کتێبێکی نووسیووە لە کاتی کشانەوەی دە هەزار نەفەری یۆنانی لە بابل بەرەو یۆنان پاش تێشکانی کورشی بچووك.

## پلوتارك (Plo Tark):

مێژوونووسی یۆنانی لە ساڵی (٥٠)پ.ز تا (١٢٥)پ.ز ژیاوە.

## ئەسترابوون (Astraboon):

جوگرافیانووسی بەناوبانگی یۆنانی، لە ئاسیای بچووك لە کاپادوکیا لەدایك بووە، لە سەرەتادا لە سەدەی یەکەمی زایینی، کتێبێکی نووسیوە لەسەر جوگرافیای جیهان.

هیرۆدوت، له هەموو نووسینەکانیدا باسی زەردەشتی کردووه، لەلایەن مێژووناس و موحەقیقەکانەوە ئیختیلافی زۆرە لە پەیدابوونی زەردەشت و زمانی ئاوێستا.

هەندێ زمانی زەردەشت بە (١٦٠٠)ساڵ پ.ز یان دوو هەزار ساڵ پ.ز دادەنێن، یان شەش هەزار ساڵ پ.ز، هەندێك دەڵێن لە زەمانی هەخماق نشییەکاندا بووە، واتا زەمانی کورشی گەورە، یان داریوش، لەم ڕووەوە زۆر کێشە و لێکۆڵینەوە هەبووە لەنێوان مێژووناسان و موحەقیقاندا.

**گلدنر:**

لە ساڵی (١٨٨٨) زاینیدا باوەڕی وایە کە گشتاسپش پارێزگاری زەردەشت بووە، کشتاسپ یەکێکە و باوکی داریوشی یەکەم هەمان کەس، باوەڕێکی دیکەی هەبووە، کە زەردەشت لەنێوان ساڵانی هەزار، یان هەزار و چوار پ.ز ژیاوە.

ئاوێستا: کە لەبەر دەستدایە بەشێکی هینی زەمانی ساسانییەکانە.

**گلدنر:**

پاش چەند ساڵێك باوەڕی خۆی بەم شێوەیە دانا کە لە ساڵی (١٨٩٠) زاینیدا دەڵێت: کشتاسب پارێزگاریکەری زەردەشت بووە و هەر ئەو گوشتاسپش باوکی داریوشی یەکەمە و ژیانی زەردەشت لە ساڵی (٥٦٠)پ.ز بووە.

## جەکسن (Jaksin):

زۆر بە قوڵی لە ژیانی زەردەشتدا کۆڵاوەتەوە و تایبەتمەند بووە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ ئەم زانایە باوەڕی بەم شێوەیەیە:

لەدایکبوونی زەردەشت لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پ.ز بووە و مردنی لە نیوەی یەکەمی شەشەمی پ.ز-دا بووە. هەرچەندە هەریەکە لەو زانایانە باوەڕیان جۆربەجۆرە، بەکورتی:

(زەردەشتی) زەردەشت لە سەدەی حەوتەمی پ.ز لەدایك بووە لە ڕۆخی دەریاچەی ئاورمیە مەزهەبی خۆی بڵاوکردووەتەوە، لە سەرەتای ساڵی نیوەی شەشەمی پ.ز لەناوچووە.

زمانی ئاوێستا چ زمانێکە:

**دارمس:**

باوەڕی وایە کە ئاوێستا بە زمانی مادەکان نووسراوەتەوە، زمانی ماد زۆر نزیك بووە لە زمانی پارسی کۆنەوە.

ئاوێستای ئەمڕۆ ئەمەیە، پێنج بەشە:

١- سەسنەپرد: ئاداب و مەزهەبی گاپها پارچەیەکە لە سەنا.

٢- وەیس پرد: تەواوکەری پەسنایە دەگەڕێتەوە بۆ ئاداب و عیبادەت.

٣- وندیداد: هیچی لەناو نەچووە باسی دروستبوونی جیهان و کفر و شتی دیکە دەکات.

٤- یەشت: سروود بووە، ئەمیش پێیان وتووە یەزەت.

٥- خودی ئاوێستا- وردەی ئاوێستا:

کتابی دۆعا و لە زەمانی شاپورەی دوومدا نووسراوەتەوە.

دارمس باوەڕی وابوو کە ئاوێستای ساسانی خاوەنی بیستویەك (نسك) بووە، پاش سەدەی نۆیەمینی زاینی، یان سێیەمی کۆچی بەشێك لە ئاوێستا لەناو چووە، ئەوەش چوار نسك بەتێکڕا ون بووە و لە پانزە نسك هەندێکی ون بووە... ئەوەی کە ئێستا ماوە پاش ماوەی ئەوانەیە و دوو نسکی ماوە بەتەواوی، باوەڕی ئەو زانایە وایە، ئەوەی کە ماوەتەوە هەمووی ئاوێستایە، کە لەنێوان سەدەی یەکەمی زاینییەوە جارێکی دیکەش لە سەدەی شەشەمی زاینی نووسراوە.

## ژیانی زەردەشت:

زەردەشت کوڕی باوروشب و ناوی دایکی (دوغد)، لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا لە خەڵکی دوورکەوتووەتەوە و ماوەیەکی زۆر بە (خەڵوەتەی مەی دوت)ەوە بردووەتەسەر لە تەمەنی (٣٠) ساڵیدا لە ڕۆخی ڕووباری (دائی تی)دا فەرمانی پێ دراوە، کە خەڵکی بانگ بکات بۆ خواناسی هەندێ زانایان باوەڕیان وایە کە (ڕود) ئاراسی ئەمڕۆیە.

وە هومنە ئاشی سین ئەندێشەی باشی زەردەشتی لە بارەگای ئاهورامەزدا ئامادە کرد، پاشان زەردەشت کەوتە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی لەناو خەڵکی توران کە لە خارجی ئێران بوون.

هەروەها لە سکتانەوە دەستی پێکرد، پیاوە دینییەکانی ئەوکاتە کە لە ئاوێستادا بە کاوی (Kawe) ناوبراون دژی زەردەشت وەستان، لەم کاتەدا زەردەشت بە فەرمانی ئاهورامەزدا چوو بۆ لای دیشتاسب شای خۆرهەڵات،

پاش دوو ساڵ هەوڵدان توانی پادشا بهێنێتە سەر ئاینەکەی خۆی، لـەم ڕووەوە وەزیری شا کە ناوی جاماسب بوو، زۆر یارمەتی زەردەشتی دا جاماسب کچـی زەردەشتی هێنا، ناوی پروچیست (Procheste) بووە و زڕ برازایـەکی خـۆی دا بە زەردەشت ناوی هووی (Howe) بووە، پـاش ئـەوەی شـا قبـوولّی ئـەم مەزهەبەی زەردەشتی کرد، زۆر بەخێرایی بڵاوبووەوە لە توران و ئێران و هینـد و ئاسیای بچووکدا. زەردەشت هەموو ژیانی بەربەرەکانی بوو دژی ئەوانـەی دژ بە ئاینەکەی بوون.

زەردەشت لەکاتێکدا لەگەڵ خەڵکی هیون لەشەڕدا بووە کوژرا. سـەرداری ئـەو شـەڕەی دژی زەردەشـت نـاوی (ارج ئەسـبا) (ارجاسـب- Arjtasb arjasb) بوو، ئەو کەسەی کـە زەردەشـتی کوشـت نـاوی تـوری برانـزوخش (Tarebra Trakhsh) بوو.

یەزت دەبێت بە دوو بەشەوە:

بەشی ئاسمان و بەشی زەوی. لەسەر ئاسمان هورمز و باشـترین -یـەزت لـە زەویدا زەردەشتە.

هـەر یـەزدێك یارێزگـاری لـە شـتێك دەکـات. زمـانی ئاوێسـتا پـاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد دەرکەوتووە کە زمانی مادەکانە.

**دارمس:**

زانای ناسراو باوەڕی وایە زمانی کورد و ئـەفغانی زمـانی ئاوێسـتا بـووە. هەندێکی دیکە باوەڕیان وایە زمانی ئاوێستا دەبێت بـە دوو بەشـەوە، کـۆن،

گاپ = سروود که لـه نووسـراوەکانی نەگەیشـتوون لـه زەمـانی حـوکمڕانی ساسانییەکاندا، بۆیە تەرجمەیان کردووە بە زمانی پەهلەوی.

خەتی نووسینی ئێرانی لە کۆندا:

١- خەتی مێخی، خەتی پەهلەوی، خەتی زەند- خـەتی ئاوێسـتا، یەکـەم خەتی مێخی وەك مێخ وایە، بەشێوەی عامودی، یان ئوفقی بەکارهێنراوە، لـە چەپەوە بۆ ڕاست نووسراوە، ئەم خەتە لە خەتی کلدانی و ئاشووری وەرگـیراوە، چونکە خەتی ئەسڵی مێخـی هـی سـۆمەرییەکانە. (٤١) نیشـانەی هەیـە، (١٥) نیشانەی یەك پیتییە و بیستویەکی ڕاست و چەپە، چوار نیشانەی ایـل و گرامیە و یەك نیشانەی نێونە، نووسـینی شـاکانی هنحـامنش بـەم خەتـە نووسـیویانە، جگـە لـەوەش بـە زمـانی فارسـی کـۆن و بـە خـەتی فارسـی نووسیویانە.

٢- خەتی پەهلەوی، دەڵێن ئەم خەتە لە ئارامییەوە هاتووە، دەبێت بە دوو بەشەوە، خەتی پەهلەوی و ئاشکانی وە ساسانی هەردووکیان لـە ڕاسـتەوە بـۆ چەپ دەنووسرێت.

٣- خـەتی ئاوێسـتا خـاوەنی (٤٠) نیشـانەیە، لـە ڕاسـتەوە بـۆ چـەپ دەنووسرێت.

هەندێك لە زانایانی زماناسان، باوەڕیـان وایـە کـە زمـانی سـۆمەر لـە زمانی ئۆراڵ و ئالتائییە. لە هەڵکەندنیدا نزیك عەشعد ئاباد لە لایەن (پـوم یلی) ئەمەنیایەوە لە گوراکـان ئـانو، هەنـدێ شـتیان دۆزیوەتـەوە وەك ئـەو شتانەی سۆمەری و عیلامی بووە. ئەم ڕووداوانە هەموویان وا دەگەیـەنن کـە

سۆمەری و عیلامییەکان لە کێوەکانی باکووری ئێران بووبن. پاشان بەهۆی کۆچکردنی خەڵکەکەوە لە جێگاکانی دیکەوە بۆ سەر ئەمان لە ئێران. ئەمان بەرەو خۆرئاوا بۆ ڕۆخی کەناری فورات کۆچیان کردووە.

یەکێك لە شتە ڕووداوەکان ئەمەیە، کە مەرکەزی سۆمەر لە شاری نیپ پور بووە و ئەم شارە لە جێگایەکدایە لە بەشێکی ئێران، کە لە لقێکی مەملەکەتی بابل بووە. هەندێك باوەڕیان وایە کە سۆمەر تەدراتا بە شنعار ناوبراوە.

لە شوش دەرکەوتووە لە ئەنجامی هەڵکەندنی پێش کینا خەڵکی سامی لە عیلامدا بوون. ناوی عیلام ناوێکی سامییە لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتووانی کۆنی (بنەڕەتی عیلام) مەملەکەتەکەی خۆیان لە نووسیندا بە (خاتام تی) یان (خابیرتی) ناوبردووە.

لە ڕووی نەمانی عیلامییەوە ئەو زانایانە، شیل، ویسباخ، هوزینگە وە برگ. کە ئیشیان کردووە، ئەم زانایانە باوەڕیان وایە کە زمانی عیلامی خاوەنی چەند لەهجەیەك بووە و ئەم زمانەش نزیك بە زمانی قەفقاسی بووە.

مارە: زمانی عیلامی بە زمانی گورجی و دانیشتووانی کۆنی ئەرمەنستان دادەنێت.

نووسینی هیتی:

خەڵکی وان لەڕووی شارستانییەتەوە لە ئاشووری و بابلی نزیك بوون و لەڕووی نەژادەوە لەگەڵ هیت-دا یەك نەژاد بوون. تا ساڵی (١٨٤٠)ز هیچ زانینێك نەبووە دەربارەی هیتی، دوای ئەوە زانرا هیتییەکانی لە ساڵی

(١٧٠)پ.ز ولاتێكی زۆر بەهێز و توانابوون لە ئاسیای بچووك، هەزار ساڵ فەرمانڕەوا بوون تا سەدەی حەوتەمی پ.ز بە دەستی ئاشوورییەكان نەمان.

پێشتر پادشاكانی وان بە نووسینی مێخی ئاشوور نووسیویانە، پاشان نووسینی خۆیان هەبووە، مۆرێك دۆزراوەتەوە كە بە نووسینی مێخی هیتییە، ئەم مۆرە هی پاشای تاركودی مو بووە، شتی پاشماوەی هیتی زۆر لە مۆزەخانەی بەرلین هەیە.

پایتەختی ئەم دەوڵەتە لە سەرەتاوە لە (پ ت ڕیوم) بووە، كە ئێستا ناوی بوغاز پاشان لە (كاراكاوش) لە ڕۆخی فورات كارگمیش بەڵگەنامەیەك لە كاپادوكییە (بوغاز گوی) پایتەختی هیتی، وین كەلەر، نووسینی پادشاكانی هیتی دۆزییەوە، هەندێ لەو نووسینانە بەڵگەنامەی كۆنە لەو بەڵگانە (تل العامرنە) زۆر كۆنترن، بەڵگەكانیش لەنێوان هیت و فراعنەكان و هەندێ پادشایانی دیكەدایە، یەكێك لەو نووسینانە لە دەوری پاشای هیت (خات توشەلەم) بوو ڕامزسی دووەم فرغەونی میسر بەستوویانە وەك پەیمان، نووسخەی دووەمی ئەم پەیمان بەستنە، نووسینی مسییە لە نووسینی كۆنی میسری، ئەم بەڵگانەش باسی یەكێتییەكە ئەم دوو دەوڵەتە پاش شەڕێكی دووروودرێژ لەسەر سوریا كراوە. فیرعەونی میسر كە زانی ناتوانێت بە شەڕ زاڵ بێت بەسەر هیتییەكاندا، ناچار پەیمانی دۆستایەتی بەستووە و بە زمان و نووسینی بابلی نووسراوە، وا دەردەكەوێت لەو زمانەدا زمانی بابلی زمانێكی میللی و گشتی بووە، بۆ بەستنی بەڵگە و پەیمان.

له ساڵی (١٨٤٢)ز له تەپەی پوڵ بت تا، ویسی قونسڵی فەڕەنسا له موسڵ لای دابووە. کە ئەم گردۆڵکەیە، نەینەوای کۆنە و لە تەپەی (کوبوونجیك) بۆ یەکەم جار کەوتە هەڵکەندن و پشکنین، لەمە هیچی دەستکەوت نەبوو، کەوتە پشکنین و هەڵکەندنی تەپەی (خورساباد) لەم هەڵکەندنەدا دەرکەوت کە ئەمە جێگای کۆشکی سارگن بووە و هەندێ لەو شتانەی دۆزییانەوە ناردیان بۆ مۆزەخانەی (لوور) له فەڕەنسا.

## ئینگلیزەکان:

له تەپەی نەمروود، جێگای کالا یان کالپ پایتەختی کۆنی ئاشوور، کەوتنەوە هەڵکەندنی کۆشکی ئاشوور پانیپاڵ پاشای ئاشووری و زۆر بەردی تاشراو دۆزرایەوە، ئەمەش له ساڵی (١٨٤٥ز). پاشان لەجێگای (کویرنجیك) کە فەڕەنسییەکان وازیان لێهێنابوو، لەوێدا زۆر شتی دۆزییەوە کە پاشماوەی کۆشکی نەینەوا بووە. بەردەوامی (لیارد) لە ساڵی (١٨٤٩-١٨٥١)ز خەریك بوو تا کۆشکی (سن حاریب) و (تیگلات پلایسەر)ی پاشایانی ئاشووری دۆزییەوە. له هەمووی گرنگتر کتێبخانەیەکیان دەربارەی ئاشوور پانیپاڵ لەژێر خاکدا دەرهێنا، ئەمەش له مۆزەخانەی بەریتانیادایە.

له ساڵی (١٨٥٥)ز ئەمریکاییەکان و ئەڵمانییەکان کەوتنە هەڵکەندن و پشکنینی بابل و زۆر شت دۆزرایەوە.

ئێـــران لـــه ســـاڵی (١٨٤٠-١٨٤١) (فلانـــدن) و (کســـت) تـــەختی جەمشیدیان پشکنی، لە پاشماوەی جەمشیدا دەرکـەوت کـە تـەلاری گـەورەی (ئاپەدان) کە لەوێدایە و چۆن بووە.

لە ساڵی ١٨٥٠ز لفتوس و چەرچیل، کەلاوەکانی شوشیان پشکنی. پـاش ئەمان لە ساڵی (١٨٨٥)ز دیولافوا خەریکی پشکنینی شوش بووە و کۆشکی ئەردەشێری دووەمی هاخافش-یان دۆزییـەوە، پێشـتر ئـەم جێگایـە کۆشـکی داریوشی یەکەم بووە، ئەم شتانەش زۆری نێردرا بـۆ مۆزەخانـەی (لـوور) لـە فەڕەنسا.

**هیرودوت:** ژیانی ئەو لـە (٤٨٤-٤٢٥)پ.ز-یـە، (٩) کتێبـی نووسـیوە، ناویشی بە (مێژووی لە نۆ کتابدا)، ئەگەرچی ئەو بە باوکی مێژوو دادەنرێت، لەڕاستیدا ئەو یەکەم نووسەری مێژوو نـەبووە، پـێش ئـەو کەسـانی یۆنـانی هەبوون وەك هیکـاتی (Hecatee) مێژوونوســی ســەدەی شەشــەمی پ.ز خـــەڵکی ســـی لـــت کیتزیـــاس (ctesias) خـــەڵکی کنیـــد (cnide) مـوســتەعمەرەی دوریـانی لـە ئاسـیای بچـووك نووسـینەکانی بـە لەهجـەی یۆنانییە، مێژوونووســی نـاوبراو مـاوەی (١٧) سـاڵ لـە (٣٩٨-٤١٥) پ.ز پزیشکی داریوشی دووەم بووە. (٢٣) کتێبی نووسیوە، لەمانە شـەش کتێبـی دەربارەی مێژووی ئاشوور و مادە، حەوت کتێبی دەربارەی مێژووی ئێرانـە لـە (کورشی گەورەوە تا مردنی خشـیار شـا) و دوو کتێبـی دوابـەدوای مێـژووی ئێراندا تا ساڵی (٣٩٨) پ.ز.

## دەوڵەتی عیلام و سنووری عیلام:

لە زەمانی کۆندا عیلام بە مەملەکەتێکیان دەوت کە لەم ویلایەتانە پێکهاتبوو: خوزستان، لورستان، پشتکو، کێوەکانی بەختیاری، سنووری ئەم وڵاتە لە خۆرئاواوە دیجلە بووە، لە خۆرهەڵاتییەوە بەشێکی فارس، لەلای باکوورییەوە ئەو ڕێگەیە بوو کە لە بابلەوە دەچوو بۆ هەمەدان، باشووری خلیجی پارس تا بوشەهر بوو. شارە گەورەکانی:

١- شوش گرنگترین شاری عیلام بوو و یەکێکە لە هەرە شارە کۆنەکانی جیهان.

٢- ماراکتووری.

٣- خایدالو ڕەنگە جێگەی خورڕەم ئابادی ئێستا بێت.

٤- ئەهواز: دانیشتووانی عیلام بە دەوڵەتەکەی خۆیانیان دەوت ئان زان سوسونکا.

وشەی عیلام پشکنێرەکان وا دەزانن ناوێکی سامییە.

نەژاد و زمانیان:

باوەڕی دیو لافوا و دوومرکان وایە کە دانیشتووانی کۆنی یەکەم جاری ئەم مەملەکەتە حەبەشی بوون. کۆنترین زمانی ئان زانی بووە و بە باوەڕی دمرکان لە (٣٠٠٠) ساڵ پ.ز واز لەو زمانە هێنراوە، زمانی سۆمەری ڕەواجی هەبووە.

ئـەبی ئینلـە (١٥٠٠) سـاڵ پ.ز-دا زمـانی ئـەنزانی زینـدوو بـووە و بەکارهێنراوە لەناو ئەو خەڵکەدا، بەڵام نووسینی بە زمانی سۆمەری و سامی نووسراوە.

## نووسین:

نووسینی عیلامی مێخ و بەشێوەی ستوونی بـووە، نیشـانەی نووسـینی (٣٠٠) قەد و بڕینە. نووسینی عیلامـی لـە سـۆمەرییەوە وەرگـیراوە، بـەڵام نووسینی مێخی عیلامی نووسینێکی سەربەخۆ بووە.

## مەزهەب:

لـە مەزهـەبی عیلامیـدا (گیـان) دەرچـوون هەیـە... شوشـیناك خـوای گەورەیان بووە و تەنها پەرسـتنی پاشـاكان و كاهنـەكان بـووە. شـەش خـوای دیكەشیان هەبووە، لەكاتێكدا ئەگەر خوای شارێك ببرایە بۆ شـارێكی دیكـە باوەڕیان وابوو كە ئەو خوایە گۆڕاوە. هەندێ شت كە لە شوش دۆزراوەتەوە بـە باوەڕی دومركان دەگەڕێتەوە بۆ هەشت هەزار ساڵ پ.ز، عیلامییەكان لەپشت دەریای خەزەرەوە هاتن.

عیلامی سۆمەرییەكان پەیوەندییەكی كۆنیان هەبووە لەناو یەكدا، ڕەنگە لە بەشی باكوورەوە هاتبن، ڕەنگە پـێش هـاتنی ئـەوانیش خـەڵكێكی كـۆنی تیابووبێت و ئەمان داگیریان كردبێت. هەندێ گۆزە كـە سـپی بـووە لـە ڕووی ئەوانەوە ڕەسمی تێدا كراوە و هەندێ لەوحەی كە بە گڵی سـوور دروسـتكراوە، نووسینی تێدایە.

## دومرکان:

ئەمانە دادەنێت بە چوار هەزار ساڵی پ.ز. سەدەی مێژووی عـیلام دەبێـت بە سێ بەشەوە:

١- زەمانێ کە مێژووی عیلام پەیوەندی تەواوی بـە مێـژووی سـۆمەری و ئەکەدییەوە هەبووە (لە زەمانی کۆنەوە تا ٢٢٢٥ ساڵ) پ.ز.

٢- زەمانێ کە عیلام لەگەڵ مێژووی دەوڵەتی بابلدا بەیەکەوە بەسترابوون (٢٢٦٥-٧٧٥) پ.ز.

٣- دەوریەك کە عیلام لەگەڵ تی ئاشووری تازەدایە (٦٤٥-٧٤٥ پ.ز).

## ئاری:

ئاری هینـدۆئێرانی پـاش ئـەوەی ماوەیـەك پێکـەوە ژیـاون، لـە ئاسـیای ناوەڕاستەوە کۆچیان کردووە و هاتوونەتە خۆرئاوا.

بەشی هیندی بەرەو هیندو کنقی ڕۆیشتوون لە ڕووباری بنجابی هینـدی و سەرەوخوار بوونەتەوە، بەشی ئێران بەرەو باشوور و خۆرئاوا لە خـاکی ئێرانـدا بڵاوبوونەتەوە، هەندێك لە پشکنەرەکان باوەڕیان وایە کە ئارییە هیندییەکانی لـەلای پامیـەوە بـەرەو هینـد سـەرەوخوار بوونەتـەوە. هەنـدێ لـە سـاڵی (١٧٠٠)پ.ز لە قەفقاسەوە هاتوونەتە ئێران.

## ناوی ئێران:

لەناوی ئەو خەڵکانەوە هـاتووە بـەواتای ئاریـا بەشـێوەی کۆمـەڵ بووەتـە (ئایریا)، ئەم وشەیە بە تێپـەڕبوونی زەمـان بووەتـە ئایریـا، ئـایران، ئێـران.

هەندێکیش پێیان وتووە ئاریانە، سنووری ئاریانە کە ستابوون دەڵێت (کتێبی ١٥ بەشی ٢ بەندی ٨).

ئاراتستن (Eratosthene) یۆنانی یەکەم نووسینی دەرەوە بەم شێوەیە:

لە بەشی خۆرهەڵاتەوە ڕووباری سەند لای باکوورەوە کێوەکانی پارامیز (Parapamise) و چەند کێوێکی کە دەربەندی دەریای خەزەر.

ئاراتستن یۆنانییە لە سەدەی سێیەمی پ.ز ژیاوە.

پاراپامیز: زنجیرە کێوەکانی ئەفغانستانی باکورر و هنوکەشە.

دەرگای کاسپین: لە بەشی باشوورەوە دەریای گەورەی عمان. لە خۆرئاوایەوە ئاماد و کرمان.

ویلایەتی ئەسفەهان کە فارس جیادەکاتەوە:

ئەمەش ستابوون خۆی باش زانیویەتی، کە لە دەربەندی ڕووباری خەزەرەوە (سەری ڕووباری خواروو تا کرمان) درێژەی هەبووە، ئەمەیە ئاریانای ئاراتستن.

تەیسەفون: لە ئەمانی ساسانییەکاندا کە پایتەخت بووە، پێیان وتووە (دل ایران شهر).

## هاتنی ئاری بۆ خاکی ئێران:

ئەو جێگایەی لێوەی هاتوون نازانرێت کوێیە، لە ئاوێستادا وڵاتی ئەسڵی ئارییەکان ناودەبات بە ئێران واج بەواتای وڵاتی ئارییەکان، دەڵێت وڵاتێك بووە ئاووهەوای خۆش بووە، ئەرزێکی زۆر و فراوانی بەپیت، بەڵام ئەهراوحی خراپ ئەرزەکەی سارد کرد، چونکە ئەو ئەرزە خواردنی بە مرۆڤ دەدا دوای ئەوە کە زۆر سارد بوو، ناچار کەوتنە کۆچکردن. لێرەدا نازانرێت مەقسەدی ئێران واج

چییه. جێگای ئەسڵی ئارییەکانە پێش جیابوونەوەی خەڵکی هیند و ئەوروپای؟ یان جێگایەکە کە لەگەڵ هیندییەکاندا بوون، گرنگ ئەوەیە لەبەر تەنگی جێگا، جیابوونەتەوە، باوەڕی هەندێ لە زانایان وایە کە پێش دوو هەزارساڵی پ.ز بووە، باوەڕی دوایی و ڕاستر ئەوەیە کە لە سەدەی چواردەیەمی پ.ز ئەم کۆچکردنە دەستی پێکردووە تا سەدەی شەشەمی پ.ز بەردەوام بووە.

لە ئاوێستادا: هاتووە کە ئەمانە لە شانزە مەملەکەتدا دابەش بوون، ناوێك لەوانە دیار نییە.

١- ئێران واج- مەملەکەتی ئارییەکانە.

٢- سوغدە- سغد.

٣- موورو- مرو.

٤- باخژی- باختەر.

٥- نیسابە- هەندێ بەو جێگایە دەڵێن کە دوو فرسەخێك لەسەر حسەوەیە، هەندێ بە نەیشاپوری دادەنێن.

٦- هرای و هرات.

٧- وای کرت: کابل.

٨- اورو: گوس یان غەزەنە.

٩- وهرگان: گرگان.

١٠- هەرهرواتی: ڕخج لە باشووری ئەفغانستان.

١١- ای تونت: وادی هیلسمەند.

١٢- رِگ: ڕەی.

١٣- شخریان چنحر: شاهورد.

١٤- ورن: لای ئەلبەرزیانی خواروو.

١٥- چت هیندو: پەنجابی هند.

١٦- ویلایەتێك كە لە كەناری ڕووباری ڕوونكا بووە، نازانرێت لـە كوێـدا بووە.

## مێژووی ئاریيەكانی ئێران:

لە سەدەی حەوتەمەوە، یـان كۆتـایی سـەدەی هەشـتەم پ.ز. دەسـت پـێ دەكات، پێش ئەوەی هەرچی بووبێت تاریكە. لە ماوەی بیستوسێ سەدەی پ.ز. واتە زەمانێك، كاتی جیابوونەوەی ئاریيەكان لە خەڵكەكـەی هیندۆئـەورووپای تا سەدەی حەوتەمی پ.ز بووە.

پێش ئەوە مێژووی ئێران تەنها بە ڕاز و قسەو باسە ئاریيەكان لە شار، یان دێهات، یـان كۆچـەری بـوون. بەگێڕانـەوەی ڕاز ئاریيـەكان چـوار دەوڵـەتیان دروستكردووە. دوو دەوڵەتیان بە پێی ڕاز دەوڵەتی جەمشید و فەرەیدوون بووە. دوو دەوڵەتەكەی دیكە: دەوڵەتی مەنوچەهر و زابیها بووە.

زەمانی جەمشید زۆر كۆنـە، هەنـدێك باوەڕیـان وایـە كـە جەمشـید بـە زەمانێكەوە بووە كە هێشتا جیابوونەوەی نێوان خەڵكی هینـدی و ئـەورووپایی نەبووە. هەرچۆن بێت كاتێكە كە ئاریيەكان هیندی و ئێرانی بەیەكەوە بوون.

دەوڵەتی فەرەیدوونیش بەو کاتانەوە بەستراوە. دەوڵەتی مەنوچەهرییەکان و زابییەکان لە دەورێکان کە ئارییەکانی ئێران لە باکووری خۆرهەڵاتی خاکی ئێرانەوە جێنشین بوون. لەبەردەم هێرشی خەڵکێکدا بوون کە لای باکوورەوە هێرشیان بۆ دەهێنان.

وا هەست دەکرێت کە ئەو هێرشکەرانە سکاییەکان بوون. پرسیار وایە ئایا ئەم دەوڵەتانە مێژوویین، یان نا؟ ئەگەر ڕازەکان بەشێوەی یەکەم وابێت، دەڵێن ڕاستە. لەڕووی ڕاستییەوە ئەم ڕاز و قسانە لە دەورەکانی جۆربەجۆر چەندەها سەدەدا کە لە یەك دوو جێگاش نییە، زیاد و کەموکوڕی زۆری تیابووە کە ناتوانرێت بڵێین بۆ نموونە فلان شا، یان فلان پاڵەوان لە زەمانی مەنوچەهردایە، یان لە فلانە پاشای دیکە و لە فلانە کاتدا ڕووی داوە تێکەڵ و پێکەڵە.

لەم ڕووەوە دەڵێن بەشێوەی گشتی، نەمانی مێژووی ئێران لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی پ.ز. دەست پێ دەکات و پێش ئەوە لە سەدەی نۆیەمی پ.ز.

## سێ قەومی ئاری:

لە ئێراندا لە چەند جێگایەکدا بوون دەوڵەتی تایفەیان دروستکردووە و مەلیکی بووە. لە خۆرئاوا ماد: لە خۆرهەڵات باخترییەکان و لە باشوور پارس.

ڕوایاتی هیرودوت:

دەڵێت لە کتێبی (١ بەندی ٢٦) ئاشووری لە ئاسیای سەروو پێنجسەد ساڵ فەرمانڕەواییان کردووە. یەکەم خەڵکێك کە سەرپێیان لێ کردوون بۆ

ئەوەی لە بەندایەتی ڕزگاریان بێت. پاش ئەمان خەڵکێکی زۆر چاویان لێ کردوون و خۆیان ئازادکرد وەك خەڵکی قارەی ئاسیا سەربەخۆ بوون، لە جێگایەکی دیکەی (کتێبی ١ بەندی ١٥١) مێژوونووسی ناوبراو دەڵێت: تا ئاینەکانی ماد شەشن: بوسی، پارتاکنی، ستروخاتی، ئاری سانتی، بودی، موغ. بەپێی نووسینی ناوبراو لە بەندی (٩٦) کتێبی یەکەمیدا هاتووە، پێش دیوکسی یەکەم شای ماد، هەریەکێك لەو تایفانەی ماد ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی جیاجیایان هەبووە، بە قسەی ناوبراو مادەکان پێنجسەد ساڵ لەژێر دەستەلاتی ئاشووردا بوون، بە نزیکەی لە (٧٥٤-١٢٧٤) پ.ز.

ئەمەش ناگونجێت لەگەڵ نووسینەکانی ئاشووردا و جیاوازییەکە بەم شێوەیە بێت گوایە پێش (٨٣٠)پ.ز. مادەکان لەژێر فەرمانڕەوای ئاشووردا بوون. ناویشی نەبردوون، کە ئەمەش بەپێچەوانەی عاداتی پاشاکانی ئاشوورە هەر جێگایەکیان گرتبێت نووسیویانە و باسیان کردووە. دیسان هیرودوت وەلامی بابل و ئاشووری بە یەك ولات داناوە، کە واش نەبووە.

بروس، مێژووناسی کلدانی، باوەڕی وابووە کە مادەکان لە دەوروبەری (٢٥٠٠) ساڵ پ.ز. بابلیان گرتووە و (٢٢٤) ساڵ فەرمانڕەواییان تیادا کردووە. هەندێکی دیکە باوەڕیان وایە کاسییەکان بوون بابلیان گرتووە، چونکە لە خۆرئاوای ئێرانەوە چوون بۆ بابل. لێرەدا بروس، کاسییەکان بە ماد تێگەیشتووە، ئەمەش هەڵەیە.

## بەشی دووەم:

شاکانی ماد خیلاف زۆرە لەنێوان هیرودوت و کتزیاس-دا. نووسینەکانی هیرودوت ڕاسترە. شاکانی ماد بە چوار شا دادەنێت: بەپێی نووسینی هیرودوت دروستبوونی ئەم دەوڵەتە لە (٧٠١) پ.ز دایە و (١٥٠) ساڵ بەردەوام بووە.

مێژووی دەوڵەتی ماد بەپێی نووسینی هیرودوت بەم شێوەیەیە لە (کتێبی یەکەم بەندی ٩٠-١٣٠).

## دیوکس (٦٥٥-٧٠٨) پ.ز:

دیوکس کوڕی فرا اورتسە خەڵکی لادێ بووە، وەك هەموو مادەکانی دیکە کە لە دێهاتدا دەژیان و هەر دێیە ژیانێکی جیاوازی خۆی هەبووە، ئەم کەسە بەهۆی دانایی و لێهاتوویی خۆیەوە، خەڵك دەچوونە لای بۆ ڕاوێژ و سوڵح و زۆر شتی دیکە، پاشان خەڵکەکە کۆبوونەوە وتیان دەبێت یەکێك بکەینە پاشای خۆمان بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و سەربەخۆییان، خەڵکەکە دیوکس-یان هەڵبژارد.

هەندێ لە پشکنێرەکان باوەڕیان وایە کە دیوکس ئەو دیا اکوی-یە کە لە نووسینەکانی سەرگۆنی دووەمدا هاتووە، ئەوەی هیرودوت دەڵێت وایە.

هیردورت دەڵێت:

پاش هەڵبژاردنی ئەو بە شا، یەکەم ئیشێك کە کردی، پاسەوانی دانا بۆ پارێزگاریی لە خۆی. بە خەڵکەکەی وت کە شارێك دروست بکەن، بۆ ئەمەش

جێگای هەمەدانیان هەڵبژارد و بە فەرمانی شا کۆشکێك دروستکرا کە حەوت قەڵای هەبووە، دیواری هەر قەڵایەك نواڕیویەتی بەسەر دیواری قەڵایەکی دیکەدا و دوا دیواری سەر هەموو دیوارەکان کۆشکی شا لەناو هەمووواندا بووە، ئەم حەوت دیوارە هەریەکە ڕەنگێکی جیاوازی هەبووە.

دیواری یەکەم سپی، دیواری دووەم ڕەش، دیواری سێیەم سوورێکی جگەری، دیواری چوارەم شینی کاڵ، دیواری پێنجەم سوورێکی کراوە، دیواری شەشەم سیمین، دیواری حەوتەم زەرد.

ئەم ڕەنگە تێکەڵاوانە لە بابل بە نیشانەی حەوت ئەستێرە دانراوە و بورجی پەرستگای ناسراوی (بیرس نەمرود) لە بابل بەم ڕەنگانە ڕەنگ کرابوون.

شا توانی تیرە بڵاوەکانی ماد یەك بخات و یەکێتییەك دروست بکات لەناویاندا، لەم سەردەمەدا سەنحاریب پاشای ئاشوور بە شەڕی بەردەوامی بابل و عیلامەوە سەرقاڵ بوو، بیری لە دانیشتووانی کێوە دوورەدەستەکانی نەکردبووەوە.

## مادەکان:

باجیان بە ئاشوور دەدا، لەم کاتانەدا تەنها یەك جار ئاشوورییەکان هاتنە ئالیپی، کە بە جێگای کرمانشای ئەمڕۆ دەناسرێت، چونکە مادەکان بێدەنگ بوون و لەوە بەولاوە نەهاتوون. فەرمانڕەوای ئەم شایە لە (٧٠٨) یان بە قسەیەکی دیکە لە (٦٥٥-٧٠١)پ.ز بووە.

هەمەدان:

دەربـارەی هەمــەدان، یەکـەم جارێـك کـە نـاوی ئـەم جێگایـە بـراوە لـە نووسینەکانی تیگلات پلایسەری یەکەمدا هاتووە لـە سـنووری (١١٠٠)پ.ز بووە، ئەم پاشای ئاشوورە ناوی ئەم شارەی بە ئامدانە ناوبردووە. لـە نووسـینی هاخافشی-یەکاندا ناوی ئەم شارەیان بە هەگمەتان نووسیوە، هەندێ وا دەزانن کە هەگمەتان قسەی دەربڕین.

## هیمودوت:

ناوی ئەوی بە ئاگباتان نووسیوە، لـەم ڕووەوە مێـژووی شـاری نـاوبراو تـا سەدەی یانزەیەمی پ.ز. هەبووە و لە ڕیزی شارە کۆنەکاندایە.

هەمەدان لەبەردەم کێوی ئەڵوەندایە ئەم کێوە لە بەردی خارایـە، بـەرزیی لە ڕووی دەریای ئۆقیانوسەوە (١٢) هەزار پێی و لە ڕووی شاری هەمەدانەوە شەش هەزار پێیە.

ئەڵوەند لە ئاوێستادا بە ئوروونت ناوبراوە، یۆنانییەکان بەکێوەکەیان وتووە ئارون ترتس مێژووناسەکانی ئەرمەنی دوای ئەوان ڕاوڵین سنە باوەڕیـان وایـە ئەگباتانی هیرودوت هەمەدانی ئێستا نییە. جێگـای پایتـەختی کـۆنی مـادە دەبێت تەختی سلێمانی ئەمڕۆ بێت، کە (٢٥) فرسـەخ لـە بەشـی باشـووری خۆرهەڵاتی دەریاچەی ئورمییەوەیە.

## دمرکان:

کە خەریکی هەڵکەندنی شوش بوو لەم ڕووەوە پشکنینی بەکار و جێگیری بەدیهێنا، کە ئەکباتانی هیرودوت هەمان جێگای هەمەدانی ئەمڕۆیە... خـاك و تەپەکەیی و جێگای حەوت قەڵا و کۆشکی هەمەدانی دەستنیشان کرد.

**دومرکان:**

دەربارەی هەمەدان وای نووسیوە: هەمەدان لە دامێنی شاخی ئەڵوەند لە سەرەتای لاپاڵیدایە، ئاوێکی زۆر لە کێوەکەوە بەرەو خوار دێت، بەرەو قەرەچای دەڕوات، ئەڵوەند لە بەردی خارا دروست بووە، لە هەموو کێوەکانی دیکە جیاوازە.

**فرورتیش:**

(٦٣٣-٦٥٥)پ.ز. بە قسەی هیرودوت (کتابی ١ بەندی ١٠٢) پاش دیکوکس فراراتسی کوڕی لەسەر تەخت دانیشت، هەرچەند داریوش لە نووسینی بێستووندا فرورتیشی نووسیوە، وەك یەکن. ئەمیش لەسەر سیاسەتی باوکی ڕۆیشت و هەر باجی بە ئاشوور دەدا و ئەو جێگایانەی کە نەهاتبوونەوە پاڵ ماد هەموویانی هێنایە پاڵ ماد و پاشان پارسیشی هێنایە ژێر فەرمانڕەوای خۆیەوە.

ئاشوور پانیباڵ کە لە شەڕی عیلام و بابل بووەوە ساڵی (٦٤٥)پ.ز، عادەتی پاشاکانی ئاشوور وا بووە کە دوای شەڕ تا شەڕێکی دیکەی داهاتوو خەریکی ڕابواردن و خواردن و خواردنەوە و ئاهەنگ بوون، لەم ڕووەوە ماد بە خۆیدا نازی و پەلاماری ئاشووری دا و لەم شەڕەدا لەشکری ماد شکا و فراراتس کوژرا، کە (٢٢) ساڵ فەرمانڕەوا بوو.

## هووخ شتر (٥٨٥-٦٣٣)پ.ز:

هیرودوت ناوی ئەم شایەی کراکساری نووسیوە لە نووسینی بێستوونی داریوشی یەکەم زانراوە، کە هووخ شتر بووە یەکێکە لەو شاهانەی کە وێنەیان کەم بووە لە مێژوودا، کاتی هاتنی ئەم بۆ سەر تەخت وەزعی ماد لە مەترسیدا بووە، بەڵام ئەو بەباشی هەموو شتێکی دەستنیشان کردبوو... بەپەلە کەوتە دروستکردنی سوپایەکی ڕێکوپێك وەك سوپای ئاشووری، پیادە پرچەك بە تیروکەوان و شمشێر... سوارەی تیرهاوێژان زۆر لێهاتوو بوون... سوپاکەی بەم شێوەیە ڕێکخست، هیرودوت لە (کتێبی ١ بەندی ١٠٣) پەلاماری ئاشووری دا و لەشکری ئاشووری خۆی نەگرت لەبەردەم لەشکری مادا، ئابلۆقەی نەینەوای دا و باش لەشکری ئاشووری تێکشکاند، لەم کاتەدا هەواڵ گەیشت کە سکایەکان پەلاماری ناوچەی مادیان داوە، ناچار وازی لە شەڕ هێنا و هاتەوە بۆ بەرهەڵستی سکایەکان لە دەوری دەریاچەی ئورمێ شەڕ ڕوویدا، لەم شەڕەدا لەشکری ماد شکا، ناچار سوڵح کرا لەم ڕووەوە (٢٨) ساڵ سکایەکان فەرمانڕەوایان بوون. تا لە کۆتاییدا هووخ شتر، پاشاو کاربەدەستانی سکایەکانی دەعوەت کردووە، هەموویانی مەست کرد و هەموویان کوژران، پاش ئەوە لەشکری سکای خۆی نەگرت بەرامبەر لەشکری ماد، چونکە پاشا و سەرکردەکانیان نەمابوون.

## سکای:

زۆر لێهاتوو و شەڕکەر و بێبەزەیی بوون، هەموو ئەو ناوچانەیان داگیرکرد... لەکاتێکدا پاشای میسر (پسامتیك) ئیسمتیخ (Esmtekh) هاتبووە شامەوە و سەرکەوتوو بوو، کاتێك هەواڵی سکای بیست زۆر بەپەلە کشایەوە و دیارییەکی زۆری نارد بۆ پاشای سکای لەترساندا.

## هاتنی سکای:

بۆ ئاسیای خۆرئاوا لەدوای هەڵسانی ئارییەکان بووە و ئاری بە واتای مادی ئەم کۆمەڵ کۆمەڵانە، دەستە دەستە کە هاتوونەتە خاکی ئێران و ئاسیای خۆرئاوا.

دەربارەی سکای لە تەوراتدا بە باشی باسکراوە کە ترس و لەرزی خستووەتە دڵی کۆمەڵانی ئەو کاتەوە، گرتن و کوشتن و تاڵان لە دڵی خەڵکدا بووە.

## ئارسیا:

دەڵێت (کتێبی ئارامیای پێغەمبەرمابی شەشەم) لای (بەتی بن یامین) لە ئورشەلیم ڕاکەن، چونکە بەڵایەك لەلای باکوورەوە، شکستییەکی گەورە ڕوودەدات، خوا بەم شێوەیە دەڵێت: بەزۆری میللەتی لە باکووری زەوییەوە دەهێنم، میللەتێکی گەورە لای سەرووی زەوییەوە ڕادەپەڕن و تیروکەوانیان بەدەستەوەیە، ئەوانە زۆردارن و بێبەزەیین وەك دەریا دەنەڕێنن، بە سواری ئەسپەکانیان وەك جەنگاوەرێك دژی تۆن ئەی کچی سیهون.

خۆیان دەڕازێننەوە بە چەکی شەڕ، ئەم دەنگەمان گوێ لێبوو دەستمان سست بوو، ئازارێك وەك ژنێ کە منداڵی بێت باڵی کێشا بەسەرماندا، ڕوومەکەنە بیابان و بەڕێگا مەڕۆن، چونکە شمشێری دوژمنان و ترس لە هەموو لایەکەوە. ئەی کچی میللەتی من پەڵاس لەبەرکە و خۆڵەمێش خۆت لەناویدا بتلێنەوە وەك تاقانە مردو شیوەن بکەن، چونکە تالانکەرەکان لە پڕێکدا دەدەن بەسەرماندا، شالاو زۆر ئەوناوە دادەگرێت، هێندە ناخۆش دەبێت قوڕقوشم لە ئاگرا دەتوێتەوە، ئەوەی هاوار بکات بەخۆڕایی هاوار دەکات، چونکە پیاوخراپان لە کۆڵی نابنەوە.

## (سکایەکان لە کۆنەوە هێرشیان بۆ ئێران هێناوە):

## ماوەی مانەوەیان لە ماد:

لەلای قەفقازەوە هاتوون، واتە لەپشت کێوەکانی قەفقازەوە بەرەو باشوور هاتوون، لەپشت کێوەکانی قەفقازەوە بەرەو باشوور هاتوون، لە دەربەند تێپەڕ بوون بە قەفقاز و ئازربایجانی ئێستادا هێرشیان هێناوە، هەندێك دەڵێن ڕەنگە لە دهستان، گرگان، تەبرستان، گیلان بۆ لای ئازربایجان هاتبن، دەبێت سکایەکان لە دوولاوە هێرشیان بۆ ئێران هێنابێت، زۆربەی مێژوونووسەکان مانەوەی سکاییەکان لە ئێراندا بە (٢٨) ساڵ دادەنێن، بەپێی بەراوردکردنی ئەو (٢٨) ساڵە لەگەڵ چوونە سەر تەختی کیاکسار کە لە (٦٣٣)پ.ز. بووە، تا گرتنی نەینەوا لە ساڵی (٦٠٦)پ.ز. کەمتر دەردەچێت مانەوەی سکاییەکان.

## گرتنی نەینەوا:

پاش ئەوەی مەترسی سکایەکان لەسەر ماد نەما، پەلاماری ئاشوور درا و گیرا. ئەو ئیمپراتۆرییەتەی کە لە سەدەی حەوتەمی پ.ز، واتە چل ساڵێك پێش ڕووخاندنی لە ئەوپەڕی دسەڵاتداری توانایدا بووە.

میسر لەژێر چاودێریدا بووە، لیدی بەرەو دواوە کشاند، دەوڵەتی عیلام کە دوژمنی ئاشوور بوو، نەما لەلایەن ئاشوورەوە، مەملەکەتی وان نەیدەتوانی بجولێت، بەشێوەیەکی زۆر بێبەزەییانە خەڵکیان دەکوشت، ترس و لەرزی خستبووە دڵی هەموو وڵاتێکەوە... فەرمانڕەوا بوون لە هەموو ئاسیای خۆرئاوا تاکو یرلوت، سەرەڕای کوشتن و کۆچکردن و تالان نەیتوانی فەرمانڕەوایی خۆی بپارێزێت بەسەر ئاسیای خۆرئاوا. کاتێك ئارییەکان کەوتنە هێرش بۆ سەر ئاشوور، ئاشوورەکان نەیانتوانی بەشەڕ بەرەنگارییان بکەن. ناچار کەوتنە نانەوەی دووبەرەکی و ڕاکێشانیان بۆ تێکدانی یەکێتی لەنێوان مادەکاندا. ئاشوور چەندین کچی خۆی دا بە سەرداری سکایەکان.

## ئاشوور پانیپاڵ:

فرۆفێڵی جۆربەجۆری لە میسر و لیدییەکان دەکرد، ئەم کارانەش کەمێك سەری گرت، بەڵام لە کۆتایی شەڕ لەگەڵ عیلامدا... سوپاکەی خۆی لە دەست چووبوو. گرتنی پایتەختی ئاشوور و لەناوچوونی فەرمانڕەوای نەینەوا جارێکی دیکە سامی نابێت.

ئاشوور پانیپاڵ لە ٦٢٥ پ.ز. مرد، لەم کاتەدا نابو پولاسەر فەرمانڕەوای ئاشووری لە بابل یاخی بوو، زنجیرەی (بابل و کلدان)ی دروستکرد.

پاش ئاشوور پانیپاڵ کورشەکەی (ئاشوور اتیل، ایلانی اوکـی ئـی) چـووە سەر تەخت، پاش ئەو براکـەی (سـین شـاروکین) یۆنانییـەکان پێیـان وتـووە (ساراکِس) لە (٦٠٧-٦٢٠)پ.ز. فەرمانڕەوا بوو.

فەرمانڕەوایەتی ئاشوور نەما کـە گـرنگترین ڕووداوی مێـژوویی بـوو لـە خۆرهەڵاتی کۆندا. ئەمانەش زیاتر لە نووسینی هیرودوت، کتزیاس، بدرس-دا نووسراوە. لـە سـاڵی (١٩٠١)ز. دوو بەڵگـەی گرنگیـان دۆزییـەوە دەربـارەی ڕووخاندنی ئاشوور.

یەکەمیان لەلایـەن نـابو پولاسـەر پاشـای بابـل و هاوچـەرخی کورشـی گەورەیە. دووەم بە ئەستوانەی نووسرابوو.

یەکەم دەربارەی پەیمان و یەکگرتنی نابو پولاسەر و هووخ شتر پاشای ماد، زۆر جیاوازی هەیە لە قسەی هیرودوت و پرس و کتزیاسدا. نووسینەکە هەموو شتی ڕوونکردەوە.

## پاشا:

دەڵێت (سیناخری) خراپەی کرد لەگەڵ بابلییەکاندا پەرسـتگاکانی تێـك دا، پەیکەری هارابە بەش و جێگا پیرۆزەکانی پیس کرد، بە دەستی مـەردووك خوای چەشنی گەورەی بابلی، دەستکاری کرد و ئەوی برد بۆ ئاشوور، مەردووك توڕەیی خۆی بەرامبەر بابلییەکان دەرخست کە (٢١) ساڵ لە ئاشوور مایەوە، هەتا ئەوەندەی توڕەیی خۆی بەرامبەر بە بابل کەمکردەوە، پاشای ئاشوور، کە تێکدەری مەملەکەتی مەردووك بوو، شمشێری کورشی ئەو، لە خوێنی ئەو بـۆ (ئەو بەشەی ون بوو). مەردووك پاشای اوم مان ماندها (بەواتای مادەکـان)ی

بۆ یارمەتی بنوپالاس سار بڕیاری دا، کە بێ هاوتایە، بە فەرمانی مەردووك هات بۆ یارمەتی بنوپالاس سار. لەسەرەوە و لەخوارەوە، لە ڕاست و لە چەپەوە بەشێوەی سیلا و هاتن و تۆڵەی بابلیان سەند. پاشای اوم مان ماندها و لێرە ئەو پەرستگاکانی ئاشووری تێکدا، ئەو ویلایەتی ئەکەد کە دژی پاشای ئەکەد بوون، وێرانی کرد، پاشای بابل دڵگران بووبوو لەو کردەوە خراپانەی کە بەرامبەر بە مەردووك کرابوون، ئەو دەستی درێژکرد بۆ جێگا تایبەتییەکانی خوا نزیکەکان.

بەرامبەر بەو خراپیانە پەرستگاکانی ئاشوور بە دەستی خەڵکێکی جیا لە مەزهەب، بڕبڕها کۆتایی قبووڵ کرا، لەم نووسینەدا وا دەردەکەوێت: بابلییەکان بەهۆی کردەوەی خراپی ئاشوورییەکانەوە چاوەڕوانی هەلێك بوون کە ئەوان لەناوبەرن. فەرمانڕەوای ئاشوور لە بابل کە خۆی دەڵێت بابلی بووم، یاخی بووبوو دەیویست شارەکانی نێوان دوو ڕووبار داگیر بکات، ڕەنگە میسریش هەمان بیری هەبووبێت، بۆیە بابل دەستپێشخەریی کرد.

پاش شەڕ، دیارە نابو پولاسەر سەرنەکەوتووە، داوای یارمەتی مادەکانی کردووە، لە کاتێکدا هووخ شتر کە نیازی هێرشی هەبووە بۆ سەر ئاشوور، ئەمەی پێ باشبوو، یەکێتی لەگەڵ پاشای بابلدا کردووە، لە نووسینەکەیدا کە هاتووە بە یارمەتی مادەکان وڵاتی ئەکەدی وێران بکەن، دیارە هەندێك لە شارەکانی ئەکەد لایەنگری ئاشوور بوون، لەو هێرشەدا بە هەردوولا لەو شارانەشیان داوە. دیارە لەم یەکێتییەدا لای بەهێزی مادەکان بوون.

## ئاسیای خۆرئاوا:

پاش ڕووخاندنی نەینەوا، لە نەخشەی ئاسیای خۆرئاوادا گۆڕانێکی گـەورە ڕوویدا، ئەو ویلایەتانەی کەوتبوونە سەر ڕۆخی دیجلە لە بەشی ژووروروی و کابا دوکیە بوو بە شای دەوڵەتی ماد، هەموو ئەو بەشانەی کەوتبوونــە نێــوان دوو ڕووباری خواروو، سوریا، فەلەستین، بوو بە بەشی بابل، ئینجا دەوڵەتی کلدانی و بابلی دروست بوو.

پاش ئەم دوو دەوڵەتە بە پلەی یەکەم، دەوڵەتێك کە لە خۆرهەڵاتی کۆندا، تەنها میسر مابوو کە تازە ژیانی سیاسی خۆی بەدەست هێنابوو.

## لیدی و مەملەکەتی کیلیکیە:

لە ئاسیای بچووك جگە لەم دەوڵەتانە لــە فەلەســتین ئــەمارەتی بچــووك هەبوون. ئەمارەتی یەهود کە پێشتر لەژێر فەرمانڕەوای ئاشووردا بوون، ئێستا کەوتنە ژێر دەستی بابل.

شاری سور لە فیقی لەڕووی سامان و پێشکەوتنەوە بە پلەی یەکەم بــووە، ئەم شارەش دوژمنی نەبوو.

حزقیل: لەو زەمانەدا بووە، زۆر باش دەردەکەوێت لە (کتێبی حزقیال بابــە ٢٧-٢٨)دا.

## ماد:

پاش ڕووخاندنی ئاشوور ئەو مەملەکەتانەی کــە بەشــی ئــەم بــوون، ئــەو ویلایەتەی کە لە ڕۆخی دیجلە بەشی سەرووی بوو، لەگەڵ مەملەکــەتی وان و

کاپو دەکەوێتە (ئاسیا و ئاسیای بچووك تا ڕووباری هالیس نزیك ایرماق)ی ئێستا ڕووی بوو.

## بابل:

پاش ڕووخاندنی نەینەوا نیوپولاس سار دەستی بەسەر نێوان دوو ڕووباری خوارووداگرتبوو، دەیویست بەرەو لای سوریا بجولێت. لەشکرێکی بە سەرکردایەتی بەختە نەسری کوڕی نارد بۆ شەڕ لەگەڵ میسردا، پاشای میسر نخائو، لەو وەزعە سوودی وەرگرتبوو، کەمتوانایی ئاشوور و چواردەورگرتنی نەینەوا لەلایەن بابلەوە، هاتبووە شامەوە بەرەو خۆرهەلات کەوتەڕێ، تا کارکمیش کەوتبووە سەر ڕۆخی فورات، هات.

لە تەوراتدا نووسراوە:

بەرامبەر بە پاشای یەهود یوشەیا، کە لەلایەنگری ئاشوور بوو، کەوتە شەڕ یوشەیا کوژرا (کتێبی دووەم مێژووی ڕۆژگکان باب ٣٥). پاشان بەرەنگاری سوپای کلدە بووە شکان لە ساڵی (٦٠٥) پ.ز، لە ڕوونکردنەوەکانی (ارمیا) ڕوونە کە میسرییەکان پاش ئەو شەڕە خراپ شکان و زۆر زەرەریان لێکەوت بەشێوەیەکی شپرزەیی و ناڕێکی هەڵاتن (کتێبی ئارەمیا، باب ٤٦).

بەختە نەسر دەیویست بکەوێتە دوای میسرییەکان، لەم کاتەدا هەواڵی بۆ هات باوکی مردووە، ناچار بەپەلە بەرەو بابل گەڕایەوە.

## لیدی:

مەملەکەتێك بوو لای خۆرئاوای ئاسیای بچووك، سنوووریان لەوکاتەدا بەم شێوەیە بوو: بەشی باکووری خۆرئاوا دەریای ڕەش و دەریای مەرمەرە، بەشی باشووری دەریای مەغریب، لای خۆرئاواوە تا دەریای جەزائیر، لەلای خۆرهەڵاتییەوە ڕووباری هالیس.

لە تەوراتدا ئەمانە دادەنێت بە نەژادی بنی سالم، پاشان دەرکەوت کە تەورات لەم ڕووەوە مەبەستی نەژادی میللەت لە ڕووی سیاسییەوە بووە، نەك نەژاد ئەمانە ئاینن، یان نا؟

خەڵکی لیدی لە بنەڕەتدا دانیشتووانی کۆنی ئاسیای بچووکن، خەڵکێك بوون لە کۆندا لەوێ ژیاون، پاشان لە سەدەی دەیەم و نۆیەم-ی پ.ز. خەڵکێك کە بەناوی بریگ یان فریکی، کە لە میللەتی هیندۆئەورووپی بوون، خزمایەتی نەژادیان بە یۆنانی کۆنەوە هەبووە، هاتوونەتە سەر ئەو خاکە و پاش چەند سەدەیەك لەگەڵ دانیشتووانی کۆنی ئەوێدا بوونەتە یەك.

لە سەدەی هەشتەمی پ.ز. میداس ناوێك لەوێ فەرمانڕەوا بووە، لە مێژوودا ئەو ناو دەبرێت بە (میتای موشکی) لە دەوروبەری ساڵی (٧٧٠)پ.ز ئەم پاشایە لەگەڵ (روسا) پاشای مەملەکەتی ئارارات یەکیان گرت و بە یەکەوە بەرامبەر بە سارگۆنی دووەمی ئاشوور شەڕیان کرد. پاش هاتنی فریکگییەکان بۆ مەملەکەتی لیدی دەوڵەتیان دروست کرد لەو تایفانەی لیدی و هێزیان پەیدا کرد، پاش ئەوە دەوڵەتێك دروست بوو و

زنجیرەیەك لە پاشاكان فەرمانڕەواییان كـردووە، كـە ناسـراوبوون بـە (هـەراك لیدی) یان هەرقلّی.

(اگـرون) ناوێـك ئـەم زنجـیرەی دروسـتكرد و لـە دەوری ئـەم زنجیرەیـەدا فریگییەكان تێكڕا هەموو لەگەڵ دانیشتووە كۆنەكاندا تێكەڵ بوون و بوونـە یەك، پاشان زنجیرەیەكی دیكە هاتە كایەوە، لە مێـژوودا ناسـراوە بـە زنجـیرەی مرمناد.

لە ساڵی (٦٦٧)پ.ز. لیدییەكان دیسان دووچاری هێرشـی كیمیرییـەكان بوون و خراپ شكان. داوای یارمەتییان لـە ئاشـوور كـرد، بـەڵام نـەیانتوانی یارمەتییان بدەنێ، لەو شەڕەدا پاشای لیدی كوژرا.

## ئاردیس:

كـوڕی پاشـای كـوژراو سـوپاكەی كـۆكردەوە و داوای یارمـەتی لـە یۆنانییەكانی ڕۆخەكان، كە دراوسێ بوون، كرد، ئەوانیش یارمەتییان دان، بە سەگ فێركرابوون بۆ شەڕ و پەلاماری ئەسپیان دەدا، لەم شـەڕەدا لیدییـەكان سەركەوتن، كیمیرییەكان كشانەوە بەرەو لای خۆرهەڵات و تووشی شـەڕ بـوون لەگەڵ سوپای ئاشووردا، لەم شەڕەدا ئاشوور سـەركەوتن بەسـەریاندا، لیـدی پاش ئەو سەركەوتنە كەوتنە ئەوپەڕی دەستەڵاتداریی، لە زەمانی فەرمانڕەوای (الیات)دا ئەم پاشایە سنووری خۆرهەڵاتی لیـدی گەیانـدە ڕووبـاری هـالیس (قزل ایرماق)ی ئێستا كورشەكەی ئەو (كروزس كە هاوچەرخی كورشی گەورە بووە)، پایتەختەكەی خۆی باش ڕازاندەوە (سـارد) یۆنانییـەكان پێیـان دەوت (سارە زرین) شارستانییەتی لیدی گەشـتبوونە پلەیـەكی زۆر بـەرز. جێگـای

جوگرافیای ئـەم مەملەکەتـەی نێـوان بابـل و ئاشـوور لەلایەکـەوە، یۆنـانی لەلایەکی دیکەوە لەڕووی بازرگانی و سامانەوە زۆر لـە پەرەسـەندندا بـوون، زەوییەکی زۆر و بەپیتیان هەبووە و لەسەر دەریاش بوون.

دەوڵەتی لیدی لە شەڕ و یەکگرتن و هونەرمەندیدا زۆر پێشکەوتوو بـوون و لە یۆنانییەکانیان وەرگرتبوو، بۆ نموونە یەکەم سکە لەلید لێدراوە، ئەمەش داهێنانێکی تازە بوو.

## سنووری ماد:

بەلای خۆرئاواوە سنووری دیاری بوو، ڕووباری (هالیس یان قزل ایرمـاقی) ئێستا لـە لیـدی جیـادەکردەوە، بـەلای باشـووری خۆرئـاوادا لەگـەڵ بابلـدا سنووربوو، بەلای باکوورەوە مەملەکەتی وان، یان ئەرمەنستان هەرچەندە ئـەو کاتە پارچەیەك بوو لەم دەوڵەتە...

## استیاگ - اژدهاك:

ناوی ئەم شایە هیرودوت (استیاگس)ی نووسیوە. کتزیاس (استی گـاس)ی نووسیوە دەربارەی ناوی پاشاکانی ماد هەشت جەدوەل کەوتووەتە دەست پێـنج لایەن هیرو (وت و سیانیان) لەلایەن کتزیاسەوە.

لە سێ جەدوەلدا لەکۆی هەشت ناوی ئەم پاشایە (ئـەژدەهاك) نووسـراوە. نەیونید پاشای بابل ناوی ئەوی بە (ایـنج تورویگـو) نووسـیوە، بـەلای زۆرەوە (اژدەهاك)ە.

## ماریاس (Marayas):

مێژوونووسی ئەرمەنستان ناوی ئەوی بە (ئەشداهاك) نووسیوە. فەرمانڕەوای ئەو بەقسەی هیرودوت لە (٥٥٠-٥٨٠)پ.ز. بووە.

## شارەزوور و شارەزوورییەکان:

ساڵی (٦٣٥)ز هیرکل (هیرقل) لەم ساڵەدا لەکاتی سێیەم پەلاماریدا بۆ سەر فارس سەرانسەری مانگی شوبات لە شارەزووردا مایەوە، ئەم مانگە خەریکی سووتاندنی شار و دێهات و تێکدانی قەڵاکانی بوو.

شارەزوور لە هەمەدانەوە تا هەولێر پێی وتراوە شارەزوور. وا دەردەکەوێت پایتەختەکەی ئەم خورماڵەی ئێستا بووبێت، یان شاری بوبی (Bove) لە نزیکی عەربەت (گشت ڕیچ). ڕەشید یاسەمی لە کتێبی کوردا بە زمانی (فتوح البلدان)ەوە نووسیویەتی: شارەزوور لە ساڵی (٢٦)ی کۆچیدا بە دەستی عەتەبەی بن فرق السلمن، فەتح کراوە لە مێژووی (الکامل لأبن الأثیر)دا لە ساڵی (٢١)ك فەتح کراوە، یاسەمی بە زمانی (ابن الأثیر)ەوە دەڵێت: (عضد الدولەی دەیلەمییەوە لە ٣٦٩ ك لەشکرێکی نارده سەر شارەزوور بۆ ئەوەی داگیری بکەن).

هەروەها کاتی حمداللە ستەوفی و دەڵێت: بۆیە پێی وتراوە شارەزوور، چونکە شاری زۆر بووە. مستەوفی لە لاپەڕەی (١٠٧)ی کتێبەکەیدا دەڵێت: قوبادی - گوازی کوڕی ئەیروزی ساسانی لە ساڵی (٥٣١-٤٨٨)ی زاینیدا ئەم شارەی دروستکردووە. لە ساڵی (٣٤٠)ك ابو دلف، واتە (ابن المهلهل) باسی شارەزوور

دەکات کۆنتر و تا سەردەمی خۆی (ابن المهلهل) لە بەشی (٢٤)ەمی کتێبەکەی دەکاتە سەرباسی شارەزوور، دەڵێت: شارەزوور بریتییە لە چەند شار و دێهاتێك کە یەکێکە لەو شارە گەورانەی لە مەڵبەندی ناوچەکەیە، بەم شارە دەڵێن (نیم ئەزرای)، واتە نیوەی ڕێگا، خەڵکی ئەم شارە مل بۆ سوڵتان نادەن و لەم سەرکێشییەی خۆیان خۆشحاڵن. شارەکە لە دەشتاییدایە و خەڵکەکەی زۆر نەترس و چاوسوورن، هەمیشە بەرگریی لەخۆیان و ناوچەکەیان دەکەن، دەڵێت شورای شار (٨) گەز پانە، فەرمانڕەوا و سەرۆکەکانیان لە خۆیانن، ئەم شارە دووپشکی زۆرە، لەوانەیە ئینسان بکوژێت، خەڵکی شار لایەنگری (عومەری کورشی عەبدولعەزیزن) دەوروپشتی شار (دێهات)، لایەنگری شارن، ئەم لایەنگرییە ورەی خەڵکەکەی زۆر بەرزکردووەتەوە و مل بۆ خەلیفە نادەن، دەڵێت مەڵبەندی شارەزوور زستانە هەواری شەست هەزار کوردە لە کوردەکانی جەلالی و باسیانی و حەکەمی و سۆڵەیی، ئەم هۆزانە بە کشتوکاڵەوە خەریکن، دەڵێت: لە نزیکەی شاری نیم ئەزرای دوو کێو هەن بە ناوی (کێوی شەعران-شاران)ەوە، کێوی زەڵم، بۆیە بەم کێوە دەوترێت زەڵم، چونکە گیایەکی لێ دەڕوێت پێی دەڵێن (زەڵم) بۆ پیاوەتی باشە و لە هیچ کوێی دیکە نەمدیوە. دووبارە باسی دێیەك دەکات ناوی (دەیلەستان) بووە، نۆ فرسەخ لە نیم ئەزرای دوور بووە، گوایە کاتێك دەیلەمییەکان هاتوون بۆ جەردەیی لەم دێیەدا ماونەتەوە.

ابن المهلهل دەڵێت:

لە نزیکی شاری نیم ئەزرایەوە شـارێك هەیـە پێـی دەڵـێن پـیر (Peer) خەڵکەکەی لە ئازایەتیدا ناگەنە دەیلەمییەکان و شیعەی (زەیدین) ئەم شارە بووەتە کەلێن و پەناگای سەرکەشان، جارێکیان خـەڵکی شـاری نـیم ئـەزرای بەهۆی ئەم کارانە و دژایەتی ئاینییەوە پـەلاماریان بـردە سـەریان و تالآنیـان کردن، ئەم ڕووداوەش لە ساڵی (٣٤١)ك ڕوویداوە.

لە ناوەڕاستی شاری نیم ئەزرای و پیردا شـارێك هەیـە بـە نـاوی (دزدان)ە شێوەی خانووەکانیان وەك (پیروایـە) دەریاچـەیەکی تێدایـە و لـە شـارەکەش دەترازێت بۆ دەرەوەی شوورەی ئەم شارە ئەوەندە پان و پتـەوە ولآغـی بەسـەردا تێدەپەڕێت، ڕێگای خۆیان نەبێت ڕێگا بەهیچ کەس نادەن بچێتە ژوورەوە، بـە سەرۆکیان دەڵێن (ئەمیر)، گوایە ئەم شارە دارای کوڕی دارا دروستی کردووە.

ئەسکەندەر نەیتوانیوە داگیری بکات، هەروەها عەرەبەکانیش نـەیانتوانیوە بە شەڕ داگیری بکەن، پاشان خۆیان بوونەتە ئیسلام، دەڵێن ئەم شارە لە نەوەی (کالوتن)، سووریش لە لایەکەوە دەگاتە خانەقین چەمی تامرا (Tamara)، واتە سیروان دەکەوێتە نێوان ئەم شارە و خانەقینەوە.

## شەرەفنامەی دائیرەی مەعارف:

ئەم دوو سەرچاوە نووسـیویانە فەرمانڕەوایـەتی شـارەزوور لـە سـاڵەکانی (٤٠٠-٤٣٠)ك تا سەدەی شەشەمی ك. واتە تا سەردەمی (ابو المنصور) هەر بە دەست کوردەکانی حەسنەویەوە بووە، تێکڕا لە خانەدانی حەسـنەویە (١٠) کەس فەرمانڕەوای شارەزووریان کردووە. پاشان هەموو ناوچەکە کەوتووەتە ژێر

دەستی ئەتابەگە گەورەکان، ئەوە تا لە سەردەمی ژیانی یاقووتدا، واتە سالّی (١١٧٩-١٢٢٩)ز ئەتابەگەکان فەرمانڕەوا بوون، پاشان لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی ك. واتە لە سالّی (٦٩٠)ك بەملاوە فەرمانڕەوایی دەکەوێتە دەست خانەدانی ئەردەلاّنەوە.

(١٤٤٩-١٦٣٩)ز:

بەپێی پەیمانێك لەنێوان ئێران و تورکیادا ئەمدیوی کێوی هەورامان بەڕووی زەلّم و شارەزووردا بوو بە بەشی عوسمانی، شارەزوور کرا بە ویلایەتێك کە کەرکوك و ئەربیل و کۆی سنجاق و شارباژێڕ و حەریر و ڕەواندوز و زێی دەگرتەوە، فەرمانڕەوایانی لەلایەن عوسمانییەوە دادەنرا.

بیروڕای مێژوونووسان سەبارەت بە دروستبوونی شاری شارەزوور، یان شار و گوندەکانی مەلّبەندی شارەزوور. ابن المهلهل و یاقوت دەلّێن پایتەختی شارەزوور (نیم ئەزرای) ناوە، کەوتووەتە دەشتاییەوە، دوو کێوی زەلّم و شەعران، شارەزوور مەلّبەندێکە دەکەوێتە نێوان ئەربیل و هەمەدانەوە، وتمان وشەی نیم ئەزرا لەوێوە هاتووە کە شاری شارەزوور کەوتووەتە سەر نیوەی ڕێگای ئەیسەفون-مدائن و ئاتەشگەی شیز (Shez) دائیرەی مەعارف لە لاپەڕە (٤١٩)، ئەم ئاگرگەیە ئێستا بە ناوی تەختی سولێمان بەناوبانگە لە نزیك سەقزە، ڕەشید یاسەمی کارئاسانی جوگرافی و چیرکۆف (Cirkov) و هیزفیلد (Herzpelp) باوەڕان وایە کە نیم ئەزرا هەر گولّ عەنبەرە، واتە خورمالّی ئێستا (دائیرەی مەعارف ئیسلامی) بیروڕای ابن الفقیە لە (١٩٩)ی

دا و المستوفي له (١٠٧) لەسەر ئەوەن کە قوباد -گواز کوڕی فەیروزی ساسانی ئەم شارەی لەنێوان ساڵەکانی (٤٨٨-٥٢١)ز-دا دروستکردووە.

له تقويم البدان له لا(٤١٣)دا دەڵێت: ابن الحقول وتوویەتی شارەزوور شارێکی بچووکە، هەروەها دەڵێت: (مهلبي) وتوویەتی سنووری شارەزوور دەگاتە ولاتی مراغا، مراغاوا لەسەر ڕێگای مەهاباد و تەبریز و سەر بە تەبریزە. له شارەزوورەوە بۆ مراغا شەش فرەسەخ ڕێگایە ابن الهلهل و یاقوت و ابن الأثير دەڵێن جگە له شاری نیم ئەزرا ناوی چەند شارێکی تریش براوە، دەبێت له شارەزووردا بووبن وەك (دزدان)، پیر، دەیلەمستان، تیرانشاو قنا، ابن الأثير لەبارەی وێرانبوونی شارەکانی شارەزوورەوە دەڵێت: شارەزوور له سەردەمی خەلافەتی عومەردا له ساڵی (٢٢)ك فەتح کراوە، کوشتارێکی زۆری تیادا کراوە.

له ساڵی (٤٣٤)ك-یشدا ابو شوكی کوردی ئابلۆقەی دا و هەموو ئەو ناوەی سووتاند. له ساڵی (٦٢٣)ك دیسان بوومەلەرزەیەکی توند دای لە ناوچەکە و زیاتر له مانگێك درێژەی کێشا و زۆربەی زۆری قەڵا و شوورە و خانووبەرەکانی بەو بوومەلەرزەیە وێران بوون.

ڕیچ، له گەشتەکەیدا نووسیویەتی، دەڵێت: له کوردەکانم بیست دەیانوت شارەزووری کۆن له نزیکی قیزقەڵاوە بووە له خۆرهەڵاتی (ئیربت)وە، نووسەر دەڵێت: ناوی دزدان و ناوەی دزڵی لە یەك دەچن، ناوی شاری پیر دەبێت لەجێگای ئێستای دزڵیدا بووبێت، گوندێکیش هەیە بە ناوی (سەری پیر) لە هەورامان، ناوی پیرانی هەروامانیش لەم ناوەوە نزیکە.

ناوی (بانی شار) دێیەکە بەرامبەر بە خورماڵی ئێستا لە باکووری خۆرهەڵاتەوە ئەم ناوە و ناوی شاخی شەعران، یان شاران کە ابن المهلهل و یاقوت دەڵێن وا لە پشتی شارەزوورەوە زۆر نزیکن لە یەك.

ب) مینۆرسکی لە توێژهەڵدانەوەکەیدا بەسەر گەشتەکەی ابن المهلهل و چاپی فارسی (ل١١٧) بەشی (٢٦) زۆر بەشوێنی قەڵایەکەدا دەگەڕێت، کە لە مێژوودا ناوی هاتووە، بەسەر سیروانەوە بووە، لە ساڵی (٤٠٥)ك-(١٠١٧)ز لەلایەن حەسەن و حەیسورەوە گەرمارۆدراوە. ئەم قەڵایە قەڵای خەتین کوڕی ماسور بووە، لەم شارەدا کوژراوە، بەڵام مینۆرسکی نەیتوانیوە شوێنی ئەم قەڵایە بدۆزێتەوە و دیاری بکات.

ابن المهلهل: ابودلف لە ساڵی (٣٤١-٣٥٠)ك دیدەنی لە شارەزوور کردووە.

(لە دەورانی سەفەوی) لەکاتی فەرمانبەر (شا ئیسماعیل و شا تەهماسب و شا عەباس) بۆ خۆراسان کۆچ کراون، کۆچی مەزنی کورد بۆ خۆراسان کە باسی مێژووی ئێمە دەگرێتەوە، لە ساڵی (١٠٠٧)ك مانگی لە ناوچەی (خواروو ڕامین) لە نزیك ئاران ڕوو لە خۆراسان دەستی پێ کرد، چونکە ئۆزبەگەکان شاڵاوی مەغۆل لە کاتی فەرمانبەرایەتی (سوڵتان محەمەد باوکی شا عەباس) خۆراسانیان ڕەشەکوژی کردبوو و کاول و خاپوور بووبوو. هەروەها تا نزیك کاشان پێشڕەوییان کردبوو، شا عەباسیش کوردی بۆ خۆرهەڵاتی تاران هێنابوو، تا بەربەست لە ئۆزبەگەکان بگرن، بەگوێرەی سەرچاوەی مێژوویی لەو کاتەدا نزیکەی (٨٠٪) سوپای ئێران کورد بوون، چونکە تورکەکان

هەمان قزلباسپەکان بوون و ئامادەی شەڕ نەبوون لەگەڵ دوژمن. شا عـەباس (ئوغلد و بوداق خـان)ی کـوردی چـەگنی بـە فـەرمانڕەوای مەشـهەد دانـا، هەروەها کوردانی چەمشەگزگ بە ڕێبەری شاقولی سوڵتان و کـوردانی زیکـی ویلایەتی کرمان بە فەرمانـدەی گـەنج عـەلی خـان دوژمنیـان تـا ڕووبـاری (جەیحون) ڕاونا، ئەو کاتە بە فەرمانی شا عەباس کـوردانی چـەشمەگزگ بـە خۆراسان نیشتەجێ کران، کە ئەو نیشتەجێکردنە لە ساڵی (١٠٠٧)ی مانگی تـا سـاڵی (١٠١٠)ی مـانگی و درێـژەی کێشـا. کوردەکـان لـە ناوچـەکانی سنووری، بەتایبەتی لە (درون) یـان (درونگـە)، یـاخود (دەرگـەزی ئێسـتا) شوێنی فەرماندەی خۆیان دامەزراند و شـا عـەباس نازنـاوی (مـیری میرانـی خۆراسانی)دا بە شاقولی سوڵتان چەمشەگزگ بەخشی.

دوای ئەوە کوردەکان یەکەم شاری خۆیـان بـە نـاوی (شـیروان) بـە یـاد و بیرەوەریی (شیروانی قـەفقاز) و (شـیروانی کوردسـتانی عێـراق) و (شـیروانی یەکەمی لوڕستان دروستکرد). ناوچەی شیروان بـۆ فەرمانـدەی بچـووك بـوو، بۆیە (٥٥)کم بەرەو خۆرهەڵات ڕۆیشتن و لـە کـەناری شارۆچـکەی خەبوشـان پێگەی شەڕی خۆیان دروستکرد، کە بە گەرەکە کوردان ناسراو بوو، ئێستا بە (قۆچان) ناوبانگی دەرکردووە، لەڕووی سـەربازییەوە بایـەخێکی زۆر گرنگـی هەبووە، لە کۆتـایی دەورەی سـەفەوی دۆڵـی خـانی کـوردی شـا دلـو شـای (بجنورد)ی دروستکرد، کە ئێستا شارێکی گرنگی خۆراسانە، لەنێوانی ئاوایی ناوەندەکانی کوردانی میلانلو کە ئێسـتا بـە (ئەسـفەراین) ناسـراوە و تـاکو ئێستاش هەر کوردی تێدا دەژی.

له کۆتایی دەورانی قاجاری شاری سنووری (باژگیران)یـان بـاجگیران-یـان دروسـتکرد و (چـناران)یـش بـووە مەڵبەنـدی فەرمانـدەیی کـوردانی (زەعفەرانلو)، کە ئێستا شارێکی خنجیلانەی سەر بـە پارێزگـای مەشـهەدە، کوردەکانی شاری دەرگەزیان دروستکرد، چونکە پـێش هـاتنی ئـەمان شـاری (درون) بە تەواوی کاول کرابوو، لە زەمانی قاجارەکاندا لە ئاکـامی هێرشـی تورکمانەکان شاری دەرگەزێش خاپوور کرا، بـەگوێرەی بەڵگـە مێژووییـەکان نزیکەی (٤٥) چلوپێنج هەزار خێزانی کورد بەرەو خۆراسان کۆچ کـراون، کـە دەکاتە (٢٢٥٠٠٠) کەس دوایی لە کاتی شەڕەکانیاندا، بەتایبەتی لە کـاتی نادر شادا زەرەر و زیانێکی زۆریان لێکەوت.

دەربارەی نادر شا پێنج هەزار خێزانی کوردی لە خۆراسانەوە گوێزایەوە بـۆ سنووری عوسمانی و ئێران و لە ناوچەی (ئەرزروم) نیشتەجێ کـران. هـەروەها نزیکـەی دوو هـەزار خێزانـی کـوردی عومـەرانلو بـۆ ناوچـەی (گـەیلان) گواستەوە، تا ببنە بەربەستێك بۆ هاتنی ڕۆسەکان، تاوەکو ئێستاش پاشمـاوەی ئەو کوردانە لەو ناوچانەدا ماونەتەوە، نزیکەی (٦٠) گوندی کوردنشین هـەن و هەمووشیان بە زمان کوردی (شێوەی کرمانجی سـەروو) گفتوگـۆ دەکـەن و گۆڕانکارییان بەسەدا نەهاتووە.

دوای ئەوەش نارد شا هەندێ کوردی تری بۆ خۆراسان گوێزایەوە، کە بریتی بوون لە کوردانی (ئەردەڵان) کە بەشێوەی گۆرانی گفتوگۆ دەکەن و لە کەلاتی نادر نیشتەجێ کراون. لە خۆراساندا یەك ملیۆن کورد دەژی و نزیکەی هـەزار و شەشسـەد گونـدی کوردنیشـین هەیـە و لـە شـارەکانی (بجنـورد، جـاجرم،

سەبرزەوار، نەیشاپور، شیروان، قوچان، مەشـهەد، دەرگـەز و کـەلاتی نـادر)دا دەژین و شێوە زمانی هەمووشیان کرمـانجی سـەرووە، جگـە لەوانـەش پێـنج هەزار خێزان تاوەکو ئێسـتا هـەر بەشـێوەی کۆچـەری و چادرنشـینی دەژیـن، ئەمڕۆ گەورەترین مەڵبەندی کۆبوونەوەی کورد لە خۆراسان شاری مەشهدە.

(٧١٦پ.ز لـەم سـاڵەدا شـەڕ دەسـتی پـێ کـرد لـەنێوان مـاد و ئاشوورییەکاندا)، لە ئەنجامدا خاکی ماد وماننـا کـە نزیـك بـە دەریاچـەی ئورمییە بوون، کەوتـە بـەر تـالان و بگرەوبـەردەی ئاشـوورەوە، ئەمـەش لـە فەرمانڕەوای سارگونی دووەم بووە.

## دیوکا:

پاشای ماد لە ساڵی (٧١٥)پ.ز شـکا و پـاش سـاڵێك دیسـان سـارگۆن لەشکری هێناوەتەوە سەر ئەم ناوچانە و دیدکا بەردەوام هەوڵی دا و سەرلەنوێ تیرەکانی مادی یەکخستەوە و یەکی خستن و خۆی سەرکردەیان بووە. سـەرگۆن دژی ماد و ماننا وەستا، دیوك: بت دیوك ئاشوورییەکان وایان پـێ وتـووە بـە لەشکرەوە بەرەنگاری ئاشوورییەکان وەستا و لە ساڵی (٧١٣)پ.ز. هەندێ لە ناوچەکانی ماد ناچار کران ساڵانە باج و خەراج بدەن بە ئاشوورییەکان، لایوج دامەزرێنەری دەوڵەتی ماد و دروستکەری پایتەختی شاری ئەکباتان بوو.

هیرودوت و کتا سیاسی دوو مێژوونـاسی یۆنانی دەربارەی زنجیرەی حـوکمڕان و پاشاکانی ماد خیلافیان هەبووە، هەر یەکەیان بەجۆرێك باسی کردووە قسـە و نووسینی هیرودوت ڕاستە. لە (٧١٥)پ.ز یەکەم پادشای مـاد دیـوك پـاش ئەو فرائـورت (فـرورتیش)، خشـتریتی لـە سـاڵی (٦٥٣-٦٧٥) پ.ز بـووە،

داگیرکردنی ماد لە لایەن ئەسکیتەکانەوە لە دەوروبەری ساڵی (٦٥٣پ.ز-ەوە تا (٦٢٥)پ.ز بوو، واتە (٢٨) ساڵ.

**کیاکسار:** هوخستەر لە (٦٢٥) پ.ز تا (٥٨٥)پ.ز فەرمانڕەوا بووە.

ئاستاگ: ئایشتۆ ویگو لە (٥٥٠-٥٨٥) پ.ز. (٧٠٢)پ.ز سەنحاریب-(سنا خریب) جێنشینی سارگۆن لەو ساڵەدا بووە، بە لەشکرەوە بەرەو خۆرهەڵات کشا، لە عیلام تێپەڕی و لە جێگا دوورەکانی خاکی مادەوە پەڕییەوە زۆر شتی بۆ هات بە دیاری، کە بەناوی (خەراجەوە) بووە، دەڵێت: باجێکی زۆرم وەرگرت لە دانیشتووانی مادە دوورەکان، کە ئەوانە لە کاتی پاشاکانی باووباپیرمدا هەرگیز ناویان نەهاتووە، ئەوانە بوونە ژێردەستەی من، ئەو تیری شەڕیان لەگەڵ سەنحاریب کردووە، ناویان کاششیان، یان کاسیان بووە، لە سەدەی هەشتەمی پ.ز کیمیرییەکان و ئاسکیتەکان لە باکوور و ڕێگای خەڵکانی قەفقاسەوە هەڵسان، بە قسەی هیرودوت کیمیرییەکان لە دەشتەکانی خوارووی و ڕوسییەدا بوون، هەروەها دەڵێت: لە دەوروبەری دەریای ڕەش و ئازوف (Azof) دەژیان. هەندێکی دیکە لە کیمیرییەکان بەرەو فراکییە جوڵاون و پاشان بۆ بوسفور و لەکۆتاییدا سەریان لە ئاسیای بچووك هەڵداوە.

ئاشوورییەکان لەگەڵ ئەسکیتەکاندا یەکیان گرت دژی ماد. سەرکردەی ماد فرورتیش کوڕی دیوك بەشەڕهات لەگەڵیاندا و لە کاتی گەرمەی شەڕدا فرورتیش مردووە، کە ساڵی (٦٥٣)پ.ز دەکات. (ئەسکیت: سکای) دەها ساڵ خەریکی تاڵان و کوشتن و بڕینی خەڵکی سەر خاکی مادەکان بوون، بۆ

نـەجات بـوون و لـە دەسـتیان بەفیـد توانیویانـە بەڕیوایـەتێك -هوخشـتری کیاکسار کوڕی فرورتیش دەعوەتی کردووە بۆ سـەرکردەکانی ئەسـکیتەکان و سەرۆکیان ناوی (ماریا) بـووە، زۆر شـەرابی دەرخـواد داون، بەشـێوەیەك زۆر مەست بوون سـەر و پێـی خۆیانیـان نەناسـیوە، لـەم کاتـەدا هـەموویانیان کوشتووە.

مادەکان لەسەر تەرزی تازە و سـوودوەرگرتن لـە ئەسـکیتەکان لەشـکری خۆیان دامەزراند، پیادە، سواری و تیرهاویشتن و کەمانا.

لە ساڵی (٦١٦)پ.ز لەشکری ماد کەوتنە هێرش بۆ سەر خاکی ئاشوور. لە ساڵی (٦١٤) چواردەوری شاری نەینەوایان دا، لەم کاتەدا ئەسکیتەکان لە باکوورەوە لەگەڵ لەشکری ماد دا شەڕیان دەست پێ کرد، هەر لەم ساڵەدا بوو پەیمانێك بەسـترا لـەنێوان کیاکسـار و وەلی عەهـدی بابـل بـۆ پولاسـەر بـۆ بەتینکردنی ئەم پەیمانە کچی ئەستیاگ کوڕی کیاکسـار درا بـە کـوڕی نـابو پولاسەر.

لە ساڵی (٦١٢)پ.ز هەردوو سوپا لەژێر دیـواری نەینـەوادا کۆبوونـەوە، لەنێوان مانگی ژوئن و ئـاوت-دا سـێ شـەڕ ڕووی دا، پاشـان کیاکسـار لـە کۆتایی مانگی سێپتەمبەر گەڕایەوە بۆ سەر خاکی ماد.

لە ساڵی (٥٢٩-٥٥٩)پ.ز، کورش فەرمانڕەوای کردووە کورش کوڕی کەم بوجیە، دایکی کورش کچی (ایشتو ویکدیە)، (ئەسـتیاگ) تەمـەنی جـوانی کورش لە دەرباری ئەودا بوو و زۆر شت فێربووبوو ئەستیاگ-ی لابـرد و خـۆی بوو بە پاشا، باپیری خۆی لابرد کە دوا پاشای مادە.

٥٣٨ پ.ز، کورش بـابلی گـرت، ئـەو جولەکانـەی بـەدیل هێنرابـوو لـە فەرمانڕەوای نەبو خوزنەسردا هەموویان ئازاد کرد، هەروەها هەموو دیلەکانی فینقییە و جێگاکانی دیکە.

هیرودوت: دەڵێت لەشکری کـورش لەگـەڵ لەشـکری سـاگات، سـەر بـە ئەسکیتا بوون بە شەڕ هاتوون، لەم شـەڕەدا کـورش لەسـەر مـەرز کـوژراوە. مەزاری کورش لە نیشتمانی گرامیش لە پازارگاد بە خاك سپێردراوە.

## کەم بوجیە:

کورشی کورشە دوای باوکی بووە بە پاشای فپازی هێرش و گرتنی میسری هەبوو، ترسا لەوەی لە کاتی نەبوونیدا فەرمانڕەوایەتی بکەوێتە دەسـتی بـرا بچووکەکەی ناوی (بدیە) بوو، بەدزییـەوە کوشـتی و لـە سـاڵی (٥٢٦)پ.ز بەرەو میسر کشا. فانت (فانس) سەرۆکی سەربازانی یۆنانی بوو لـە میسـر و لەژێر فەرمانداری میسردا بوو، خیانەتی کرد و هەڵاتە ناو سـوپای ئێرانـەوە، دوو کوڕی لەوێ بەجێما، ڕێگای نیشانی سـوپای ئێـران دا کـە لـە بیابانـەوە هێرش بەرن. داد ئاماسیش پێش شەڕ هەڵات تاج و تـەختی فیرعـەون کەوتـە دەست پساتیخ (پسامتیکی سێیەم)، شەڕ لەنێوان هەردوو سوپادا ڕوویدا، لە میسر لە تەنیشت شاری بلوزیوم لە تەنگەی سوئز و کەناری دەریای ناوەڕاست بووە، دەورانی (شەڕکەرانی) ئێران و میسری پێش ئـەوەی دەسـت بکرێـت بـە شەڕ (دوو کوڕەکەی فانت) کە بـەجێمابوون، لەبـەر چـاوی لەشـکری ئێـران سەریان بڕین و خوێنەکەیان تێکەڵ بە شەراب کرد و خواردیانەوە، سـوێندیان

خوراد تا دوا دلۆپی خوێنیان شەڕ بکەن، پاش شــەڕێکی دوور و درێـژ ئێــران سەرکەوت و میسری گرت.

لە سالّی (٥٢٤)پ.ز کەم کەم هەواڵ دەگەیشتە میسر کە تیرەکــان یــاخی بوون لە ئێراندا و یەکێك پەیدا بووە خۆی بە برای کــەم بــوجی ناودەبـات کـە کوژرابوو، واتە (بەردیە)، ئەم کەســەش گئومــاتی مــوغ بــوو لــە میســریش هەراوهوریا پەیدابوو، کەم بوجیە بێبەزەییانە کەوتە کوشتن و بڕینی ئەوانــەی میسر، کە لەم کاتەدا کەم بوجیە مردووە، لەسەر مردنەکــەی زۆر گفتوگــۆی لەسەرە، هەندێك دەڵێن کوژراوە، هەندێکی دیکە دەڵێن لە ســواریدا گــلاوە و ڕانی بریندار بووە، پاش (٢٠) ڕۆژ مردووە. هەندێکی دیکە دەڵێن خۆی خــۆی کوشتووە، هەندێك دەڵێن مەشرووبی زۆری خواردووەتەوە و سورای ولاغ بــووە و کەوتووەتە خوارەوە و مردووە.

ئەوەی ڕاست بێت، کوشتوویانە، لەم کاتانەدا ماد سەربەخۆ بوو لە سوپای کەم بوجیە حەوت کەس کــە ســەرۆکی حــەوت تــیرەی ئێرانــی بــوون، لەوانــە (داریوش) توانی ببێتە پادشا لە خانەدانی هنمافشی بــووە. پــاش گەڕانــەوەی گئوماتی موغ-ی کوشتووە لە نووسینەکانی بێســتووندا باســی کــردووە، لــە زەمانی داریوشدا لە زۆر جێگا یاخیبوون ڕوویداوە. لە بابل، عیلام، سگارتا،.... هتد.

سکایەکان یاخی بوون (ئەسکوخا) سەرۆکی سکای و ماسگاتی بووە، لــە وێنەی بێستووندا دیــارە کلاوێکــی نووکتیــژی لەســەردایە، داریــوش تــوانی سەرکوتی هەموو هەڵسانەکان بکات، بەرەو میسر ڕۆیشت لــەوێش زۆر شــتی

دەوڵەتی ڕێکخست، لە ساڵێکدا نۆ شەڕی کردووە و نۆ پادشای گرتووە. توانی بە باشی فەرمانڕەوای سەرانسەری هەموو جێگا داگیرکراوەکان بکات و باجیان لێ وەرگرێت.

هیرودوت دەڵێت:

وڵاتی گەورەی داریوش بیست (اقلیم) بووە، لەڕووی ئیدارییەوە پێی وتراوە ساتراب نشین و هەر ناوچەیەو حاکمێکی هەبووە، بە زمانی فارسی کۆن پێیان وتوون خساترا پاوەن لەمانە بۆ نموونە: وەك ساتراپی میسر و بابل و... هتد.

هاتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ ئێران:

ئەسکەندەر کوڕی فلیب لە ساڵی (٣٥٦)پ.ز لەدایك بووە و لە ساڵی (٣٢٣)پ.ز مردووە لە تەمەنی (٣٣) ساڵیدا لە بابل.

لەشکری ئەسکەندەر (٣٠) هەزار پیادە و (٥) هەزار سوارە بووە. ئەرستۆ، فەیلەسوفی بەناوبانگی یۆنان، مامۆستای ئەسکەندەر بووە، لە بسفور پەڕییەوە و شەڕی لەگەڵ سوپای ئێران کرد و شکاندنی، شارەکانی ئاسیای بچووکی هەموو گرت، پاش ساڵێك دوای ئەوە سەرانسەری ئاسیای بچووکی خستە ژێر دەستییەوە، هاتە سوریا لە دەربەندی ئەیسوس لەشکری ئێران شەڕی لەگەڵدا کردن، ساڵی (٣٣٣)پ.ز لەشکری ئێران شکا. ماڵ و منداڵی شای ئێران کەوتە دەست ئەسکەندەر، داریوش کشایەوە بۆ بەشی خوارووی فورات، دوای ئەم شەڕە ئەسکەندەر بەرەو دیمشق کشا و گرتی، هەروەها شاری (سور)یش، شارەکانی فەلەستینیشی گرت. فینیقییە و سوریا هەموو بوونە پاڵپشت و باوەڕکردن بە یۆنانییەکان.

داریــوش داوای ڕێککــەوتنی لــە ئەســکەندەر کــرد کــە تــا فــورات بــۆ ئەسکەندەر بێت، ئەســکەندەر ڕازی نــەبوو، میســر بــەبێ شــەڕ تەسـلیم بــە ئەسکەندەر بوو، لەشکرێکیان لە نزیك شاری وێرانی نەینــەوا کۆبــووەوە، لــە ساڵی (٣٣١)پ.ز لە گوگاسل لەشکری ئێــران شــکا و داریــوش هــەڵات بــۆ خاکی ماد، لەشکری ئەســکەندەر بــەرەوخوار کشــان، بابــل و شوشــی گــرت بەشەڕ.

ئەسکەندەر لە شوشەوە جوڵا و بە شــەڕکردن دژی کێونشــینەکانی ئێــران، بەبێ شەڕ ئەســت خــەر (پرســپولیس)ی گــرت لــە ســاڵی (٣٣٠)پ.ز، کــە پایتەختی کۆنی ئێران و خەزێنــەی داریوشــی تێــدابووە، لــە وانەیــە (١٢٠) هەزار تالانت زێڕ بووبێ.

لە مــانگی ئــەبریلی (٣٣٠)پ.ز کشــا بــەدوای داریوشــدا، داریــوش لــە ساترابی باکتریا، باختەر، کوژرا.

لە بەهاری (٣٢٩)پ.ز. یۆنانییەکان لە ئاراخوسیاوە بەرەو باکوور کشــان، گەیشتنە ئامودەریا یان چەیحون، باکتریا (باختەر) کە خاکی ســەغدیان بــوو گرتیان، مەرکەندە= سەمەرقەند بووە مەرکەزی ئەسکەندەر.

لەشکری ئەسکەندەر بەرەو پاکسارت (سەیحون و سیر دەریا) ڕۆیشــت لــەو نقتەیدا شارێکی بەناوی ئەسکەندرییەوە دروستکرد.

ئەم خاڵە بە سەر و ڕیایەك بوو کە ئاسیای ناوەڕاستی بە چینەوە درێژە پێ دابوو، دوو ساڵێك لەو ناوە مایەوە، سەغدیان ئەوتیرانە بــوون کــە لــە دەواردا نیشتەجێ بوون کە ناویان (اسکیت-ماساگاتی یان ماساژی)، کــە هەمیشــە

هەرەشەیان لە سنوورەکان دەکرد، ئەسکیت (Aspeta) سەرۆکی تازای سەغیان بوو، زۆر شەڕیان لەگەڵ ئەسکەندەردا کردووە، لە ئەفسانەدا وا باسکراوە ئەمانە بەربەر، یان یاجوج و ماجوج- یان پێ وتوون، گوایە لەدوای دەرگای ئاسنەوە حەبس کراون کە ڕێگایان لە ناوچەی جەیحوونەوە لێ داخستوون.

لە بەهاری ساڵی (٣٢٧)پ.ز لەشکری ئەسکەندەر لەڕێگەی هندوگشی لە دەربەندی کابوڵەوە بە نیازی گرتنی هیندستان کشان لەڕووی سەندەوە ڕۆیشت لە ساڵی (٣٢٦)پ.ز.

لە ساڵی (٣٢٥)پ.ز لەشکری یۆنان و مەکدۆنی گەیشتە ئۆقیانووسی هیند، زەرەری زۆر لە لەشکرەکەی کەوت بەهۆی گەرما و تۆفان و بێ ئالیفەوە.

لە بەهاری ساڵی (٣٢٤)پ.ز لەشکرەکەی هاتەوە شوش و بابلی کردە پایتەختی خۆی، لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدا (١٣)ی ژوئنی ساڵی ٣٢٣پ.ز لە کۆشکی مجلل لە سەلاتینەکانی بابل کۆچی دوایی کردووە.

سکای کە لە ناوچەی سکستان-سیستان بە واتای خاکە سکایەکان، شەڕیان لەگەڵ مکرمەتی پارتدا کردووە، ئەمەش لە ساڵی (٢٣٩)پ.ز-دا بووە.

لە (٢٢٠-١٢٢)پ.ز حکومەتی پارت شەڕی لەگەڵ دەوڵەتی ماساگات کردووە و تێکی شکاندوون و لەکۆتاییدا هەموو ناوچەکان تا ڕۆخی سەیحون درێژەی هەبووە، کەوتە دەستیان.

فەرهاد شای پارتی نەیتوانی حوکمڕانی ئەو جێگایانە کە ماساگاتەکانی تیابوون لە نزیك دەریای خەزەر، سەیحون بووە مەرزی نێوان سکایەکان و پارتی، هەروەها سکستان بە پاشکۆی ئاراخوسیا کە دەربەندی ڕووباری هیرمەند لە دەستی چوو، لەم دوو جێگایە دەوڵەتی (ندو سکای) دروست بوو.
لە بەهاری ساڵی (١١٥)ز تراژان ئیمپراتۆریەتی ڕۆم لە دیجلە پەڕییەوە، توانی شاری (سلوکیە) تەرسەنوك بگرێت خەسرەو (اوسرو) پادشای پارت هەڵات و کچ و تەختی زێڕینی بەناوبانگی کەوتە دەست ڕۆمەکان تراژان، لە ساڵی (١١٦)ز بەناوبانگی تراژانی پارتی ناوبانگی دەرکرد.
تەخت و تاجی پادشاکانی پارت هەموو کەوتنە دەست سیاسونی ڕۆمی، بەڵام خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتی ئێران دژی ڕۆمەکان یەك بوون. تراژان لە ساڵی (١١٧)ز مرد.
ئێران ڕووداوی تازەی ڕوویدا، شۆڕش دەستی پێ کرد کە کار لەدەست پارتییەکان بسێنن، ئەم شۆڕشەش لە ساڵی (٢١٢)ز دژی شای شاهان بە سەرکردایەتی ئەردەشێر کوڕی پاپك لە خانەوادانی ناسراوی ساسانیان، ئەردەشێر پاشان، تەخت و تاجی پارتی کەوتە دەست و بووە شا، لەم کاتەدا هەموو توانای ئەشکانییەکانی ڕووخان، بلاشی پێنجەم لە ساڵی (٢٢٢ یان ٢٢٣)ز کوژرا و ئارتابان (ئەردەوان)ی پێنجەم لە ساڵی (٢٢٤)ز لە شەڕێکدا بە ئازایەتی کوژرا، کوڕەکەی ئارتاوازد زۆر نەمایەوە. تاج و تەختی ئێران کەوتە دەست خانەدانێکی تازە و لێهاتووی ئێرانی، واتە لە ساسانییەکان.

ڕووباری دیجله: له نووسینی میّخیدا سۆمەرییەکان نـاوی (ئادیگنـا)یـان وتووه. ادیگلا توم (idigal tum) یان ئەکادییەکان وایان پـێ وتـووه. یـان ادیگلات (Idiglat) لەدوای ئەو ناوەی دوایەوه ناوی دیجله هاتووه.

سەرچاوەی دیجله له بەرزاییەکانی تورکیاوه بەشـی خـوارووی خۆرهـەلاّت دروست دەبێت، لەچەند چەماوەیەك كه له بەرزاییەكانی نزیك به گـۆمی وان دەبێته ڕووباری (یونات سو)، هەندێك له شاخەكانی نزیـك گـۆمی كولچـك دەبێته ڕووباری (بوتسان سو) به یەكگرتنی ئەم دوو ڕووباره دەبێته ڕووبارێكی سەرەكی بەلای خـوارووی خۆرهەلاّتـدا دەڕژێتـه زەوی عێراقـەوه نزیـك شـاری فیشخابوور.

زابی گەوره: له نووسینه میّخییەكاندا به ناوی زابـو ایلـو (Zaboelo) هاتووه.

زابی بچـووك: لـه نووسـینه میّخییەكانـدا بـه نـاوی ترنـات اوردور دول (Tranat odor Dool).

## فورات:

بورانن (Buranun) یان بوروننا (Buranun) و به زمـانی ئەكـەدی پوراتی (Purati)، یان پوراتوم (Puratum) و به عەرەبی بووەته فورات، واتا ئاوی پاك. ڕووبەری ئاوی فورات و ئەوانەی تیّی دەڕژێت (٤٤٤٠٠٠)كم[٢] و دیجله (٣٤٠٠٠٠)كم چوارگۆشەیه.

## سەرچاوەی فورات:

له زنجیره چیاکانی خۆرهەڵاتی ئەنازۆڵەوە ڕووبارە بچووکەکانی یەك دەگـرن و دەبن بە دوو بەشەوە، فورات سو، کە بە دەشتایی ئەرزرۆم-دا دێـت و مـراد سو، کە یاڵەکانی ئەرمینیاوە دێت، ئەم دووانەش لە (کیبان مەعدەنی) یـەك دەگرن و دەبنە فورات.

## دیجلە و فورات-شەتی عەرەب:

لە عێراقدا لە فەلوجە لە یەکتر نزیك دەبنـەوە مـاوەی (٣٠کـم)، شـەتی عەرەب درێژایی (٢٠٤کم)، پانی (٤٠٠) مەترە لەلای شاری عەشـار دەبێتـە (١٥٠٠) مەتر لە کاتی تیاڕژانیان بۆ خلیج.

سەدەکان:

کراون بە چوار بەشەوە:

١- سەدەی بەردی کۆن، عصر الحجر القديم.

٢- سەدەی بەردی ناوەند، عصر الحجر المتوسط.

٣- سەدەی بەردی تازە، عصر الحجر الحديث.

٤- سەدەی بەردی کانزا، عصر الحجر المعدني.

لە سەدەی کۆندا ئادەمیزاد پەیدابووە، بوونەتە چوار بەشەوە، ئەوەی یەکەم مەیموونی ئادەمیزادی خوارد، جنوبی ئەمەش لە خوارووی خۆرهەڵاتی ئەفریقا پەیدا بووە، پێش (١٧٥٠٠٠٠) ساڵ چەشنی ئادەمیزاد و مەیموون کە دروست

بوو (بە ناوی ئادەمیزادی جاوە و ئادەمیزادی سین-صین)، کە پێش نیو ملیۆن ساڵ ژیاون.

سەدەی بەستەڵەک (عصر الجلیدی):

مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ (٥٥٠٠٠٠-٥٩٠٠٠٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر، کە ناسراوە بە گنز.

سەدەی دووەم: ناوی مەندل لەنێوان (٤٣٥٠٠٠-٣٧٥٠٠٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر.

سەدەی سێیەم: ناوی ڕس لەنێوان (١٨٥٠٠٠-٢٣٠٠٠٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر.

سەدەی چوارەم: ناوی مزم لەنێوان (١١٥٠٠٠-١٦٠٠٠٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر.

## سۆمەر:

خاوەنی نووسینی (هێڵی مێخی- مسماری. بەس نیشان نووسراوە Ki,EN.Gi لەنیوەی سەدەی ڕابردوودا سەدەی ١٩، توانرا نووسینی مسماری بخوێنرێتەوە لەلایەن هەندێ زانایانەوە).

## ئەکەد:

لە تیرەی جزرکان کە لە جزیرەی عەرەبەوە هاتوونەتە بەشی باکوور لە ناوچەی سۆمەرییەکاندا ژیاون.

## سۆمەر:

زۆر لە زاناکان هەریەکە لە ڕوویەکەوە بنەڕەتی ئەمانـە دادەنـێن کـە لـە کوێوە هاتوون. هەندێك دەڵێن بەسەر ئێراندا و لە خلیجی فارسەوە هاتوونەتە بەشی خواروو، بەهۆی دۆزینەوەی هەندێ شتی کۆن سۆمەرییەکان دەگەڕێنەوە بۆ پێش سێ هەزارساڵی پ.ز. ئەم شتە دۆزراوانە لەو شتە دۆزراوانـە دەکـات کە لە گۆمی دەربەندی (سەندە)وە دۆزراوەتەوە، ئەم شتانە وا دەرکـەوتووە کـە ئەمانە لە شاخەکانی خۆرهـەڵاتی ئێـران بـووبن پـێش ئـەوەی بێنـە بەشـی خوارووی وادی ڕافدین، دۆڵی دوو ڕووبارەکە.

## زنجیرەی سۆمەر:

دۆزینەوەی نووسینی هێڵی دەگەڕێتەوە بـۆ سـێ هـەزار سـاڵی پ.ز، کـە ناسراوە بە سەدەی مێژوویی (عصور التأريخية) و لـە (١٨٥٠- ٢٤٠٠) پ.ز. زانراوە بە زنجیرەی بەرەبەیانی سەدەیی، (عصور لجر السلالات).

مەلیك یەکەم جار لە ئاسمانەوە هاتووەتە خوار بۆ شاری ئاریدو نزیـك بـە ئور، پاشان لافاو هات زەوی هەموو داپۆشی و کەس نەما تەنها یەکێك نەبێت بەناوی زی و سـدرا (Zeusdra)، ئەمـەش لـە نووسـینی سـۆمەرییەکاندا وانووسراوە و لە نووسینی بابلییەکاندا بە ئاتوناپشتم (Atnabshtm) پێش لافاوەکە هەشت مەلیك فەرمانڕەواییان کردووە بەشێوەیەکی خەیاڵی نووسراوە گوایە ئەمانە (٢٤١٢٠٠) ساڵ بووە.

## دوای لافاو:

مەلیك كە لە ئاسمان هاتنە خوارەوە بۆ شاری كیش (تل الأحیصر) نزیك بابل لە زنجیرەی سۆمەرییە بەناوبانگەكان لە سەدەی زنجیرەی یەكەمی وەركادا كە ناوبانگیان زیاتر بە ناوی مەلیكەكانەوە بووە.

گەلگامێش لە سنووری (٢٧٠٠)پ.ز زنجیرەیەكی دیكەی سۆمەری فەرمانڕەواییان كردووە لەنێوان (٢٦٥٠)پ.ز. ئەمەش زنجیرەی یەكەمی (اورە)، لە گۆڕی مەلیكەكانیدا زۆر شت دۆزراونەتەوە، وەك: ئالْتوون، زیو، ملوانكە، فنجان، خەنجەر، كڵاو، بزماری دەرزی.

دیسان لە بەرەبەیانی سەدەی زنجیرەدا لە سنووری (٢٥٥٠)پ.ز دوو زنجیرەی دژ بەیەك بوون، ئەوەش لكش و اوما بووە، ئەم دووبەرەكییەش لەسەر ئەرز و ئاو بووە لە كۆتایی ئەم دووبەرەكییەدا یەكێك لە مەلیكەكانی زنجیرەی (اوما) ناوی (لوكال زاكیزی) زاڵ بووە بەسەر زنجیرەی لكشدا، پاشان بەسەر مەلیكەكانیشدا كە ناوی اورو انیمكینا لە هەندێ جێگا بەناوی اورو كاجینا هاتووە.

## لوكاڵ زاكتیری:

توانی وڵاتەكەی فراوان بكات و نازناوی مەلیكی سۆمەری لە خۆی نا، ئەم فراوانییە لە دەریای خوارەوە تا دەریای سەروو ڕۆیشت، واتە لە خلیجی عەرەبییەوە بەشی خواروو تا دەریای ناوەڕاست لە باكوور، (٢٩) فەرمانڕەوای كردووە لە ساڵی (٢٣٧١)پ.ز- (٢٤٠٠)پ.ز، پاشان فەرمانڕەوایی كەوتە دەست سەرۆكی جزرییەكان كە ناسراوە بە سەرجونی ئەكەدی.

## ئاکاد:

سەرجۆنی ئەکەدی توانی ویلایەتی شارەکان یەك بخات و دەستی گرت بەسەر هەموو وڵاتدا، ئیمپراتۆرییەتێکی فراوانی دروستکرد، کە ناسراوە بە ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی بەناوی شاری ئەکەدەوە. ئەکەد لە جزیرەوە هاتوون و سامین.

## سەرجۆنی ئەکەدی:

لە (٢٣١٦-٢٣٧١)پ.ز، بووە، وڵاتەکەی فراوان کردووە لە (٤٣) شەڕدا بەشداری کردووە، سەرجۆن بەرامبەر چوار سوپای یەکگرتووی ئێرانی بە سەرکردایەتی مەلیك (اوان) لە بەشی خوارووی خۆرئاوای ئێران پاش شەڕێکی قورس لەشکرەکە شکا و پاشاش کوژرا. هەروەها عیلامی گرت و فەرمانڕەوایەتییەکی خۆی تیادا دانابوو.

## نارام سین:

لە (٢٢٥٥-٢٢٩١)پ.ز. فەرمانڕەوا بووە، توانی دیاربەکر، خوارووی خۆرئاوای ئاسیای بچووك، خۆرئاوای وڵاتی ئاشوور، ناوچە شاخاوییەکانی خۆرهەڵات و بەشی خواروو تا عومان بگرێت. شەڕی لەگەڵ لۆلۆییەکاندا کردووە، ئەو سەرکەوتنەی لە بەردێك نووسراوە لە شاخی قەرەداغ لە بەشی خوارووی سلێمانی.

هەر بەم شێوەیە لە بەردێك کە نووسراوە بە ناوی (سەرکەوتن)، ئەمەش لە شاری شوش دۆزراوەتەوە لە عیلام، بەم شێوەیە مەلیکی ئەکاد کەوانێکی

بەدەستەوەیە لەگەڵ ڕمێکدا، کڵاوێکی شاخداری لەسەردایە بەسەر شاخێکی سەختدا سەردەکەوێت لەژێر پێیدا سەربازی دوژمنەکان کەوتوون.

نووسراوی بەردەکە سەرکەوتنی نارام سینە بەسەر شوێنی مەلیکی لۆلۆبییەکان، ئەم بەردە نووسراوە کەوتە دەست عیلامییەکان پاش ئەوەی سەرکەوتن بەسەر دوا فەرمانڕەوای کاشییەکاندا.

جگە لەوەی ناوی خۆی و نامەیەکی ئاکاد، درو لەقەبەکەی بۆ خۆی دانا مەلیکی چوارلای (شارکیران/ ربعیم) و مەلیکی جیهان شارکشتی. دوای مردنی خۆی کوڕەکەی بوو بە مەلیك.

مەلیك شارکلیشاری (Sharkleshare):

(٢٢٣٠-٢٢٥٤)پ.ز لەکاتی ئەمدا شەڕوشۆڕ زۆر بووە، بەتایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکاندا لەگەڵ لۆلۆبییەکاندا، دوا فەرمانڕەوای ئەمان بڕایەوە بە سەرکەوتنی گۆتییەکان لە ساڵی (٢١٢٠-٢٢١١)پ.ز ماوەی سەدەیەك فەرمانڕەوا بوون لە ئەکەد لەمانە مەلیکی بەناوباگیان کودیە (Kodya) بووە، کە ئازادیی سیاسی و تجاری و پەرستگای زۆری دروستکردووە.

لە ساڵی (٢١٢٠) پ.ز لە شاری وەرکا سەرکردەیەکی سۆمەری دەرکەوت بە ناوی (اتوهیگال) کە لە مێژوودا بە نەمریێ ناودەبرێت، توانی وڵاتەکەی لەدەست گۆتییەکان بسێنێتەوە، لە نووسراوە مسمارییەکاندا نووسراوە کە چۆن لەشکری گۆتی شکاند بە سەرکردایەتی تیرگان تەیکان (Trikan). زنجیرەی سەروند کات کە چۆن لە ساگروت شکان بە سەرکردایەتی تریکان (Trikan).

زنجیرەی سێیەمی (ودر): (٢٠٠٦-٢١١٣)پ.ز. کۆتایی بە فەرمانڕەوایی اوتوهیگالی وەرکا هات. دانانی زنجیرەیەکی تازە لە شاری اور کە ناسراوە بە زنجیرەی سێیەمێی اوور کە دادەنرێت بە دوا زنجرەی سۆمەری لە مێژوودا.

مەلیك اورنمو (Ornmoo) ٢٠٩٦-٢١١٣ پ.ز دامەزرێنەری ئەم زنجیرەیە و بەناوباگترین مەلیکیەتی و یەکەم دانانی قانوونە.

**شلکی (Shlke):**

کوڕی اورنموە ماوەی (٤٨) ساڵ فەرمانڕوایی کردووە، لە ساڵی (٢٠٩٥)پ.ز. ئەمەش شەڕی زۆری کردووە لەگەڵ تیرەکانی زاگرۆسدا و عیلامی داگیرکردووە. دوای ئەو سێ مەلیلکەی کە فەرمانڕەواییان کردووە دواییەکەیان مەلیك ابی سین (Abisin) بووە، کە (٥٤) ساڵ فەرمارڕەوایی کردووە لە ساڵی (٢٠٠٦-٢٠٢٩)پ.ز وا دادەنرێت کە دوا پاشا و کۆتایی زنجیرەی سۆمەرییە لە مێژوودا، لەلایەن هێرشی تیرەکانی اموری لە بەشی خۆرئاوا، هەروەها هێرشی میلامی لە خۆرهەڵاتەوە بووە هۆی ڕووخاندنی ئەم زنجیرەیە و مەلیکی سۆمەر بەدیل گیرا.

## سەدەی بابلی:

لە کۆتایی زنجیرەی اوردری سێیەم دەست پێ دەکات، لە سنووری ساڵی (٢٠٠٦)پ.ز، هەروەها کۆتایی زنجیرەی بابلی یەکەم تا سنووری (١٥٩٥)پ.ز. لەم ماوەیەدا شەپۆلێکی زمانی جزری لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا هەبووە کە زمانی جزریە، ئەمانەش ئامورییەکان بوون.

لە کۆتایی سەدەی بابلیدا خەڵکی سۆمەری و ئاموری بەلۆ (بالبوتقە ئەکەدی).

## دوو زنجیرەی ئایسن و لارسا:

پاش ڕووخاندنی زنجیرەی سێیەمی اوور لە ناوەڕاستی بەشی خوارووی عێراقدا، دوو زنجیرەی گرنگ کە پەیدابوون، ئەوانەش زنجیرەی ایسن ئیشان بحریاتی عەفەکی خوارووی ئێستایە، ناوی خۆی نا مەلیکی سۆمەر و ئەکەد، ئەم ناوبانگەش بۆ ئەوانەی دوای خۆی فەرمانڕەواییان کرد هەروا بوو، ماوەی (٣٢) ساڵ لە (١٩٨٥-٢١١٧)پ.ز دوای خۆی چوار فەرمانڕەوای دیکە بوون، ڕەوشتی خۆی بە ناوی خواوە دانابوو، دوای ئەم چوارە تەخت بووە هینی خێزانی دووەم.

## زنجیرەی دووەم:

لە شاری لارسا دروست بوو لە تل سنکەر (٣٠)کم لە دووری باکووری خۆرئاوای ناسریە لەلایەن مەلیك نبلانم (Nblanm) لە ساڵی (٢٠٠٥-٢٠٢٥)پ.ز خۆی ئاموری بوو.

لە ساڵی (١٧٩٣)پ.ز زنجیرەی ئای ئایسن ڕووخا لارسا مایەوە.

**حامورابی:**

له ساڵی (١٧٦٣)پ.ز لـه کاتێکـدا (٣٠) سـاڵ بـۆ فـەرمانڕەوای بابـل هەبووە، شەشەمین مەلیکی زنجیرەی یەکەمی بابل، شەڕ ڕوویدا لەنێوان بابل و زنجیرەی لارسا، حامورابی تـوانی سـەرکەوێت بەسـەر ڕیـم-سـن دا، ئەمـەش هەنگاوێکی گەورە بوو کە دەستی گرت بەسەر تەواوی وڵاتدا.

## وڵاتی ئشنونە:

زەوی ئـەم وڵاتـە دەکەوێتـە بەشـی بەغـدا و بەعقوبـەوە لـە ئێسـتادا، پایتەختەکەیان تل اسمر (اشنونە) بووە و هەندێ شاری کـەی وەك تـل حرمـل وەخەفاجی و تل الضباعي و شجالی یەکەم فەرمانڕەوای ایلشو-ایلیا بووە، لـە اشنونە لە سنووری ساڵی (٢٠٢٥)پ.ز و سەر بە ئایسن بـووە، پاشـان سـەر بەخۆبوون لەلایەن مەلیك (ابق اداد)ی یەکەمەوە، دوای خـۆی، کوڕەکـەی بـە ناوی (نارام-سین)ەوە وڵاتەکەی فراوان کرد و ناونیشـانی مـەلیکی ئاشـووری لەخۆی نا.

## زنجیرەی یەکەمی بابل:

دامەزرێنەری ئەم زنجیرەیە پیاوێکی ئاموری بەناوی (سومد ابم) لە سـاڵی (١٨٩٤)پ.ز-دا بووە و دیواری بۆ چواردەوری بابل دروستکردووە.

وڵاتەکەی فراوانکرد و توانی دەست بەسەر بورسا (بـرس نـەمرود) نزیـك بەحیلـە، هـەروەها بەسـەر ناوچـەی (فـەفر)دا بگرێـت، لـەم زنجیرەیـەدا بەناوبانگترین مەلیکیان حامورابی بووە کە شەشەم مەلیکیان بووە مـەعنای

ناوەکەی (الاّ لة حمو عظيم اومکثر) خوای پـارێزەری گـەورە ڕەنگـە ناویشـی عمورابی بێت و ماوەی (٤٢) ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، لە سـاڵی (١٧٥١-١٧٩٣)پ.ز ڕووبەری ولاّتەکەی زیاتر نەبوو لە تیرەی بازنەیەکی (٥٠) میلی.

یاساکانی حامورابی: لە ساڵی (١٧٧٠)پ.ز دایناوە، دەبێتە (١٠) بەش:

کوڕی حامورابییە و لە جێی باوکی بووە مەلیك، لە زەمانی ئەمدا شۆڕش لە لارساوە اور وە وەرلی و یاخی بوون لە هەندێ جێگـای دیکـە. لـەم کاتـەدا گۆتییەکان و کاشییەکان بە سەرۆکایەتی گاندیشی سەرۆکیان هێرشیان بـردە سەر بابل و سەرکەوتوو نەبوون، بۆیە کەوتنە (تغلغل)کردن لە ناوەوە.

ئەبی ایشـوخ (Abi Eshox) لـە سـاڵی (١٦٨٥-١٧١٢)پ.ز کـوڕی شمشو ایلونا پاش مردنی باوکی بووە فەرمانڕەوا، هەروەها فـوراتی ناوەڕاسـتی لەکیس چوو و ولاّتێکی تازەش لە عانە پەیدابوو.

جاری دووەم کاشییەکان کە پەلاماری دووەمیانە، توانییان ولاّتەکە بگـرن، ڕەنگە ساڵی (١٧٠٩)پ.ز، دوا مەلیکی زنجیرەی یەکەمی بابل شەبتو دیتانـا (Shmsho Ditana). لە ساڵی (١٥٩٨-١٦٢٩)پ. لـە شـتە نووسـراوە کۆنەکانی بابلدا دەربارەی لافـاو (تۆفـان) باسـکراوە، وەك ئووسـتورەکە پێـی دەڵێن لافاوی بابل کە پاڵەوانی ئەم لافاوە پیاوێکی داناو لێهاتوو بووە، کە ئەو گوایە ئادەمیزادی ڕزگارکرد لەو لافاوە، ناوی اپرحاسـیس (Asrakhasis) بەواتای (فائق الحکمة) سەرکەوتوو بووە لە زانیندا، کە خواکان ئەو لافاوەیـان ناردووە بۆ سەر زەوی کە سەرکەوتوویێت بۆ سەر ئادەمیزاد و نەیانهێڵێت.

## هاتنی فەرمانڕەوای کاشییەکان:

لە ساڵی (١١٥٧-١٥٩٥)پ.ز بووە. دەڵێن دوو جار کە هێرشیان هێناوە بۆ سەر بابل و سەرکەوتوو نەبوون لەکاتی شمشوایلوناوە (ئەبی ئاشوخ) پاشان لە عانەوە خۆیان نیشان داوە و کردووە بەهۆی ناردنی کرێکارانەوە بۆ بابل و فەرمانڕەوایەتییان لەکاتی فەرمانڕەوایی شمشوایلونا بووە، لەکاتێکدا نۆیەم ساڵی فەرمانڕەوایی بووە. ئەما لە سەرکەوتن و یەکەم ڕۆکیان -گاندیش بووە کە یەکەم مەلیکە.

لە مەلیکی کاشییەکان ئەگرۆمی دووەم (Agorme doom) کە یەکەم مەلیك بووە و هەموو ولاتی بابلی لەژێر دەستدا بووە، هەر ئەم بوو کە خوای مەردۆخ و ژنەکەی حشییەکان بردیبوویان بۆ عانە لەکاتی هێرشیاندا بۆ سەر بابل ئەم هێنانییەوە و بابل توانی ولاتی قەتەری بەحری بخاتەوە سەر بابل کە لەکاتی فەرمانڕەوایەتی شمشوایلونادا جیابووبوونەوە.

دوای ئەوە مەلیك کرندش (Krndsh) کە بەناوبانگ بووە لە ڕێکخستن و ئاوەدانی بابلدا، دواتر ئەو کوڕی کوریکالزومی یەکەم ( Korekalzoe Yakam ) هاتە سەر فەرمانڕەوایی و دروستکەری شاری ئیشایە. ناوی دورکوریل لزو (عقرقونی ئێستایە). دوای ئەویش کوڕەکەی چووە سەر فەرمانڕەوا کرشمان ئەتلیلی یەکەم (Keshman Anlele Yakam)، کە نامەی ناردووە بۆ فیرعەونی میسر (ئەمەنحوتبی سێیەم) کە خوشکی ئەمی مارەکردووە.

دوای ئــەو بورنابوریــاش (Bornaboreash)، ئــەمیش دۆســتایەتی هەبووە لەگەڵ ئەمەحوتب و کوڕەکەیـدا بـەناوی ئـەخناتوون، وڵاتــی ئاشـوور لەژێر فەرمانڕەوایی ئەمدا بـووە، پاشـان کچـی ئاشـوور ئەویلـەی یەکـەمی هێناوە، لەو کچە کوڕێکی هەبووە بە ناوی کدشمان نهـاربی دووەم، ئـەم کـوڕە چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی، زۆری پێ نەچوو کوژرا، باپیری یامەتی دان و براکەی دیکەی خستە سەر تەختی فەرمانڕەوا، بـەناوی کوریگـالزوی دووەم، یەکەم مەلیك بووە کە شەڕی کردووە لەگەڵ عیلامییەکاندا لەسـەر ڕووبـاری سیروان و لەشکری عیلامی شکاند و پایتەختی عیلامی گـرت کـە شووشـە، عیلامییەکان بە سەرۆکایەتی مەلیکیان شـوتروك ناخونتـە هێرشـیان کـردە سـەر ئاشـنوونەو و اوسـی (Oos) نزیـك تەیسـەفوون و دوور کوریگـالزو هەروەها هێرشیان کردە سەر سپارکە- پەیکـەری سـەرکەوتنی نـارام سـین و پەیکەری حامورابی لـێ بوو، بردیان و کوڕەکەی خۆی کردە مـەلیکی بابـل و بەم شێوەیە فەرمانڕەوای کاشییەکان تەواو بوو لە عێراقدا.

(کاشییەکان) خوای خۆیان هەبووە کە وەك خوای بابلییـەکان دایـان نـاوە وەك شیباك- بە مەردووخ و خاربی لانلیل و... هتد.

زەوییان داوە بە هەندێك کەس و بـەم شـێوەیە دەرەبـەگ لـە فـەرمانڕەوای کاشـییەکاندا پەیـدا بـوو، پاشـان ئـەم دەرەبەگییـە فـراوانتر بـوو لەلایـەن داگیرکەرانەوە وەك ئارامییەکان.

ئەوان ئەسپیان بردووەتە بابل بۆ سورای و عـارەبانە بەکارهێنراوە، بایەخیان بە ئەسپ داوە لەڕووی ڕەسەنی و ڕەگەزییەوە هەتا هەڵدانی باوباپیرانی ئەسپ.

## كاشییەکان:

فەرمانڕەوا بوون لە بابلدا بۆ ناوی زنجیرەی سێیەمی بابلییە و فەرمانڕەواییان زیاد لە چوار سەدە بووە.

لەساڵی (١٢٥٧-١٥٩٥)پ.ز عیلامییەکان جارێك هێرشیان بردووەتە سەر کاشییەکان، سەرکەوتوو نەبوون. جاری دووەم هێرشیان کردووە و فەرمانڕەوای کاشییەکانیان ڕووخاندووە لە سنووری (١١٥٧)پ.ز بووە، لەکاتی فەرمانڕەوای مەلیکی عیلامدا کودور-ناخۆمشی بووە، لەم هێرشەدا عیلامییەکان شاری بابلیان وێران کردووە لەگەڵ زۆر شاری دیکەدا تالأنێکی زۆریان بردووە، لەوانە پارچەی فەنی نایاب، وەك پەیکەری مەلیکی ئاکاد (مانشسۆسو) و پەیکەری کورەکەی (نارام-سین)، کە لەلایەن ئاسارناسەکانەوە ناسراوە بە پەیکەری سەرکەوتن، کە نیشانەی سەرکەوتنیەتی بەسەر تیرەکانی لولوبەم-دا، ئەمانە هەمووی عیلامییەکان بەتاڵان بردوویانە، هەروەها پارچەیەك لە قانوونەکانی حامورابی، ئەمانە هەمووی دۆزراونەتەوە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لەلایەن پشکنینەکانەوە-تنقیبات.

هەر چەندە کوردور-ناخونتی کوڕەکەی خۆی کردە فەرمانڕەوا لە بابل، یەکێك لە مەلیکەکانی کاشی بەناوی (ئەنلیلە-ئاون ئاخی) ماوەی سێ ساڵ بەربەرەکانی عیلامییەکانی کرد.

لەکاتی شیلاك-ئاشنو شناك لە ساڵی (١١٥٧)پ.ز بۆ جاری سێیەم عیلامییەکان پەلاماری بابلیان دا و ئەمجارە بتخانە و هەموو شتیان تێکوپێك دا و خوای گەورەی بابل-مەردۆخیان برد.

جاری یەکەم خوای بابل مەردۆخ ژنەکەی سربانیتم (Srbanitm) حشییەکان بردوویانە بۆ حانە-عانە و مەلیکی کاشییەکان ئاکومی دووەمی لە ساڵی (١٥٨٥-١٦٠٢)پ.ز هێنایەوە بۆ پەرستگای بابل بەناوی ئیساك-ئیلد.

(زنجیرەی چوارەمی بابل): زنجیرەی ئیسن پاش ساڵێك دوای داگیرکردنی بابل لەلایەن عیلامییەکانەوە ئەم زنجیرەیە اسنی دووەم پەیدات بوو، ئەمانە عیلامییەکانیان دەرپەڕاند، ئەم زنجیرەیە (١١) مەلیك فەرمانڕەواییان کردووە بۆ ماوەی سەدەیەك لە ساڵی (١٠٥٢-١١٥٦)پ.ز، بەناوبانگترین مەلیکیان چوارەم مەلیك بووە بەناوی نەبوخوز نەسری یەکەمەوە، وڵاتەکەی فراوان کرد و شەڕی لەگەڵ عیلامییەکاندا کردووە... مانای نەبوخوز نەسر (الا لە نبو یحمی زریتی) بەواتای خوای نەبو پارێزگاری زریەتەکانم بکات. ئەمەش لە ساڵی (١١٠٣-١١٢٤)پ.ز (٢١) بیستویەك ساڵ فەرمانڕەوای کردووە.

بیت: بە وشە یان زمانی بابلی وشەی بیت (Bitu) هاتووە بەمانای تیرە، یان عەشیرە. وشەی بیل بیت (belbit) بە مانای سەرۆکی تیرە.

## سەدەی ئاشووری:

لە سێ هەزار ساڵی پ.ز-دا لە ناوچەی باکووری عێراقدا بوون و هاوچەرخی سوبارتییەکان بوون. ئاشوورییەکان لە زنجیرەی ئەکەدی و بابلی و ئاموری و کلدانن، کە ئەم قەومانە لە چوار هەزارەی پ.ز هاتوونەتە عێراقەوە

له جزیرەی عەرەبییەوە... زمانیان زمانی ئەکەدی بووە، نووسینیان بە هێڵی-مسماری بووە، کە دەستکردی سۆمەرییەکانە. ئاشوور یەکەم شار و پایتەختی ئاشوورییەکان بووە کە بەو ناوەوە ناونراوە.

## هوری (Hoori):

ئەمانە لە بنەڕەتدا لە قەفقازەوە هاتوون بڵاوبوونەتەوە لە وڵاتی ئەنازۆڵ و سوریا و بەرزاییەکانی نێوان دوو ڕووبار و خۆرهەڵاتی وڵاتی ئاشوور، دەوڵەتێکی بەهێزیان دروستکرد بە ناوی میتانی (Mitani) و سوودیان وەرگرت لە ناکۆکی ناو ئیمپراتۆرییەتی حسییەکان و بێهێزییان و دابەشبوونیان، بۆیە نفوزیان زیادی کرد و هەموو ناوچەکانی نێوان گردی وان و تا ناوەڕاستی ڕووباری فورات، لەشاخەکانی زاگرۆسەوە تا ڕۆخی سوریا و وڵاتی ئاشووریش کەوتە ژێر دەستەڵاتیانەوە، لە نووسینەکانی ئاشووریدا ناوی هەندێك مەلیکیان هێناوە لە خۆیان بووە، یان لە میتانی کە لەژێر دەستەڵاتی میتانییەکاندا بوون.

## میتانییەکان:

نامە و پەیوەندییان هەبووە بە فیرعەونەکانی میسرەوە، ئەم شتانەش دۆزراونەتەوە لە جێگایەك بە ناوی (عەمارنە)وە لە میسر، نامەکانیش ناسراون بە نامەی عەمارنە. ئەم نامانەش نامەی مەلیکەکان بوون بە نووسینی هێڵی-مسماری و زمانی ئەکەدی بۆ یەکتریان نووسیوە، لەو نامانە،

نامــەی فــەرمانڕەوای حســییەکان و میتــانی و کاشــییەکان بــوون لەگــەڵ ئەخناتوون فیرعەونی میسردا، لــەو نووســینانەدا دەرکــەوتووە پەیوەنــدی زۆر بەتین هەبووە لەنێوان میسر و میتانییەکانــدا، میتــانی بوونەتــە دوو بــەش، یەکەمیان: لە ناوچەی گۆمی وان، دووەمیشیان: مانەوە لەسەر وڵاتی ئاشــوور و پارچەیەك لە سوریا. پاشان میتانییەکان وڵاتەکەیان تەســك بــووەوە تــەنها بوونە وڵاتێکی بچــووك لــە بەرزاییــەکانی ســەرووی نێــوان دوو ڕووبــار، لــە نووســینە مســمارییەکاندا هــاتووە، بــە نــاوی خــاتی گلبــات ( Khate Galbat)، پاشان ئاشوورییەکان ئەوانیان خستە ژێر دەســتەڵاتی خۆیانــەوە. ئەم ڕووداوانەش دەبێــت لــە ســاڵانی (١٣٣٠-١٣٣٠) لــەکاتی فــەرمانڕەوای مەلیکی ئاشوور، ئاشوور ئوباڵێت (Ashor Obal)دا بــووە، لــەم کاتــەدا پەیمانێکی بەهێز بەســترا لــەنێوان ئاشــوور و کاشــییەکاندا، کچــی ئاشــوور ئوباڵێت درا بە وەلی عەهدی کاشییەکان.

(شەلمان ســەری یەکــەم): (١٢٤٥-١٢٧٤)پ.ز هێرشــی کردووەتــە ســەر ئورارتو- ئەرمینیا و ناوچە شاخاوییەکانی وڵاتی خانی گلباتی میتانی خستە سەر وڵاتەکەی خۆی شاری کلنمو- نەمروودی دروستکرد و کردییە پایتــەختی خۆی.

توکلتی ننورتای یەکەم: (١٢٠٨-١٢٤٤)پ.ز ئــەمیش لەســەر ڕەوشــتی باوکی ڕۆیشت بۆ هێرشبردنە سەر وڵاتە دراوسێکانی و تەئمینکردنی ســنووری باکووری خۆرئاوا. یەکەم پاشایە کەوتە کۆچپێکردنی دانیشتووانی ناوچەکان و وڵاتەکان کە یاخی دەبوون بــۆ جێگایــەکی دیکــە. واتــە لــەو جێگایــەوە بــۆ

جێگایەکی دیکە دەیانگوێزانەوە. دوای خۆیشی ئەم گوێزانەوەیە بووە ڕسوومی مەلیکەکانی ئاشوور و لەسەری دەڕۆیشتن.

لە ساڵی (٦١٢)پ.ز سوپای ماد و بابل پاش سێ مانگ گەمارۆدانی شاری نەینەوا توانییان بیگرن، ئەمانیش کشانەوە بۆ حەران و لەوێ حکومەتێکی دیکەی ئاشوورییان دروستکرد لە ساڵی (٦١٠)پ.ز دیسان لەلایەن ماد و بابلەوە پەلاماردران و ئەمجارە بەئێجگاری لەناوچوون.

**نەبوخوز نەسر:**

بە واتای (نابو-کوردورو- اوصر) (الا لە نبو یحمی زریتی)، دەڵێت کچی پاشای مادی هێناوە. هەرچەند دەڵێن ناوی ئاموهین- ئاریتان-ئامیتان بووە. لە (١٥)ی مارتی ساڵی (٥٩٧)پ.ز نەبوخوز نەسر قودسی داگیرکردووە، مامی خۆی کردووە بە فەرمانڕەوا لەوێ ناوی (ماتینا) بوو کە ناوبراوە بە (صدیقا) لەم داگیرکردنەدا سێ هەزار کەسی هێناوە بۆ بابل لەگەڵ مەلیکەکەیان و خێزانەکەیدا مەلیکەکە ناوی یەهویاکین ( Yaho Yakin ) بووە و خزقیل پێغەمەر کە ئێستا گۆڕەکەی لە شاری کفل (Kfl)ە لە پارێزگاری بابل.

لە ساڵی (٥٨٥)پ.ز (صدیقا) هەڵگەڕایەوە لە نەبوخوز نەسر، لەشکری ناردە سەر قودس و داگیری کرد و (صدیقا) گیرا و (٥٠) هەزار کەسیش بەدیل گیرا و هێنای بۆ بابل.

لەنێوان (٢٦)ی ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ساڵی (٥٦٢)پ.ز. نەبوخوز نەسر مرد و چوار کوڕ و دوو کچی لەپاش بەجێماوە، دوای خۆی (ئەمیر

سەردوغ)ی کوڕی چووە جێگای، پاش چوونە سەر حوکمی یەهو یاکین کە فەرمانڕەوای یەهوزا بووە (نەرجال شار اوصر) چووە سەر فەرمانڕەوایەتی لە بابل، کە زاوای نەبو خوز نەسر بووە. لە (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٥٣٩)پ.ز کورش بابلی گرت و جولەکەکانی ئازاد کرد و گەڕانەوە بۆ قودس.

ئەسکەندەر، لەکاتێکدا شووشی گرت پایتەختی دارا لە خەزێنەکەیدا (٩٠٠) وەزنە ئاڵتوون -٢٧٠ تەن ئاڵتوون و (٤٠٠٠٠) وەزنە زیو کە (١٢٠٠) تەن زیوی گرتووە.

لە (١٠)ی حوزەیرانی ساڵی (٣٢٣)پ.ز ئەسکەندەری مەکدۆنی بە نەخۆشی سورێژە مردووە، نەخۆشییەکەی (١٠) ڕۆژی خایاندووە، پاش ڕاوێژکردن بڕیاریان دا لاشەکەی بسووتێنن و بیخەنە ناو ئاوەکەوە، وایان کرد.

دەفتەری ژمارە (٥)

## العراق في التأريخ و عێراق لە مێژوودا.

بەشداری ئەوانەی لەم دانەرەدا:

عێراقی کۆن-وەرزی یەکەم عێراق لە سەدەی پێش مێژوودا د.تەقی دەباغ.

وەرزی دووەم: سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکان: د. فازل عەبدولواحید عەلی.

وەرزی سێیەم: سەدەی بابلی کۆن: د. سامی سەعید ئەحمەد.

وەرزی چوارەم: زنجیرەی ئیسنی دووەم: د. فازل عەبدولواحید عەلی.

وەرزی پێنجەم: سەدەی ئاشووری: د. عامر سولەیمان.

لە لاپەڕە (١٩٢-٢١٦) نووسراوە.

(پرۆفیسور وایسباخ): ئەڵمانییە، لە ساڵی (١٨٦٥)ز لە شاری کارل مارکس لەدایك بووە، لە ساڵی (١٩٤٤) مردووە. دەربارەی کیرتییەکان و ماردین نووسیویەتی:

باسێکی لەسەر کاردۆخییەکان نووسیوە، بەتایبەتی دەربارەی گەڕانەوەی کسینوف لە ساڵی (٤٠١)پ.ز، کە لە کتێبی (ئاناباسیس) کە حەوت ڕۆژ بە ناوچەی کاردۆخییەکاندا تێپەڕیون، هەروەها دەربارەی بنەڕەتی کورد و پەیوەندی بە کاردۆخییەکانەوە، ئەمەش لە ساڵی (١٩١٩) نووسیویەتی.

فرانتس هیندرك وایسباخ:

## کاردۆخی:

گەلێك بوون لە سەرچاوەی دیجلە سنووریان لە باکوورەوە قوڵی گەورەی دیجلە بووە، کینتر یتیس (بوهتانی سو) ئێستا پاش ئەوەی دەرژایە دیجلەوە، سنووری خۆرئاوای ناوچەکە بووە. زۆری بەردی بەرز و پێچ و پەنای قوڵ و فراوانی ڕووبارەکە هیچ ڕێگایەکی لە تەنیشتەوە نەبووە.

ناوچەی کاردۆخییەکان کۆتایی دەهات لە بەشی خوارووی کۆتایی ناوچە بەرداوییەکانەوە نزیك بەری (مەنسوریەی) ئێستا، ئەمەش واتا بوهتانی ئەمڕۆ.

ئەغریقییەکان کاتی گەڕانەوەی دە هەزار کەسەکەیان بە سەرکردایەتی کسینوفۆن کاردۆخییەکانیان ناسیوە.

لە شەڕێکی سەخت و توندی کاردۆخییەکان بەرامبەر سوپای یۆنانی لەکاتی گەڕانەوەیاندا، تیروکەوانیان بەکارهێناوە، درێژی کەوانەکە سێ باڵ و

تیرەکەش دوو باڵ بووە، کە سپیی یۆنانییەکانی کون کردووە، لە هەندێك جێگای تەنگەبەریدا لەسەرەوە بە بەرد شەڕیان کردووە. کەوانەکانیان لەژێر پێی چەپیان داناوە لەکاتی شەڕدا و هێرشیاندا بۆ سەر دوژمن (سروودێکیان وتووە وەك گۆرانی). وڵاتەکەیان لەهەر چوارلاوە وڵاتی فارس بووە. د. جەمال ڕەشید لە هەمان باسدا لاپەڕە (٣٥٠). خالۆینتیس (Chalonitis) حەلوان لە سەدەی ئیسلامیدا دەڵێت: (شاری خانەقین و قەسری شیرین و سەپێڵ بووە- لە کۆنتردا بە فارسی پێیان وتووە (هەلبن). بە یۆنانی (حالبان)، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئارمان، یان (ئایالمان) لە نووسینەکانی ئەکەدیدا، ئەم ناوەش وردە وردە بە کوردی ئێستا پێی دەڵێن ئەڵوەن (Alwan).

لاپەڕە (٣٥٤) کسیسوپروس (Ksisosros) سۆمەریە لە تەورات و قورئاندا نوح پێغەمبەرە. لە لاپەڕە (٣٥٥) شاخی ئەیسر ئەو شاخەیە کە سەفینەکەی نوحی لێ گیرساوەتەوە دوای لافاوەکە بەپێی ئوستوورەی ئەکەدییەکان و پێیان وتووە شادکوتی، بەواتای شاخی گۆتی ئاشوور ناسیرپاڵ شەڕی کردووە و لەگەڵ لۆلۆییەکان لەو شاخەدا، لۆلۆییەکان پێیان وتووە کینبا (Keneba).

کینبا (Keneba): وشەیەکی کوردییە، بە واتای کانی با، چونکە پیرەمەگروون هەوای بەهێزی هەیە- ڕەشەبا، ئەمانە سەرکەوتوو بوون بۆ پارێزگاریی سەربەخۆییان. کسینوفۆن لە نووسینەکەیدا دەڵێت: لەلایەن فارسەوە هێرشکرایە سەر کاردۆخییەکان کە (١٢٠٠٠٠) کەس بووە، دواکەسیان کوشت و کەسیان لێ دەرنەکرد لەو سوپایە. لە ماوەی ئەو حەوت

ڕۆژەی شەڕدا سوپای یۆنانی زەرەری زیاتر کرد لە هەموو ئەو هێرشە درێژەی پێشتر کردبوویان.

بیرونووس: کاهینێکی کلدانییە لە بابل، لە سەدەی هێلین-دا کۆمەڵێك زانیاری لەسەر زنجیرەی مێژووی نێوان دوو ڕووبار نووسیوە، لە کۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی سێیەمی پ.ز بوو نووسینی مێخی دەربارەی لافاوەکە بیروسوس دەڵێت: سەفینەیەکە لەسەر شاخی نەیسر گیرسایەوە، نەیسر بە واتای- ڕزگاربوون بە وشەی ئەکەدی ئاشووری و بابلییەکان بەو ناوەوە ناویان بردووە، بە زمانی ناوخۆیی پێیان وتووە کینبا (Kiniba) لەگەڵ ئەوەشدا شاخە کاردۆخییەکان ئێستا کوردەکانی تیادا دەژین، لەگەڵ ئەوەشدا و لەسەر ڕاستی هارتمان و فولد کە هێناویانەتەوە، دوو ئەڵێی تێدایە، کارشی کۆن دەڵێت کاردۆخییەکان یەکن لەگەڵ کوردا. ئەسلافو بنەڕەتی کورد (کیرتی)ەکانە.

هاتمان هەواڵی ئاسیای جیهان- بەرگی دووەم (١٨٩٧) ل(٣٠) نولد کە المجلة التأبينية (هـ. کیرت ١٨٩٨ ل٣٣، هوبشمان –البحوث الهندو الجرمانية بەرگی ١٦، ١٩٠٤ ل٣٣٣ وایسباخ).

مارتن هارتمان (١٨٥١- ١٩٨٩)ز خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانیا، مامۆستای دانشگای بەرلین. شودو ڕونولد، کە لە هامبرغ لە ڕۆژی (١٨٣٦/٣/٢) لەدایك بووە، لە (١٩٣٠/١٢/٢٥) کۆچی دوایی کردووە، بەناوبانگترین خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانییە، بووەتە پرۆفیسۆر و لە ساڵی (١٨٦٨)ز زۆر شتی هەیە و مێژووی قورئانیشی هەیە.

## کوردستان:

لە ئاسیای خۆرئاوا کەوتووەتە بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، خاکی کوردستان لەنێوان ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا دابەشکراوە.

لە باکووری خۆرهەڵات، لوتکەی ئەراراتەوە خەتێکی ڕاست دەست پێ دەکات بەرەو خواروو بۆ بەشی خوارووی زاگرۆس و پشت کو دێتە خوارێ، لەوێوە خەتێکی ڕاست بۆ لای خۆرئاوا دەکێشین هەتا شاری موسڵ لە عێراق. لەوێشەوە خەتێکی ڕاست بۆ لای خۆرئاوا کە لە موسڵەوە دەگاتە بەشی تورکنشینی ویلایەتی ئەسکەندەروونە و لەو نوکتەوە خەتێك بۆلای باکووری خۆرهەڵات ڕادەکێشین، تا دەگاتە ئەرزروم لە تورکیا، پاشان لە ئەرزرومەوە خەتێك بەرەو خۆرهەڵات دێت تا دەگاتە لوتکەی ئارارات، بەو جۆرە پێوانەی کوردستان بەتێکڕایی دەگاتە نزیکەی (٤٠٩ر٦٥٠) کیلۆمەتری چوارگۆشە. بەم شێوەیەی خوارەوە:

(١٩٤ر٤٠٠)کم کەوتووەتە بەشی تورکیا.

(١٢٤ر٩٥٠)کم کەوتووەتە بەشی ئێران.

(٧٢٠٠٠)کم کەوتووەتە بەشی عێراق.

(١٨٠٠٠)کم کەوتووەتە بەشی سوریا.

درێژایی کوردستان لە باکوورەوە بۆ خوارەوە دەکاتە (١٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر. ڕادەی ناونجی پانتایی کوردستان لە بەشی خواروو (٢٠٠)کم. پاشان هەتا بەرەو باکوور بڕۆین زیاد دەکات، تا دەگاتە (٧٥٠کم$^{٢}$).

کوردستان کەوتووەتە نێوان (٣٠°-٤٠°) پانایی خۆرهەڵات و (٣٧°-٤٨°) درێژایی باکووری کوردستان وڵاتێکی شاخاوییە کە ئاو و هەواری جۆربەجۆری هەیە.

لە خۆرئاوای کوردستان کێوی توورس (Toros) و بانووی نێوان دوو رووبار جزیرە و کێوەکانی ماردینی خواروو، لە خۆرهەڵات زنجیرەی کێوی کوردستان کەوتووەتە نێوان گۆمی وان و گۆمی ورمێ، لە خوارووی خۆرئاوایش کێوی زاگرۆس هەیە. بەرزترین کێوی کوردستان ئاگری گەورە یانی ئەراراتی گەورەکەیە، بەرزیی (٥١٥٨م) پاش ئەو کێوی ڕەش کە لە مەڵبەندی جیلوداغ بەرزایی (٤١٦٨م) و ئاگری بچووک واتا ئاراراتی بچووک کە (٣٩٢٥م) بەرزە و (١٠٠٠) هەزار مەتر تا (١٥٠٠) مەتر لە دەریاوە بەرزە.

## ئاووهەوا:

ئاووهەوای پێدەشتەکانی کوردستان شێوەی ئیستواییە، چونکە ڕادەی باران لە ساڵدا لەنێوان (٢٠٠-٤٠٠) ملیمەتردایە، بەڵام لەو شوێنە نزمانەی کەوتوونەتە ناو زنجیرە کێوەکانەوە، ڕادەی ناونجی باران لە ساڵدا دەگاتە (٧٠٠-٢٠٠٠) ملیمەتر و هەندێ جار دەڕوات بۆ (٣٠٠٠) ملیمەتر، جیاوازی لەنێوان پلەی هەرە نزمی گەرما لە کورستاندا (٨٠) پلەیە.

## چەمەکانی کوردستان:

چەمی ئاراز سەرچاوەی بنیگو لە (٤٣٥)کم بـە کوردسـتاندا دەڕوات بـە سنووری نێوان ئێران و تورکیا و یەکێتیی سـۆفییەتدا تێدەپـەڕێت و دەڕژێتـە دەریای قەزوینەوە، درێژایی ئاراز دەگاتە (٩٢٠)کم.

### چەمی دیجلە:

لە نزیك گۆمی گول چووك لە ناوەڕاستی تووروسی خواروی خۆرهەڵاتی لە باکووری شاری دیاربەکر و مەدی، زیاتر لە (٦٠٠)کم بە کوردستاندا دەڕوات، کـە لـەوە (٤٥٠)کـم لـە کوردسـتانی تورکیـاوە زیـاتر لـە (١٥٠)کـم لـە کوردستانی عێراقدایە، هەموو درێژایی دیجلە (١٩٠٠)کم-ە.

### چەمی فورات:

ئەو کاتەی بە چـەمی قەرەسـوو ناودەبرێـت لـە (دوملوتەپـە) بـاکووری ئەرزروم سەرچاوە دەگرێت و (٤٦٠)کم درێژاییـەتی و سەرچـاوەی کەرتەکـەی تری کە پێی دەڵێن چەمی مراد و درێژاییەکەی (٦١٥کم) لە چـیای ئـالاداخ کە کەوتووەتە نێوان گۆمی وان و ئاگری هەڵدەقوڵێت، چەمی مراد و قەرەسوو لە باکووری خۆرئاوای شاری ئەلازبەگ یەکدەگرنەوە چەمی فورات پێك دەگەن، کە (٦٤٧)کم-ی دیکەش بە کوردستاندا دەڕوات.

### چەمی قزل ئوزون:

لە خواروی خۆرئاوای شاری دیواندەرە لە کوردستانی ئێرانەوە دێت بـە ناوچـەی زەنگنان و میانە و پاشان بە خوارووی شـاری ڕەشـت-دا تێدەپـەڕێت، لـەوێ پێـی دەڵێن (سفیدروود) دەڕژێتە دەریای قەزوینەوە.

## چەمەکانی تری کوردستان ئەمانەن:

زێی گەورە: (٤٥٠)کم درێژە، بە تورکیا و عێراقدا دەڕوات.

زێی بچووك: (٢٠٠)کم درێژە و هەردووکیان دەڕژێنە دیجلەوە.

چەمی پتیلیس و بۆتان: لە کوردستانی تورکیا.

چەمی سیروان: لە کوردستانی ئێران و عێراق.

گاماسیابە و جەغەتوو: (٢٤٠)کم و چەمی تەتەهو.

گولەکان: بەش باکووری خۆرهەلاتی کوردستان کەوتووەتە نێوان گۆمی وان و گۆمی وزەی.

گۆمی وان: مەوداکەی (٣٫٧٦٥) کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و ڕادەی تێکڕای قولاییەکەی (١٠٠) مەترە و (١١٢٠) مەتر لە ڕێکی دەریاوە بەرزە. لەبەر سوێریی هیچ زیندەوەرێکی تیادا ناژی.

گۆمی ورمێ:

کەوتووەتە خۆرهەلاتی شاری ورمێ و قەراخی خۆرئاوای، بەشێك لە سنووری خۆرهەلاتی کوردستانەوە درێژایی دەگاتە (١٣٠)کم پانی (٥٠)کم و پێوانەکەی بەگشتی (٦٠٠٠)کم چوارگۆشەیە و ڕادەی تێکڕای قولاییی (٦) مەترە و لە هەندێك شوێن دەگاتە (١٥) مەتر.

گۆمی خەزەر یان گۆمی چووك:

دەکەوێتە باکووری دیاربەکر لە نزیك سەرچاوەی دیجلە و (١١٥٥)م لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە.

گۆمی زریوار:

له مەڵبەندی سنه له نزیك مەریوان درێژایی (٥ر٤) چوار کیلۆمەتر و نیوه، پانی (٧ر١) یەك کیلۆمەتر و حەوتسەد مەتره. ڕادەی تێکڕای قوڵایی (١٥) مەتره.

بەیکوڵی:

بەیکوڵی زنجیره شاخی قەرەداغ دوای لوتکەی بەرزی زەرده دەربەندێکی تیا پەیدا بووه و پاشان شاخی گوڵانه درێژ دەبێتەوه تا سەری دێی بانیخێلان. هەر لەو جێگایەدا بەرەو گەرمیان دێیەك هەیه بەناوی دێی بەرکەل، ئەو جێگایه پێی دەڵێن (بتخانه)، که دێی پساکان بەو ناوەوەیه، بتەکان بووەته پساکان و (١٥)کم له خۆرئاوای دەربەندیخانەوەیه له شاخی گوڵان بەڕووی گەرمیاندا و نزیکه له توونی بابا عومەرەوە.

## پەیکوڵ:

پادشای نەرسی بووه له ساڵی (٢٩٣-٣٠١)ز، بەهرامی سێیەم پاشای ساسانی برازای نەرسی بووه، لای بردووه نەرسی خۆی بووه به پادشای ساسانی لەجێی ئەو. پادشایەکی دادپەرست بووه لەپێناوی ئەم سەرکەوتنەیدا بتخانەیەکی دروستکردووه له پەیکوڵ. نەرسی برای بەهرامی سێیەمه و کورشی بەهرامی دووەمه. پایتەختی له هاویندا له ئەستەخەر بووه له زستاندا لەمدائن-پەیکوڵی پایتلی به دوو زمانی پەهلەوی و ئەشکانی نووسراوه.

وشەی پەلکی: ناوی ئەو خانوو و بینایەیه که له بەرده نووسراوەکاندا نووسراوه.

## هینینگ:

زانای زمانزانی پەهلەوی، ئەو وشەی پلکی لێکداوەتەوە، بە بڕوای ئەو، وشەی پلکی بەواتای (میحراب)-(نهێنی پارێز) دێڕەکانی بنەوەی سەر بەردە نووسراوەکان درێژترن لە دێڕەکانی ژوورتر. بەم جۆرە دەرکەوت کە ئەو بینایە بورجێکە پێ پلیکانەی هەیە، یان (پەرسگایەك بووە). پرۆفیسۆر فرای زانای ئەمریکایی، لەسەر ئەم باوەڕەیە کە بەردە نووسینەکانی نەورسی لە پەلکۆڵی، دوو ناوەڕۆکی وەك یەکن وەکو زمانی پارتی و پارسیك نییە، بەڵکو وا پێدەچێت کە بریتی بێت لە دوو نووسراوەکە، ناوەڕۆکی پارسی میانەکەی ئەو بریتییە لە باسێکی گشتی لە ڕووداوە پەیوەندیدارەکان بە چۆنییەتی پادشایەتی نەرس و ناوەڕۆکی پارتییەکەی زووتر بریتییە لە لایەنگرانی نەرسی.

## هیرتسلن:

لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ناوەڕۆکی پارسی میانەکەی لەگەڵ وشەی (پلکی) بەم جۆرەیە: ئەوەیە بینای ڕازی نەداری خوداوەندگار نەرسی دروستکەری ئەوە، بەواتای فەرمانڕەوا، ئەو بەردنووسە گشتیترین بەردنووسەکانی پەهلەوییە. بەم جۆرە سەرچاوەیەکی دەستی یەکەمی، کە لە سێ بەشی، دوو بەشی لەناوچووە.

هەیکەلی نەرسی لە هەرچوار لای سەرەوەی ئەو بینایە هەبووە. کەمێك لە نووسینەکان لە دەوروبەری بورجەکە ماوە، لە ساڵی (١٨٦٨) زاینیدا بەهۆی

توماس ئینگلیزی هەندێك لەو نووسینانەی کە لە بەردەکان نووسراوە، بەشێوەیەکی وەرگێڕاو لە گۆڤاری ئەنجومەنی پادشایەتی ئاسیای لەندەن بلاوکراوەتەوە.

سەرچاوەی ئەو وەرگێڕانە نووسینێك بووە کە پێشتر ڕاویل لینسون لەو بەردەنووسانەی هەڵگرتبوو. بۆیە هەرتسلف لە ساڵی (١٩١١)ز چووە ئەو جێگایە، جاری دووەم لە ساڵی (١٩١٣)، بەوردی ئەو بەردانەی یەکخست و وێنەی گرتن. لە ساڵی (١٩١٤)ز باسێکی نووسی لەو نووسینانە و لە یاداشتەکانی ئەکادیمی بەرلین بلاوکرایەوە.

لە ساڵی (١٩٢٤)ز-دا ئەو نووسین و وێنانە لە دوو بەرگی گەورەدا چاپی کرد بە ئینگلیزی، هەروەها شی کردنەوە. لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا بریتییە لە نووسینەکان و وێنەکانی سەر بەردەکان. کارەکەی بەشێوەیەکی باش ڕێکخست لە بەردەنووسی پەیکولیدا بە دوو زمانی پەهلەوی و ئەشکانی و پەهلەوی ساسانی نووسراوە. باسی شەڕی خۆی لەگەڵ بەهرامی سێیەمدا کردووە و چۆنایەتی فەرمانبەرداری گەورەکان بۆ خۆی نووسیوە.

وەك دەنووسێت:

١- ئەو یاد بووە بنایە لە بغی خوداپەرست گەورە نەرسی شای ئێران و ئەنیران کە شێوەی خوداکانی هەیە، کوڕی بغی مەزداپەرست گەورە شاهپور شاهنشای ئێران و ئەنیران بووە.

٢- ئەمن شای ئەرمەنستان بووم... ئەو تێکشکا و بووە بەندەی ئەهریمەن و دیوان، هەموو ڕێگاکانی بەست بەجۆرێك نە ئێمە ڕێگایەکمان بوونە...

٣- بەرامبەر شازادەکان... ئەوجار گەورەکان ئازادیخوازان، پارسیان و پارتیان... کردبوونەوە لەسەر ئەمە ڕێککەوتن، کە وەڵامی داگیرکەر بەهرامی سێیەمی، بە چەك بدەنەوە.

٤- شاهپور ئەرگەبەز و نیرسی غابرای کوڕی ساسان و پابەك بیدەخش و ئەردەشێر هەزاربد وە ئەردەشێر سوورن و ئەسپەهبەدرە شەن وە...

٥- تەواوی شازادەکان و گەورەکان کە بێخوداکان، ئازادەکان و پارسیان و پارتیان کە لە دەرباری ئێمە بوون، بەهێزتر بوو لە پشتیوانی خودایان، بەهرەمەند بوون و بەهێزتر بوون لە پشتیوانی خودایان و بالویزهات.

٦- ئەرگیزان و ئازادەکان و بالویزهات تا بڵی شاهەنشای میهرەبان لە ئەرمەنستانەوە بەرەو ئێران شەهر دەچێت هەتا سەربەرزیی وڵات و تەختی خۆی وەیاد شایەتییەك کە لەلایەن ئەژدادا و خوداکانەوە پێیدراوە، وەری بگرێتەوە.

٧- ئێمە کە ئەو پەیامەمان بە ناوی ئاهورامەزداوە هەموو خوداکان و ئیزەت ئاناهیتا بەرەو ئێران شەهر چووبن، پاشان زۆر لەو فەرمانڕەوایانەی کە لە لایەنگری ئێمە بوون، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە پادشامان وەرگرتن.

٨- لەم شوێنە ئێمە ئەم (بینایەمان دروستکرد، پاشان شاپور ئەرگەبەز، شازادە پیرۆز، شازادە نیرسی کوڕی ساسان، پاپك بیدەخش، ئەردەشێر هەزاربد، ئەردەشێر سوورن، ئەردەشێر شەهر و بتهام شاپور... سەرگو بنخورکیشوەر و زوتکەرت میهرداد و هەموو شازادەکان، گەورەکان، ئازادەکان، کەیخوداکان،

شارەوانییەکان، سەرژمێرەکان لە (حەیان)[1] کۆبوونەوە، ئینجا ئەم بینایە دروستکرا.

کاتێك دوژمنەکانمان ویستیان کە ئێمە لە ئەرمەشتادەوە بەرەو ئێران شەهر چووین و لەو ڕووداوەدا تا ئاگاداربووین ئەو بۆ خۆی نامەیەکی بۆ ئازەر فەرانبرخ شای میشان نووسی و سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و داروودەستەی ئەویشی لەو کارە ئاگادار کرد، بەڵام نیرسی بەنۆرەی خۆی پەیامێکی بۆ شای میشان نارد و پێی ڕاگەیاند، کە شای ئەرمەنستان لەگەڵ ئەگەربەز و گەورەکان دەچێتە کۆشکی خۆی. (شیکردنەوە لەلایەن جاری دووەم پەیامێکی دیکەی بۆ شای میشان ناردووە بێ سوود بووە. هەروەها پەیامێکی بۆ بەرهام نارد و کە واز لە شەڕ بهێنێت. ئەم گەیشتە پایتەخت بێ شەڕ).

ئێمە تاجمان لەسەر شای میشان لابرد و لەسەر تەختی پادشایەتیش، دوای ماوەیەك سوپای ئەو تێکشکا و بۆ خۆیشی گیرا، ئەویان بەدەستبەستراویی هێنایە پایتەخت.

(شاپور... وەسییەتی کرد کە ئەو پادشای ئێران بێت، چونکە ئەو لەلایەن یەزدانەکانەوە لە ئێران شەهر... بەڕێزەوە فەرماندەی وڵاتی پێ درابوو، دوای شاپور شاهەنشاکان کە لە هەموان پیاوچاکتر و دادپەرستترو تێکۆشەرتر بوو) دوای ئەو (بەرنامەی بەڕێوەبردنی ئێران شەهر) لە بەردەنووسەکەدا

---

[1] حەیان: ڕەنگە ناوی ئەو کاتەی یان ئەو جێگەیە بووبێت مەرکەل -پەیکوڵی- بت خانەکە.

هاتووه. (شاهەنشا بەڵێنی دا کە سەرنج بداتە سەر بڵندیی و پێشکەوتنی ئێران بەم جۆرە) کە ئەژداری من شای هان ئەردەشێر بوو ئەو بەناوی خوداکانەوە سەربەرزیی دا بە هەموو وڵات، هیچ کەس لە وێنەی ئەو نەبوو.

ئەرکەبەز، شارەوانەکان، شازادەکان، گەورەکان، ئازادەکان، ئەم جۆرە پەیامانە و وەڵامانەیان بۆ ئێمە نارد.

کییەکەی هەتا ڕۆژی لێپرسینەوە، وڵات لەژێر فەرمانی تۆدا بێت و لە گەورەیی تۆدا ئەو وڵاتە لە خۆشی و شادیدا بێت...

هەموو شازادەکان، گەورەکان، ئازادەکان لە سەرانسەری پارێزگاکانی ئێران شەهرەوە هاتنە لای ئێمە، پارێزگارەکان بە وەفادارییانەوە بە شاهێتی ئێمە. بەردەنووسینەکە بەم دێڕانەوە کۆتایی دێت.

شارەوانییەکانی ئەوان هاتنە ژێر فەرمانی ئێمە -سەرانسەری وڵاتمان خستە سەر ڕێگایەکی نوێ، لەوانە هەندێکیان هاتنە بارەگای ئێمە و هەندێکی دیکەیان پیاویان ناردە لای ئێمە.

هەزار مێرد، ژمارە (٢)، ساڵی یەکەم، کانوونی یەکەم، ١٩٩٧:

شوێنەواری پەیکوڵی... نووسینەکانی هاوار ئەنوەر.

پەیکوڵی دەربڕینی ڕێگای شوێنەوارەکەی لەسەرە، بەرزاییەکەی (١٧٠٠) پێیە. ڕێگای گشتی عەشیرەتی جاف بووە، لەوانەشە ڕێگای مێژووی بوێت لە وڵاتی بابلەوە بۆ دەشتی شارەزوور.

ناوی پەیکوڵی، یاوەکو پەیکوڵە، بەو دڕکە دەوترێت لە زەوی بەرز نابێتەوە... دڕکەکان بەقەد و نوکێکی بچووکە و چەند سوچە.

تۆفیــق وەهبــی ڕای وایــە، پــەیکوڵی وشــەیەکی ئارییــە و لەوانەیــە لەپەیکەرەوە هاتبێـت، مێژوونووسـی گـەورە عەبـدولڕەزاق حەسـەن هـەمان بۆچوون لە کتێبەکەیدا دووبارە دەکاتــەوە، خـەڵکی نارچـەکەش پێـی دەڵـێن بتخانە.

لەگەڵ ئەو بۆچـوونەدا نـیم... لەوانەیـە نـاوی پـەیکوڵی ببەینـەوە سـەر پەیکەڵە، پاکەڵە، باکەرە... لەوە دەچێت ئەو دەربەندە هەردەم شوێنی ڕەشەبای زۆر بووبێت.

یەکەم ئەورووپییەك ناوی ئـەو قوڵـە دێرینـەی پـەیکوڵی هێنـاوە (ج، ب، مزیزەرە) لەو بڕگەیەدا هاتووە کە لە (١)ی تشـرینی دووەمـی (١٨٣٤) لـە باسی شارەزووردا تۆماری کردووە، کە دۆڵی پیاوێکی بەتەمەن پێی گوتم: لـە شوێنێك لـەم دەشـتەدا بتخانەیـەك یـاوەکو پەرسـگایەك هەیـە کـە بـەردی نووسراوی تیادایە و کەس ناتوانێت بیانخوێنێتەوە.

(ڕاوڵ تسن): باسی ئەو بتخانەیەی کردووە لە ساڵی (١٨٣٦) پاش هەشت ساڵ دیدەنی شـوێنەوارەکەی کـردووە. وەسـفێکی کـورتی شـوێنەوارەکەی لـە گۆڤاری (الجمعية الأسيوية الملكية)دا لە ساڵی (١٨٦٨) لەسەر نووسینەکانی پەیکوڵی، بڵاوکردووەتــەوە، هـەروەها (ئەنـدریاس)یـش لەسـەر نەخشـەکەی نووسـیوە و سـەرنجی زاناکـانی بـۆلای ڕاکێشـاوە. ئـەورووپی دووەم (ئەرنسـت هێرزفیلـد)ی زانـای ئاسـەواری گـەورەی ئـەڵمانیای لەسـەری نووسـیوە. دوو گەشتی خێرای لـە سـاڵی (١٩١١)و (١٩١٣) تۆمـار کـردووە. توانیویـەتی گەلێك وێنە و زانیاری لەسەر بەردەنووسراوەکانی پەیکوڵی وەربگرێت.

جاری سێیەم ساڵی (١٩٢٣)ز لە ماوەی هەشت ڕۆژدا کارەکانی بەجێهێناوە. ژمارەی بەردە نووسراوەکان (١٣٠) بەرد بووە، سەرئەنجامی زانیارییەکانی لەگەڵ وێنەی زۆردا کە لەسەر نەخشی پەیکوڵی کۆی کردبوونەوە، لە دوو بەرگی گەورەدا و لەگەڵ پێشەکییەك و وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی و قسەکردن لەسەریان و دانانی پەراوێز بۆ بابەتەکانی، بڵاوی کردەوە. کتێبەکەی پڕە لە زانیاری بەنرخ.

## لە کتێبخانە بەناوبانگەکانی جیهان:

کتێبخانەی ئەسکەندەرییە لە میسر، کە لە مێژووی ئیسلام و ئێراندا بەناوبانگە، چەندەها زانا و نووسەری بەناوبانگ پەرتوکیان لەوێدا هەبووە، بزانین کێ دایناوە و چۆن لەناوچوو.

لە کۆندا لەلایەن داگیرکەرانەوە سووتاندنی پەرتوك، یان شتنەوەی بە ئاو، کتێبخانە شتێکی ئاسایی بووە، بەڵکو بەپێویستیان زانیوە، لە مێژوودا چەندەها شتی وا ڕوویان داوە، کە جانەوەرانەن، بۆ نموونە: ئیمپراتۆر تئودوسوس لە ساڵی (٣٨٩)زا-دا لەنێوان لەناوبردنی پەرستگاکانی میسردا، لەوانە پەرستگای (سرابەیسوم) ئەسکەندەرییە بوو، بەشی زۆری پەرتوك و نووسین و پاشماوەی زۆر بەنرخی پەرستگاکەی لەناوبرد.

عەبدوڵڵا کورشی تایەر: کە خۆی فەرمانڕەوای ئێران بوو، بەرامبەر پەرتوکە فارسییەکان و پەهلەوی ئێرانی، هەروای کردووە لە ساڵی (٢١٣)ك

(٨٢٨)ز. سولّتان مەحمودی غەزنەوی بەرامبەر بە بتخانە و پەرتوكخانەی پەرستگاكانی هیند هەروای كردووە.

**هۆلاكۆ خانی مەغۆل:**

پاش ئەوەی بە ڕێنمونی و هاندانی خواجە نەسرەدین توسی چووە سەر بەغداد و معتصم باللە-ی پێچا لە لبادەوە سالّی (٦٥٦ك/ ١٢٥٥ز) لە ڕۆژێكدا فەرمانی دا هەرچی پەرتوكی زانین و زانا و زانایی و ئەدەبی هەیە لە گەنجینە و پەرتوكخانەكانی عەباسیدا، چییان كۆكردووەتەوە، بەتایبەتی مەئمون، كە زۆر بایەخی بەوە داوە، هەمووی بخەنە ناو دیجلەوە، ئەوەش كە قەبە و زل بوو كردیانە ئاخوڕی ئەسپ، پاش ئەوە بە سەد سالّ، كردەوەی ئەمیر محەمەد مزەفەر، هەر بەو جۆرەی كرد، كە لەسەریان نووسیوە، ئەوەش لە سالّی (٧٦٠ك/١٣٥٩ز).

سولّتان سەعیدی مبارزالدین محەمەد كوڕی فزەفەر یەزدی لە دەورانی مەمالیك كە سەر بەو بوو لە ناوچەی فارس و كرمان و یەزد و ئەسفەهان، سی و چوار هەزار پەرتوكی فەلسەفەی لە ماوەی ئەو دوو سالّەدا بەئاو شۆردەوە.

ئەوروپاییەكان (سەلیبەكان) خاچەكان، لە شەڕەكانی شام و فەلەستین و پاش ئەوەی دەستیان گەیشتە تەرابلّس و پەرتوكخانەكەی بە فەرمانی فەرماندەی خۆی (كنت براتران دوسانژە) پەرتوكخانەكەیان سووتاند، هەمان كردەوەی ئیسپانییەكان پاش ئەوەی ئیسپانیایان لە دەست ئیسلامەكان سەندەوە بەرامبەر بە پەرتوكخانەكانی ئەندەلوس وایان كرد.

**پەرتوكخانەی ئەسكەندەرییە:**

ئەسكەندەری مەكدۆنی لە ساڵی (٣٢٣)پ.ز بەهۆی یادی جەژنی سەركەوتنییەوە، مرد، كوڕەكەی كرا بە جێنشینی ئەو، چونكە منداڵ بوو. سەركردەكانی ئەو هەریەكە لایەكی بۆ خۆی ڕاكێشا و دەستی بەسەردا گرت.

ئێرن بۆ بەشی سلوكی، میسر بووە بەشی (بەتلیموس لاگوس)، كە ئەو دامەزرێنەری زنجیرەی تالسەی میسرە. ئەسكەندەرییە لە چەرخی بەتالیسەدا بووە جێگای هونەر و زانین و لاگۆس لەم شارەدا پەرتوكخانەیەك و مۆزەخانەیەكی دروستكرد، كە شاعیر و نووسەرەكان ڕوویان تێ دەكرد.

(مان تون) مێژوونووسی میسری، لەو كاتانەدا بوو كە مێژووی میسری بە زمانی یۆنانی نووسیوە. لەكاتی فەرمانڕەوای لاگوس بەشێكی زۆری مێژوونووسان و نووسەرانی یۆنانی هاتوونەتە میسر و كەوتوونەتە نووسین، لە نزیكەكانی لاگوس، زانای یۆنانی بە ناوی (دیمتری والیروس) بووە، كە مێژوونووسانی عەرەب ئەم وشەیە بە (زمیره)یان نووسیوە، ئەم كابرایە بە فەرمانی پادشا، پەرتوكخانەی ئەسكەندەرییەی دروستكرد و بەزۆری دەیەها هەزار بەشە پەرتوكی بەرزی باشی دانا.

بەتلیموسی دووەم كە بە فیلادلفوسی بەناوبانگ بووە (لەو ڕووەوە كە خوشكی خۆی هێناوە) بە نازناوی (خواهردوست)- خوشك دەستگیران، كەوتە كڕینی پەرتوكی زۆر بەنرخ و بێ هاوتا لە هەموو جیهاندا، بەم شێوەیە ئەو پەرتوكخانەیە لە فەرمانڕەوایی بەتالیسەدا زۆر فراوان بوو، تا نزیكی لەدایكبوونی مەسیح، ژمارەی پەرتوكەكانی لە سەد هەزار زیاتر بووە.

بەهۆی کیلوباترەوە پەیوەندی ئەو بە ژولیوس کە لە میسردا بوو لە ساڵی (٤٧)پ.ز جەماوەرەکە چوونە سەریان و ئەوانیش بۆ دەربازبوونیان ئاگریان بەردایە کەشتییەکەی، بۆ ئەوەی دووکەڵ بەرچاوی خەڵکەکە بگرێت و دەربازبن، بەم شێوەیە توانییان دەرباز بن، ئاگر وردە وردە گەیشتە کۆشکی شا و پەرتوکخانەکەش بەر ئاگر کەوت، خەڵکەکە هەندێك لە پەرتوکەکانیان ڕزگار کرد و بەشێکی زۆر زۆریش سووتا بەهۆی ڕابواردنی قەرالیچە کیلوباترە لەگەڵ بێگانەدا.

ئەم پەرتوکخانەیە وەك وتمان هەمووی لەناو نەچوو، لەکاتێکدا شارستانییەتی مەسیحی لە میسردا فەرمانڕەوا بووە، شارستانییەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی (هاتووەتە میسرەوە)، وردە وردە پەرتوکخانەی ئەسکەندەرییە ناوبانگی جارانی پەیدا کردەوە، پەرتوکی تازە و بەنرخیان بۆ کڕی، سەر لەنوێ و دیسان ئەم پەرتوکخانە گەورەیە، لەکاتی ئیمراتۆر تئودوسیوسی مەسیحی لەکاتی لەناوبردنی پەرستگاکانی میسردا، پەرتوکەکانیش سووتان.

لەکاتی کیلوباترە و سووتانی پەرتوکخانە، بەشێك لەو پەرتوکە زۆر بەنرخانە، کە لە سووتان ڕزگاربوون، برانە پەرستگای سەراپیوم، ئەوانەش هەر ئەو پەرتوکانە بوون کە لە ساڵی (٣٨٩)ز بەدەستی تئودوسیوس سووتێنران.

دوو جار پەرتوکخانەی ئەسکەندەرییە سووتاوە و دیسان سەر لەنوێ تازەکراوەتەوە، هەتا هاتنی عەرەب و ئیسلام بۆ میسر دیسان سەرەی

سووتاندنی پەرتوك هاتەوە (ابـن قفطـي) قـازی و مێژووناسـی میسـری لـە پەرتوكێكدا بەناوی (تراجم الحكما) دەنووسێت: (پیاوێك بەناوی یەحیا نەحوی لە میسر و ئەسكەندەرییەدا ژیاوە و بە فەیلەسوفێكی ئەو ولاتە دەژمێردرا).

پاش ئەوەی میسر بە دەستی عمرو كوڕی عاص گیرایەوە فەرمانی عومرو، ئەو كەسە خۆی لە عمرو نزیك كردەوە، عمرو عاص پیاوێكی تێگەیشتوو بوو، بۆیە قسەی یەحیای لا پەسەند بوو، بەتایبەتی فەلسەفەی.

ڕۆژێك یەحیا نەحوی بە عمرو عاصر وت، ئـەمڕۆ شـار و دێهـاتی میسـر لەژێر دەستی ئێوەدایە، شتێك هەیە كە بـۆ ئێـوەی عـەرەب زۆر بەكەڵكـە و ئێوەش خاوەنی ئەوەن، هەندێك شت هەیە كە بە كەڵكی ئێـوە نایـەت ئەگـەر بیان گەڕێننەوە بۆ خاوەنەكانیان زۆر باشترە، عمرو پرسیاری لێكرد مەبسـەتت چییە؟ یەحیا وتی:

لـە گەنجینـەی فەرمانڕەواییـدا پـەرتوكی فەلسـەفە و زانیـاری هەیـە و مۆركراوە و كەس دەستی بۆ نەبردووە، فـەرمان بـدە ئـەو پەرتوكانـە بدەنـەوە دەست بەڕێوەبەرایەتی زانیاری.

**عمرو پاش ئەوەی مێژووی ئەو پەرتوكخانەیەی لە یەحیا بیست، وتی من ناتوانم هیچ بكەم تا فەرمانم لە خەلیفەوە بۆ نەیەت، نامەیەكی بـۆ عومـەر نووسی و ئەوەشی بۆ باسكرد.**

فەرمانی عومەر گەیشت و بەم جۆرە بوو: (واما الكتب التي ذكرتها، فأن كان ما فيها يوافق كتاب الله ففي كتاب الله غنى عنـه، وان كـان مـا فيهـا يخالف كتاب الله تعالى فلا حاجة اليهـا... فتقـدم بأعـدامها)، عمـرو عـاص

فەرمانی دا کە هەموو ئەو پەرتوکانــە بەسـەر گـەرماوەکانی شـاردا دابـەش بکەن، ابن قفطي، لـە کۆتاییــدا دەنووسـێت: (هـەموو گـەرماوەکانی شـاری ئەسکەندەرییە بۆ ماوەی شەش مانگ بە ئاگری ئەو کتێبانـە گـەرم دەکـرا)، ئەم وتەیە دیارە موبالەغەی ئەدەبییە و پیشاندەری گەورەیی کارەساتەکەیە.

با بێینەوە سەر قسەی خۆمان، ئەو پەرتوکانــە کـە بـە خـوێنی جگـەر و هەزار دەردی سەری و ناخۆشی لە پێست، یان لە بـەرگ، یـان هـەر شـتێکی دیکەی ئەوکاتانە دەنووسران، زۆر بە ئاسانی هەموویان سووتاند.

مێژوونووسێك کە بەناوی (ابو فرح ملت) لە پەرتوکێکدا کە بـە زمـانی سریانی نووسراوە، بە ناوی (مختصر تأريخ الدول) لـە عەرەبییــەوە وەرگێـڕاوە، دەڵێت: دەربارەی گەرماوەکان هەر بەو شـێوەیە گـەرم کـراوە، جـۆرج زەیـدان، مێژوونووسی بەناوبانگی میسر لە پەرتوکی (تأريخ تمون اسلامی)دا دەڵێـت: قسـەی عەبـدول لـەتیفی بەغـدادی کـە چـووەتە میسـر، لەلایـەن ئـەوەوە نووسیویەتی ئەو کۆڵەکانە کە مارن و هینی ڕابردوون لە ئەسـکەندەرییە، وا دەگەیەنێت کاتی خۆی خانوو بووە، زۆر گـەورەش بـووە، جـوانیی و گـەورەیی هەیوانــەکانی، جێگــای گفتوگـۆی هاوەڵــەکانی ئەرسـتۆ بـووە، لەوێشــدا پەرتوکخانەیەك هەبووە کە لـە هێرشـی عەرەبەکانـدا بـە دەسـتووری عمـرو عاصـی و فـەرمانی عومـەر کـوڕی خـەتاب سـووتێنراوە. ئەمـە هـەمووی بەسەرهاتی پەرتوکخانەی ئەسکەندرەییە بووە.

لەکاتی هێرشی عەرەب بۆ سەر ئێران دیسان پەرتوکخانە و پەرتوکـەکان هەروایان بەسەردا هاتووە، ئیبن خەلدون بە دڵگرانییەوە دەربارەی لەناوچوونی

پەرتوکی زانیاری و فەلسەفی و باوەڕی ئێران نووسیویەتی: (این علوم فارس التدامر عمر رضي الله عنه سمحوها عند الفتح)، کوا زانینەکانی فارس کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت بڕیاری لەناوبردنی دا).

ئەمە یەکێکە کە دژی سووتاندنی پەرتوك و پەرتوکخانە بووە، کە بە فەرمانی عومەر کراوە. باسێکی دیکەی زۆر سەیرتر لە فەرمانڕەوایی شا عەباسی سەفەویدا لە ساڵی (٩٩٨-١٥٩٠)ز. ئۆزبکەکان موسڵمان بوون، سوڵتانەکانیان بە ناوی عوسمان و محەمەد و عەبدوڵڵا عوبیداللە شەیبانی) ناویان هەبووە، هەر لەو کاتانەدا کە دەستیان بەسەر مەشهەد-دا گرتووە، بە قسەی خاوەن مێژوو، هەرچی هەبوو لە زێڕ و زیوی بەنرخ لەسەر گۆڕەکان و هەرچی هەبوو هەموویان تالآن کرد و هەزارەها پەرتوك و قورئان و تەفسیریان خستە ناو ئاوەوە و شۆردرانەوە، گوایە ئەمانە پەرتوکی شیعەن و بەشێکی زۆری ئەو پەرتوکانەیان خستە ناو سەراوی شاهییەوە، هەموویان سڕانەوە، واتە شۆرانەوە.

تێبینی:

لە نامەکەی عەمرودا کە بۆ عومەری نووسیوە، دەڵێت: شاری ئەسکەندەرییە چوار هەزار گەرماو، چل هەزار جولەکەی تێدایە (معجم البلدان) چۆن چوار هەزار گەرماو بۆ ماوەی شەش مانگ بەو پەرتوکانەی پەرتوکخانە گەرم کراون، یان دەبێت بڵێین هەریەکێك لەو پەرتوکانە لە هەزار پەڕە کەمتر نەبووە، یان باوەڕ دەکەین کە خەڵکی ئەسکەندەرییە هەر شەش

مانگ جار دەچنە گەرماو و شەش مانگ جارێك گەرماوەكان گەرم دەكرێن، ئەگینا ئەم قسەیە بۆ ئەوانەی خاوەن مێژوون رێی تێ ناچێت.

(ژن كاروباری تیرەیی بەڕێوە دەبرد)، هەروەها ئیشوكاری دین و پارێزگاریكردنی خوێنی تیرە لە لایەن ژنەوە پارێزگاری یەكە، وردە وردە كۆمەڵ كەوتنە دروستكردنی كشتوكاڵ لە پێدەشتەكاندا و ئاووهەوای خۆش كرد دەتوانین بڵێین پێش پێنج هەزار ساڵ پێش زانین بووە. كۆنترین جێگایەك كە مرۆڤ تیا ژیاوە لە پێدەشتەكاندا (سیلك) بووە نزیك كاشان لە باشووری تارانەوە كە دۆزینەوەی جێگای مرۆڤی سەرەتایی لە گردۆڵكەیەكی خۆڵ دەستكردا بووە، خانوویان لە سەرەتاوە وەك لەژێرداردا وەیان سوكە بەرزایی و سەریان گرتووە، هەر بەردەوام ڕاویان كردووە، لەگەڵ كردنی كشتوكاڵ و بەخێوكردنی ماڵیكردنی ماڵیاتی كێوی، وەكو كردنەوەی خواردەمەنی، گۆڕینی گۆزەی ڕەشی دووكەلاوی بە گۆزەی سوری باشی لەناو ئاگردا سورەوەكراو، لەم كاتانەدا گۆزەگەری تا ڕادەیەك جێگای خۆی گرت، گۆزە و دیزە و دەفری ئاوخواردنەوە بەشێوەیەكی باش دروست دەكرا و وێنەی تیا دەكرا بەهێڵی سەربەرەو خوار و سەر بەرەو ژوور و لابەلا، هەر لەو كاتانەدا تیغ لە بەرد بووە تەنانەت داریش، ژن و پیاو پەیوەندییان بەیەكەوە بەستووە و خۆیان ڕێكوپێك و ئارایش كردووە، وەك ملوانكە لە سەدەف و موستیلە، بازن، دەستەوانە، خاڵ كوتاندن و وێنە دروستكردن لەسەری ئاسك و كەروێشك. مردووەكانیان دەپێچایەوە لە نزیك خۆیانەوە دەیان شاردەوە گوایە بۆ گیانی مردووەكە لە خواردندا لەگەڵیاندا بەشدارە، مرۆڤی ئەو كاتە باوەڕی وابووە

پاش مردن -بەشێوەی پێشوو زیندوو دەبێتەوە، ئێسقانی مرۆڤ کە دۆزراوەتـەوە لە کۆنترین جێگادا نیشانەی یەك بنەڕەتی -ڕەگەز نیشان دەدات، ئەو بەشـەی کە پێش مێژوو لە ئاسیای خۆرئاوادا لە دەریای ڕۆمەوە تا تورکستانی ڕوسـیا و دۆڵی سەند، بلاوبوونەتەوە، ئەمانـەش بـەناوی ئاسـیانی نـاوبراون، گـرنگ ئەوەیە ئەم بەشە ئادەمیزادەن نە لە سامی و نە لە هیندۆئەورووپین، هەندێ لە زانایان پێشتر، ئەم نەژادە بە قەفقازی یان خەزەری وەیـان یافسـی (Yafse) ناویان بردوون. لەم نەژادە سێ دەستە ناسراون:

١- ئورارتییەکان یان وانیان، دانیشتووانی کـۆنی ئەرمەنسـتان، کاسـی، ئیلامی، خەتیان هیتی، میتانی.

٢- لیکی، کاری، میسیی، ئاتروسکی، ئاقریتشی.

٣- ئایبری، باسکان.

ئەمانە هـەموو بـە یـەك زمـان دواون، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە سۆمەرییەکان لەو نەژادەن، کە زۆر لە کۆنەوە لەوان جیابوونەتەوە، ئەمانـەش هونەری خۆیان هەبووە، وا دەردەکەوێت کە پەیوەندییان بە ئاسیای خۆرئـاواوە هەبووە، بەپێی ئەو سواڵەت و گۆزە و دیزە کۆنانەی ئێرانـەوە، ئـەوە ئێـرانیش بەشێك بووە لە یەکێك لەو بەشانە.

دەربارەی دینی ئێرانی لەکۆندا، بەپێی زانینی ئێمە، نیشتەجێی نێوان دوو ڕووبار لەکۆندا کە تەنها سۆمەرییەکان بوون، لە هەمان ڕەگەزی دانیشتووانی خاکی ئێران بوون، باوەڕیان وابووە ژیان لەلایەن خواوە بـووە، جیهـان لەلایـەن ئەوانەوە سك پڕبـووە، نـەك بـۆ زایـن و سەرچـاوەی ژیانـەوە بـە پێچـەوانەی

میسرییەکانەوە بووە، مێ بووە نەك نێر، هەندێك پەیکەری بچووکمان دۆزیوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ پێش مێژوو کە (خوای چەشنی- ربە النوعي)، ئەمانەش پێش مێژووی ئێران دروستکراوە، ئەوە وامان پێ دەڵێت کە مرۆڤی دانیشتووی ئێران پێش مێژووی ئێران ئەو جۆرە باوەڕەیان هەبووە.

ڕەنگە ئەو (ربە النوع)ە کە خوابووە، ژنیشی هەبووبێت لەگەڵ منداڵدا، وە مێردیش، ئەم باوەڕە سەرەتاییە کە بڵێین باوەڕی ژنهێنان لەنێوان برا و خوشکدا بووە، ئەم کارە لە خۆرئاوای ئاسیادا باو بووە، ناو ئێرانی و پاشان نبطي، دیسان شوکردنی دایك بە کوڕ کەمتر بووە، ئەمەش دیسان لە هەمان ئاینەوە هاتووە، ئەمەش بێ هۆ نییە کە دایك لەناو هەندێ میللەتدا سەرکردەی سوپا بووە، لەوانە لەنێوان گوتی کێونشینی ناوچەکانی کوردستان بوون.

## ئێران لە هەزارەی سێیەمی پ.ز:

لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پ.ز دەشتی نێوان دوو ڕووبار، چووە ناو مێژووەوە، پاشان ئیسلامیش بەزوویی چووە ناو ئەو مێژووەوە، ئەو میللەتەی لە دیالە و شاخەکاندا نیشتەجێ بوون، لەگەڵ خەڵکی سۆمەر و قەومی سامی نەژاددا لەنێوان دوو ڕووباردا، بەردەوام پەیوەندییان هەبووە، ئەمانە بریتی بوون لە ئیلام، کاسی، لۆلۆیی، گوتی، ئەمانە هەموو یەك نەژادبوون، زمانیان وەك یەك بووە، هێرشکردنیان بۆ نێوان دوو ڕووبار وای لێکردن بە مەجبوری کە لەکاتێکدا یەکگرتوو بوون، هەرچەندە ئەو یەکگرتنە کاتیی بووە، پێشتر بەردەوام لە بەردەم هێرشی ئەوانەی نێوان دوو ڕووباردا بوون.

ئیلام له شاخ و دەشتی سەوزیانا (شـوش) لـە بـاکوور و خۆرهەڵاتییـەوە بووە، بەو شاخانە چـواردەورە درابـوو، لـە چـارەکی سـێ هـەزار سـاڵەی پ.ز زنجیرەیەکیان دروستکرد، کـە لـە ناوچـەیەکی زۆر فراوانـی دەشـت و شـاخ و بەشێکی گرنگی لە ڕۆخی کەنداوی فارس و بۆشەهر، فەرمانڕەوایان کـردووە، نووسینێك دۆزراوەتەوە کە هینی یەکێك لە پاشاکان خۆیان و ئـەو سـەردەمە بووە، بە زمانی سۆمەری نووسراوە، هەرچەند ئیلام خۆیـان نووسـینی خۆیـان هەبووە لەگەڵ ئەوەشدا نووسینی دراوسێکەشیان بـەکارهێناوە، هـەتا زمـانی سۆمەریشیان بەکارهێناوە.

(پاش ئەوەی زنجیرەی سـامی سـەرجۆن لـە ئاکـاد) دروسـت بـوو، ئـیلام لەپێناوی پارێزگاری ئازادیی و سـەربەخۆییدا، تووشـی شـەڕی زۆر قـورس و گەرم بوو لەگەڵیاندا، هێزی ئەم دوولایە وەك یەك نەبوون و ئەوەی زیـاتر بـوو سەرکەوت، ئەکادیبیەکانن و هەتا شوشیان خستە ژێردەستەڵاتی خۆیانەوە، لـە فەرمانڕەوایەتی مانیشتوسودا زیاتر لەوە ڕۆیشت و لە کەنداوی فارسـەوە زۆر جێگای گرنگی داگیرکرد.

لە فەرمانڕەوایی نارام سین-دا، شۆڕش و یاخیبوون لـە ئیلامـەوە تـا زاب پەیدا بوو، زۆر بـە دڕندانـە لێـدران و دامرکانـەوە، لـە شوشـدا فـەرمانڕەوا لەلایەن نارام سین-ەوە دانرا، زمانی ئەکەدی داسەپان بەسەر زمانی ئیلامدا و زۆر ناوی گۆڕی، بەڵام ئیلامییەکان فەرهەنگی نەتـەوەیی خۆیـان نـەگۆڕی و بەردەوام لە شۆڕشدا بوون.

پوزور- ئاینشوشی ناك لە ئیلامی، کە یەکێکـە لـە وانـەی بایـەخی بـە ئاوەدانکردنەوەی ئـیلام داوە. زۆر ڕێـزی لێگـراوە و خۆشەویسـت بـووە، پـاش مردنی نارام سین، پوزور- ئاینشوشی نـاك سـەربەخۆی لـە ئـیلام دانـا و بـە سەرۆکایەتی خـۆی بـە لەشـکرەوە پـەلاماری بـابلی دا و بـۆی نـەگیرا، ئـەم پەلاماردانە بووە هۆی بێهێزبوونی ئەکاد.

لۆلۆیی کە لە ناوچەکانی سەرووتر بـوون، سـەرجۆن ئەکـەدی پـەلاماری ئەوان و گوتییەکانی دابوو و بەشـەڕ داگـیری کردبـوون، پاشـان سـەربەخۆیی خۆیان سەندەوە، دیسـان لـە فـەرمانڕەوایی نـارام سـین-دا نـەوەی سـەرجۆن پەلاماری دانەوە، بەشەڕ داگیری کردنەوە دیسان، ئەم سـەرکەوتنەی خـۆی لـە دەربەندی گەورە لە قـەرەداغ نووسـیوە، کـە سـەرکەوتووە بەسـەر لۆلـۆیی و گۆتیدا، ئەمانە لەسەر ڕێگای کاروانـە ڕێـی بابـل و ئێرانـدا بـوون و لـەژێر چاودێری ئەواندا بووە، دوژمنی بابل بوون، دوو وێنەی ئەوان لۆلۆییەکان، کـە لەبەرد هەڵکەنراوە لە سەرپێڵی زەهاو دەگەڕێتەوە بـۆ دوو پادشـای لۆلـۆیی، یەکێکیان بەباشی ماوە پادشا، دوژمنـەکان لـەژێر پێدایـە و کـەوانێکی بـە دەستەوەیە نیشانەی سەرکەوتنە، وێنەی دووەم لەسەر بەردێك کە دەچێتە نـاو دێ (سەرپێڵ)ەوە، چەکوشکاری کراوە، ئـەم وێنەیـە شـای ئانوبـانی پادشـای لۆلۆیی نیشان دەدات، بە ڕیشێکی درێـژی چوارگۆشـەوەیە، کڵاوێکـی خـۆی لەسـەردایە، بـەرگێکی کـورتی لەبەردایـە، کـەمانێکی بەدەسـتەوەیە و بـە دەستەکەی تری تەورێك، پێی خۆی لەسەر دوژمنێك دانـاوە کـە لەسـەر زەوی کەوتووە، بەرامبەر بەو... (ربـە النـوع- خـوای چەشـن) نـی نـی (Ninai)

وەستاوە، بە کلاوێکی درێژ و بەرگێکی ڕیشودار کە تاپێی هاتووە، ئەو دەستێکی بۆ شا ڕاکێشاوە، بە دەستەکەی تری پەتێکی گرتووە، کە دوو دیلی پەت کردووە، لە خواریشەوە شەش دیلی کە بەیەکەوە بەستراون، هەموویان دەستیان لەپشتەوە بەستراوە، نووسراوەکە بە زمانی ئەکەدی نووسراوە وا دەردەکەوێت کە دوژمنەکانیش ئەکەدین، ئەمانە پاشان هێرشیان کردە سەر ئەکەد و گرتیان... سەدەو نیوێك فەرمانڕەوای نێوان دوو ڕووبار بوون.

(ئاسی)یەکان: بابلیان داگیرکرد و ماوەی (٥٧٦) ساڵ فەرمانڕەوا بوون تا ساڵی (١١٧١)پ.ز، پاشان گەڕاونەتەوە بۆ زاگرۆس ناوچەی پێشووی خۆیان لە لوڕستان، فەرمانڕەواییان تا هەمەدانیش بووە.

لە بابلدا پارێزگاری دینی خۆیانیان کردووە، خواکانیان بە ناوی شوریاشن، سوریای هیندو، ماروتلئی یان ماروت هیندی و بوریاش، ئەسپیان بە نیشانەی خۆیان داناوە، کۆنترین پیاچوونەوەیەك دەربارەی باسی کاسی بە سەدەی بیستوچوارەمی پ.ز-ەوەیە، کە بەستراوە بە فەرمانڕەوایی پوزورئاینشو شیناکە. دیارە لە سەرەتای سێ هەزارەی پ.ز زۆر بایەخیان نەبووە، ئاشوورییەکان بەوانیان وتووە کاسی، ئاسترابوون ناوی بردوون بە کوسایوئی و جێگای ئەوان لە ناوچەی خۆرهەڵات و لە دەربەندەکانی خەزەر، ژووری تاران نووسیوە، وا دەزانرێت ناوی شاری قەزووێن و دەریای خەزەر لە ناوی ئەو قەومەوە وەرگیراوە و یۆنانییەکان پێیان وتوون کاسیتسیرس (Kassitiros) (بەواتای توانەوە)، بەواتای قلز، کە لە ناوچەی کاسیاکانەوە هات، ناوی هەمەدان پێش مادەکان ناوی ئەکساسیا بووە، کە لە لایەن ئاشوورییەکانەوە

پێیان وتووە، کارەکاس بەواتای شاری کاسییەکان، بەهەر شێوەیەك ڕەنگە واژەی کاسی، سی یان کاس، پێ، زانینی نەژادێکی بەربڵاوتری ناوەی تەنها یەك قەوم بێت لەنێوان زۆریی قەومەکانی زاگرۆس بووبێت، یان بەسەر هەموو ئەو قەومانەی ئاسیایی کە ئێرانیان گرتووە، ئەو ناوە هەبووە.

ناوی کاسییەکان چۆن پاشان لەلایەن استرا بوون و وە ناوبراوە، لە خانەوادەیەکی زۆر کۆن و ماوەتەوە. وا دێتە بەرچاو لە ناوچەی گەورە پیاوان، لە سەدەی نۆیەم و هەشتەمی پ.ز بەندەکان و کەنیزەك و پیاوەکانیان و هەموو پیشەسازەکان، کە هەمووی شتومەکی پێویستی، بۆ گەورەکانی خۆیانیان دروست دەکرد و ئەوانە هەبوون، هەرچەند پیشەسازەکان ئازاد بوون و بەکاریان هێناون، شتومەکی تایبەتیان فرۆشتووە، لە سەرەتاوە بەرهەم بریتی بووە لە کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالات، لەو کاتانەدا خاوەن زەوی و زارەکان زۆر لە پەرەسەندندا بوون، زانایان باوەڕیان وایە خەڵکی لە ناوچەی جوتیارەکانی ئێراندا زیاتر بووە لە ناوچەی نێوان دوو ڕووباردا.

دەرهێنانی کان (مەعدەن) بووە هۆی پێشکەوتنی جوتیارەکان، لە ئێراندا. وەك مس و ئاسن کە لە نووسینەکانی ئاشووریدا بەدەرکەوتووە، ئەو شتانەیان لێ سەندوون.

ئەمیرەکان پارێزگاری بازرگانەکانیان دەکرد، ئەو بازرگانانە بەشی زۆری ئێرانی بوون و سوودی خۆیانی تێدابووە لەم ڕووەوە، بازرگانی بەرەوپێشەوە ڕۆیشت لەو شتومەکانە، شتومەکی جوانی ڕەنگاوڕەنگ، زێڕ، بەردی بەنرخ، یان پارچە قوماشی چنراو بەدەست، شارەکانیش فراوان و ئاوەدان بوون، وا

دەردەکـەوێت مانـەوەی پارسـەکان لـە بـاکووری خۆرئـاوای ئێرانـدا درێـژەی نەکێشاوە، گوێزانەوەیان بەهۆی شەڕ و هێرشی ئاشوورییەکانەوە بووە بۆ سـەر ئەو ناوچانە، یان هێرشی ئۆرارتییەکان، کە دراوسێیان بوون لە باکوورەوە، یان هێرشی تیرەکانی دیکەوە.

ڕاستییەکەی لە سەدەی هەشتەمی پ.ز ئەوان لە جولاندا بوون، وردە وردە بەرەو باشووری خۆرهەلات، ڕەنگە لە سـنووری سـالی (٧٠٠)پ.ز ئـەوان لـە دەوروبـەری خۆرئـاوای شـاخەکانی بـەختیاری تـا خۆرهـەلاتی شـاری تـازەی شوشتەر، لەو ناوچەیەدا خۆیان ناویان ناوە- پاسواش، یان پارسوماش.

## تیگلات پلایسەری سێیەم:

لە هێرشەکانیدا بۆ سەر خاکی ماد (٦٥٠٠٠) دیلی هێنـاوە بەدرێـژایی لەسەر ڕووباری سیروان جێنشینی کردوون، کە ئەو جێگایە لەژێر فەرمانڕەوای ئاشووریدا بووە، بۆ جێگای ئەوان ئارامییەکان گوێزراونەتەوە، ئاشـوورییەکان هەر لەو کاتانەدا بابلیان خستە ژێر دەستەلاتی خۆیانەوە.

سەرجۆنی دووەم: لە سالی (٧٠٥-٧٢٤پ.ز) بووەتە فەرمانڕەوای ئاشوور، پەلاماری ئیسرائیلی داوە پـاش ئـەوەی بـۆ داگیرکردنـی سـامەرە (٣٠٠٠٠) کەسی لە ئیسرائیلەوە هێناوە و لە شار و ناوچەکانی مادا بلاوەی پێ کردوون، ناوچەی زاگرۆس لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا، خەلکێکی دیکەی بـۆ هـات کە جیابوون لەوانەی خۆیان، ئەوانە تا ئێستاش هەر ماونەتەوە، سـەرجۆن لـە سالی دواییدا دیسان هاتووەتەوە سەر ماد لـە سـالی (٧١٣)پ.ز زۆر بەشـەڕ

هات لەگەڵ مادا و (٤٢) سەرکردەی هێنایە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، هەندێك لەوانە لە ناوچەی هەمەداندا بوون.

دیاکۆی گرت و بەخاو و خێزانەوە، دووری خستەوە بۆ سوریا، سەنحاریب لە ساڵی (٦٨١-٧٠٥)پ.ز لە جێی سەرگۆنی دووەم بووە جێنشین، ئەمیش بەردەوام شەڕی بووە لەگەڵ بابل، ئیلام، میسر و جولەکە. بەهۆی ئەم شەڕەوە لەملاوە هێزەکانی ئێران یەکیان گرت، لە سەرەتاوە دیاکو و خشتریتەی کوڕی فەرمارەوای یەك شار بوون، لەم یەکگرتنەدا بووە سەرۆکی ئەو یەکگرتنە، پیاوێکی لێهاتوو بوو، بۆیە ئاساردخادون کە جێنشینی سەنحاریبە، ڕاگەیاندنێکی بۆ ئەو نارد، ئەوەی ڕاستی بێت ئەو تەنها مادەکانی بە تەنیا نەهێنایە ژێر فەرمانی خۆیەوە، بەڵکو مانایی، کیەسری، کۆکردەوە، ئەم تیرانە بنەڕەتی تەواوی ئێرانین و لەگەڵ سکایەکان-دا بەشێوەی کۆچکردنی نوێ و لە قەفقاسەوە، پەڕیونەتەوە لە سەرووی دوو وڵاتەوە، ئاشوور و ئاورارتۆ پەیدا بوون.

## کیمری و سکای:

لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا، ئەم تیرانە لە باکووری خۆرئاوای ئێران بەر هێرشی ئاشوورییەکان کەوتن، ئارارتۆ و ماد شڵەقاو بوون، لەو هێرشانەدا کیمری و سکای بوونە هۆی دەستدرێژیکردن لە ئاسیای بچووکدا، سوریا و فەلەستین. کارس و مادەکان سیوچوار سەدە پێش ئەوان هاتبوون، لە نووسینی ئاشوورییەکاندا ناوی کیمری و سکایی بە گیمیری و ئەشکەوازی ناو دەبات، هەمان ناوە لە تەوراتدا هاتووە.

ئەم دوو قەومە بەسترابوون و لابەلای زۆریشەوە بە یەك زمان گفتوگۆیان کردووە، بە قسەی هیرودوت گوایە کیمرییەکان لەلایەن سکایەکانەوە ڕاونراون، ئەمە جێگای باوەڕ نییە.

ئەمانە بە تاڵانکردنەوە دەژیان، لە کاتی فەرمانڕەوای سارگۆنی دووەمدا ئاوارارتوی یەکەم جێگایەك بۆ کەزمە تووشی زەرەر بوو لەلایەن کیمرییەکانەوە، کیمرییەکان بوونە دوو بەش: یەکەمیان بەدرێژایی دەریاچەی ئورمیە جولان، لەگەڵ خشتریتەی ماد یەکیان گرت. بەشەکەی تریان بەشێوەی سوارە، بەرەو باکووری ئاشوور و پاشان خۆرئاوا کەوتنە تالان و چەپاوڵکردن، ئەم قەومانە لەگەڵ تررس (Treres) و قەومەکانی دیکەی ئاسیای یەکێتییەکیان دروستکرد، لە ڕۆخی دەریای ڕەشدا لە ناوچەی سینوب و تێرژانی قزل ئیرماق جێگیر بوون، جارجارە بەرەو ناوچەی ئاسیای بچووك دەهاتن بۆ تالانکردن، هەر ئەوان بوون کە پادشای فریپرییان لەناوبرد، دوای ئەوە پادشای قەومی دوای میداس خۆی خۆی کوشت بەهۆی هێرشی ئەمانەوە و پادشای یۆنانیشیان کوشت بە ناوی ژیکس. لە دواییدا ئاشوور بانیپاڵ

پاشای ئاشوور، له لوتکه‌کانی کیلیکییه ئه‌وانی شکاند و ئه‌وه‌ی ده‌ربـاز بـوو هه‌ڵات و په‌یوه‌ندییان به سکایه‌کانه‌وه کرد.

له فه‌رمانڕه‌وایی پادشا پارتاتوا، یان پرتوتیس به قسه‌ی هـیرودوت وڵاتـی سـکایی، به‌شـێکی زۆری وڵاته‌کـه بـووه، پاشـان پێیـان وتـووه ئاتروپـاتین (ئازربایجانی ئێستا) به‌و نـاوه‌وه نـاوبراوه، کـه ناوه‌نـدی ئـه‌وان لـه باشـووری ده‌ریاچه‌دا بووه، دۆستایه‌تی و په‌یوه‌ندییه‌کی باشیان له‌گـه‌ڵ مـاددا هـه‌بووه، ئاشوورییه‌کان ده‌یانویست سه‌ربکه‌ون به‌سـه‌ر ئه‌وانـدا، پارتـاتوا داوای کچـی ئاشووری کرد، هه‌رچه‌نده مێژوو له‌م ڕووه‌وه شتێك ناڵێـت، ڕه‌نگـه لـه‌م ڕووه‌وه ڕازی بووبن سکایه‌کان به‌هۆی سه‌رکه‌وتنیانه‌وه به‌سه‌ر ماده‌کاندا به‌هێز بوون و ئاشوور بانیپاڵیان ڕه‌نجاندبوو به‌هۆی هاتنی کیمیرییه‌کانه‌وه بۆ ناویان و به‌هێز بوون.

## سکایه‌کانی ئاسیای بچووك

باکووری سوریا، فینیقیه، دیمه‌شق و فه‌له‌ستینیان تاڵان کردبوو، یاداشتی ئه‌مانه له نووسینی ئارامیـدا مـاوه، کـه دڵتـه‌نگی خـۆی ده‌ربـڕی، ئه‌مانـه میللـه‌تان لـه‌ناو ده‌بـه‌ن، لـه جێگـای خۆیـان ده‌جـوڵێن، وه‌ك هـه‌ور دێـن و گالیسکه‌کانیان وه‌ك ڕه‌شه‌با، ئه‌سپه‌کانیان وه‌ك هه‌ڵۆ تیژ ده‌ڕۆن، وای له ئێمه، چونکه له‌ناوچووین، فیرعه‌ونی میسر به بـه‌رتیل، پـاره، له‌سـه‌ر سـنووره‌که‌ی گویه‌وه ئه‌وانی گه‌ڕانده‌وه، سـکایه‌کان هـه‌ر گه‌یشـتنه‌وه زاگـرۆس، ده‌سـتیان کرده‌وه به تاڵانکردن.

## سەقز:

ئەو ناوە لە ناوی سکایی، یان سکە کە خۆیان وایان بە خۆیان وتووە، یان ئەشکەوازی، هاتووە، چونکە لە تەوراتدا وا هاتووە، سکایەکان لە باشووری دەریاچەی ئورمێ لە ناوچەی مانایی کە داگیریان کردبوو، لەو جێگایانەدا نیشتەجێ بوون و سەقزیان کردە پایتەختی خۆیان.

## پادشاکانی ماد:

کیاکسارە پەلاماری نەینەوای دا، لەگەڵ نابو پلایسەر پەیمانیان کە فەرمانڕەوای بابل بووە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە دانرابوو، بۆ ئەم مەبەستە کچی کیاکسار درا بە کورشی نابو پلایسەر، نەبو خود نەسر بەناوی، ئامیتسی، پەماری ئاشووردرا و لە ساڵی (٦١٢)پ.ز نەینەوا گیرا.

لە ساڵی (٥٨٤)پ.ز ئاستاگ[1] بووە جێنشینی باوکی و دوامەلیکی مادە، پێنج ساڵ بوو شەڕ بوو لەنێوان ماد و لیددا، لەو ساڵەدا خۆر گیرا و لەولاشەوە بەهۆی هەوڵدانی نەبوخوز نەسرەوە، ئاشتی کرا و کچی مەلیکی لیدیا درا بە ئەستیاگ و سنوور جیاکرایەوە. چیش پێش (٦٤٠-٦٧٥)پ.ز کوڕ و جێنشینی هنمامنشی، پێشتر بەناوی پادشای شارەکانەوە بوون، ناوچەیان لە باکووری خۆرهەڵاتەوە بووە و لەژێر دەستەڵاتی فەرمانڕەوای ماددا بوون، فرورتیش، خشتریتە، ئەمەش لە ساڵی (٦٧٠)پ.ز-دا.

---

[1]- استیاك: ناوی ئەم پادشایە بە ئەژدەهاك و انح توویگو هاتووە.

لە فەرمانڕەوایەتی هنمامنشی-دا (ئاینی مەزدایی)، کە زەردەشت ئـەوی گۆڕیبوو، لەسەرانسەری شاهەنشایدا فراوان بوو، میـژووی ژیـانی پێغەمبـەر زەردەشت جێگای باسە وا دەزانرێت کە ئەو خەڵکی ماد بووە، ناوچەکەی خۆی بەجێهێشتووە و بەرەو خۆرهەڵاتی کـیران ڕۆیشـتووە، چـووەتە لای گوشتاسـب باوکی داریوش دەزانێت کە ئەو کاتە فەرمانڕەوای پارت و گورگان بووە، ئاینی تازە وردە وردە لە خۆرهەڵاتی ئێرانەوە هەموو وڵاتی گرتـەوە. کـردەوەی بـاش، قسەی باش، بیری باش.

لای زەردەشتی زۆر پیرۆز بووە، قوربانیکردن نەبووە وەك سەربڕینی ماڵیـات بۆ قوربانی، نەدەبوو مردوو بنێژرێت یان بیسووتێنن و بخرێتە ناو ئـاوەوە، لـەم ڕووەوە سێ شتیان لا پیرۆز بووە، زەوی- خـاك، ئـاگر، ئـاو. لاشـەی مردوویـان لەسەر بەرزییەك دادەنا، تا باڵدار و گورگ و چەقەڵ گۆشـتەکەیان دەخـوارد و لەپاشان، ئێسقانەکانیان لەناو خاك، یان ناو بەردا دەشاردەوە، وەك گۆڕ.

دۆزینەوەی هێڵی مێخی، نووسنیی مێخی، بە زمانی پارسی کۆن لـەکاتی چیش پێش پێ دەکات، لەو نووسینانە پارچەیە گڵی نووسراو لە شـوش دۆزراوەتەوە. زمانی ئارامی لە هـەزارەی یەکـەمی پ.ز-دا زۆر فـراوان بـووە، (ئارامییەکان و پلایەتی بچووك بچـووکی پادشـاییان هـەبووە)، لـە ڕەشـد، حەمات، سمعل، لـە سەرانســەری خۆرهەڵاتــەوە تـا نزیکـی خۆرئـاوای ئێـران بڵاوبووبوونەوە، لەکاتی ئاشوورییەکاندا، زمان و نووسینی ئەوان لە بازرگانی و هەتا قسەکردنیشدا بایەخدار بووە، زمانی ئارامی لەکاتی خامنشی-دا لـە ئاسیاوە، بەتایبەتی لە میسرەوە تا هیند، زمانی میلەلی بووە.

له سەدەی دووەمی پ.ز ناڵ بۆ وڵاخ دۆزراوەتەوە، هەر لەو کاتانەدا کەشتی بار لە نیل و دیجلە و فوراتدا (٢٠٠- ٣٠٠) تەن، باریان هەڵگرتووە.

ئەسکەندەر کچی داریوشی هێناوە، ناوی ستاتیرە و خوشکی ئەویشی دا بە (هەفستیون)، یەکێك لە سەرکردە نزیکەکانی ئەسکەندەر، هەروەها هەشتا کەسی لە فەرماندەکانی خۆی و دە هەزار سەربازی یۆنانی هەموو کچی ئێرانیان هێناوە، بۆ ئەمەش پێنج ڕۆژ شایی و جەژنیان گێڕاوە، ئەسکەندەر وازی لە ڕێگای شوش هێنا بۆ بابل و ڕێگای کۆنی شاهی کە لە هەمەدانەوە دەڕۆیشت بۆ بابل، بەکاری هێنا، ئەوەش دوا گەڕانەوەی بوو، پاشان ئەسکەندەر بەخۆشی لە ساڵی (٣٢٣)پ.ز کۆچی دوایی کردووە.

## ویلایەتی بلنج:

بریتی بووە لە دەشتی باکووری ئەفغانستانی ئەمڕۆ و لە بەشێکی باکووریەوە دەگەیشت بە جەیاکون- امودەریای ئێستاوە.

فەرمانڕەوای سلوکیان دوا پاشایان ئانتیوخوسی چوارەم بووە لە ساڵی (١٦٤-١٧٥)پ.ز لەو ساڵەدا و پاش مردنی ناوبراو، پارتییەکان بوونە فەرمانڕەوا، سەربەخۆی یۆنانییەکان یەك بەدوای یەکدا لە دەستیان دەرچوو، فەرمانڕەوایی ئەو جێگایانە کەوتە دەست ڕۆمەکان.

لائودیسە (Laodicea) نەهاوەندی ئەمڕۆ، لە فەرمانڕەوای سلوکییەدا دروستکراوە، ئەستەخر، یان قەڵا شارێك بووە کەمێك دوور لە کەلاوەکانی تەختی جەمشیدەوە، پاشان بووەتە ناوەندی سیاسی و هەروەها شارێکی دینی... هتد.

پەرستگایەك لە نەهاوەند دروستکراوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣)پ.ز لەلایەن ئەنتیوخوسی سێیەمەوە دروستکراوە، ئێستا ئەو پەرستگایە کەلاوەکانی ماوە.

## کرماشان:

لە کۆندا لەلایەن یۆنانییەکانەوە پێیان وتووە (نسا) لە دینەوەر، نزیك کرماشان پارچە بەردێك لەشێوەی لەگەندا، کە وێنەی نیولاشەی، سیلنووسهاو ساتیرها، دەستەکانی دیونیسوسن ڕازاوەتەوە. دەشتی گەورەی کرماشان لەکاتی کۆندا بە ئەسپی زۆر چاك بەناوبانگ بووە. پارتی و سەرەتایان، ئەمانە دەگەڕێنەوە سەر تیرەی پرنی، کە پارچەیەك بوون لەتیرەی دەهە، دەهە کۆمەڵێك بوون لە تیرەکانی سکای کە بەشێوەی کۆچەری، لەوەرگای نێوان دەریای خەزەر و دەریای ئۆراڵ، دەژیان. ئەم گەلە زۆر چاك و ئازا و لێهاتوو و شەڕکەر بوون، زۆر خۆشبەخت بوون کە لە شەڕدا بکوژرێن، مردنی ئاسایی لای ئەوان ناخۆش بوو، شەرم بووە، زانایان لەگەڵ ئەوەدان کە لە سنووری ساڵی (٢٥٠)پ.ز دوو برا ئەرشەك و تیرداد، لەگەڵ شەڕکەرانی خۆیان و پێنج کەسی سەرۆکی کە، ناوچەی بەرزی (تجن) دەستیان بەسەردا گرت. دیودتوس، پادشای تازەی بلنچ، هێرشی بۆ کردن، ئەمانە هەڵاتن و پەلاماری ویلایەتێکی دراوسێی پارت-یان دا و فەرمانڕەواکەشیان کوشت، پاش دوو ساڵ ئەرشەك لە شەڕێکدا کوژرا، پارتەکان هەمیشە لە شەڕدا بوون، لەژێر فەرماندەی تیرداودا، هەموو ئەو ناوچانەی کە ئەمڕۆ و ئەوپەڕی سەر سنووری پشتی خەزەری ڕوسییە و ئێران، دروست دەکات، داگیریان کرد تیرداد هەر لەو

کێوانەدا یەکەم پایتەختێکی بۆ خۆی دروستکرد، وەك هیلانەیەکی هەڵۆ سەیری ئەو پایتەختە دەکرا، کەمێك دوای ئەوە شارێکی دیکە بە ناوی دامەزرێنەری زنجیرەی ئەرشەك دروستکرا و تیرداد لەوێدا تاجی پادشایەتی لەسەر نا.

سلوکی دوووەم بەرامبەر بەهێرشی ئەوان وەستا و تیرداد کشایەوە بۆ جێگاکانی خۆیان، لەم کاتانەدا لە ئەنتاکییە هەراوهوریا دروست بوو، ناچاربوون واز لەو شەڕە بهێنن و بەرەو دوا گەڕایەوە بۆ سوریا، پارتییەکان لەم ڕووەوە هەلیان بۆ هەڵکەوت، تیرداد ئەو جێگایانەی پێشووتر گرتبووی، دیسان گرتییەوە، گورگان و ویلایەتەکانی کە کەوتبوونە باشووری خۆرهەڵاتی دەریای خەزەرەوە، خستییە سەر بەشی خۆی. بەم جۆرە دەوڵەتی پارت، لەدواییدا، بووە هۆی پچڕانی دەوڵەتی سلوکی لە یۆنان، لەم کاتەدا پارت لەنێوان دوو دەوڵەتدا بووە، بۆ پارێزگاری دەوڵەتەکەی فراوان کرا و بەهێزیش بوو. ناوێك کە پارتییەکان کە بە خۆیان وتووە، ڕوون نییە، واژەی پارت، کە لە سەرچاوەکانی خۆرئاواوە زانراوە، هەندێ لە زانایانی ئێرانی ئەم وشەیە (پارت) بەواتای (شەڕکەر و سوارچاك) دەزانن. هەرچەند ئەوەیان بە هەموو ئەوانەیان وتووە کە هێرشیان بۆ سەر ئێران هێناوە، هەڵسانی گەورەی تیرەکانی سکایی، کە ئەو هێرشانەیان یەك سەدەی خایاندووە، دەوڵەتی ئێرانیان سەرەوخوار کردەوە و فەرمانڕەوایی یۆنانی بلنچ-یان کۆتایی پێ هێنا.

تیرداد، سیوحەوت ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، خۆی بەهێز کرد و سوپایەکی باشی دامەزراند، بەرەو خۆرئاوا کشا و پایتەختی خۆی شاری بازرگانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بووە، ناوی شارەکە، سەد دەرگا بووە.

هەروەها شاری ئەستەتن، شاری سەد دەرگا، هەکمەتانە هەمەدان، تەیسەفەن ئەو چوار شارە لە ڕابردوودا پایتەخت بووە و بوونە جێنشینی زنجیرەی کۆچەرییەکان، جێنشینی تیرداد، ئەردەوان (ئەرتەبان)ی یەکەم، تا ئەو کاتە هێندە بەهێز نەبووە کە بتوانێت لەگەڵ لەشکری ئەنتیوخوسی سێیەم بەرەنگاریی بکات.

ڕۆمەکان پریاتیوس لەشکری ئەنتیوخوسی سێیەمیان تێکشکان و هەندێ جێگایان لێ داگیرکردن لەگەڵ دەستکەوتدا.

پارتەکان تەنها قەومێك نەبوون سوود لە شکاندنی سلوکییەکان وەرگرن بەرامبەر بە ڕۆمەکان، ماد لە ئازربایجان-دا سەربەخۆیی خۆی بڵاوکردەوە، الیمایی هەروەها پاشان ناوچەی ئەسفەهانیان سەربەخۆ کرد.

بابل بەشی باشووری حکومەتێکی تازە بە ناوی خرسن (Characene) دروست بوو.

## مهردادی یەکەم:

ویلایەتە بچووکەکان، هەمووی خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، مهردادی یەکەم لەنێوان ساڵەکانی (١٤٠ و ١٦٠)پ.ز. پاش شەڕوشۆڕێکی زۆر ئەو ویلایەتانەی خستە ژێر دەستی خۆیەوە، وەك ماد، المایی، پاس، خرسەن، بابل و ئاشوور لە خۆرئاواوە، گدر، زیا، هوان، سیستان لە خۆرهەڵاتەوە پارتییەکان تا نزیکی فورات ڕۆیشتن، بەڵام سلوکییەکان لە ڕۆخی دیجلە مانەوە، لە گەورەترین شاری بەشی ئاسیا و ناوەندی بازرگانی، کە نزیکەی شەش سەدە هەزار کەسی تێدابووە.

پاشان تەیسەفون بووە پایتەختی پارتی. مهرداد ناونیشانی شاری گەورەی لە خۆی ناو، لە ساڵی (١٣٧)پ.ز مردووە، لە جێی خۆی کوڕەکەی بووەتە فەرمانڕەوا بەناوی فەرهادی دووەم و برای دمتریوس بەند بۆلای کیانییەکان بە ناوی (ئانتیوخوسی)ەوە ناوبراو بۆ ڕزگاربوونی براکەی بە سوپایەکی زۆر گەورەوە هاتە نێوان دوو ڕووبار لە سێ شەڕدا لەگەڵ پارتییەکاندا سەرکەوتوو بوون، ئەنتیوخوس گەیشتە هەمەدان و زستانی بەسەردا هات، خۆی لە هەمەدان مایەوە، لەشکرەکەی بەسەر شار و دێهاتەکاندا بڵاوە پێ کرد بۆ ئەوەی تا زستان کۆتایی دێت.

لەم کاتەدا فەرهاد پێشنیاری ڕێکەوتنی داواکرد لەوان، ئەوان وتیان بەردانی براکەی و ئەو جێگایانەی لەلایەن پارتەوە گیراوە، بدرێنەوە بە سلوکییەکان و باجیش بدەن، ئەمەش زۆر گران بوو لای فەرهاد شۆڕش دەستی پێ کرد لە دێهات و شارۆچکەکاندا لە دژی لەشکری ئەنتیوخوس، لەلایەن ئەو خەڵکانەی کە ئەو لەشکرەیان بەخێو دەکرد، ئەم شۆڕشەش لەلایەن پارتییەکانەوە جوڵێنرابوون، لەم کاتەدا پادشای پارت، لەپڕێکدا هێرشی کردە سەر ئەنتیوخوس، ڕووخان و کۆتایی سلوکییەکان تەواو بوو، پاشان سلوکی کوژرا، بەشێك لە لەشکرەکەشی چوونە ناو لەشکری پارتەوە، ئەم هێرش و سەرکەوتنەی سلوکی لە ماوەی چەند مانگێکدا تێکشکان و هێرشیش بۆ سەر سوریا ئاسان بوو لەلایەن پارتییەوە.

لە ساڵی (١٢٩)پ.ز لە مێژووی یۆناندا، کە جارێکی دیکە سەر بەرز ناکاتەوە، هەموو ئێران و سەر سنوورەکانی ئەورووپای بەتەواوی لەدەست چوو تا فوراتیش.

## ئاین:

(ئەردەشێر پاپەکان) پاش ئەوەی بووە شاهەنشای ئێران و چەسان، ئـاینی زەردەشتی کردە ئاینی دەستووری ئێران، هەرچەند جیاوازی هەیە لـەم باسـەوە بەپێی نووسینەکان، کە ماوە، پێشـتر ئـاینی کۆرمـەزدای هـەبووە، هـەروەها ئـاینی ناهیـت (ئانـا هیتـا) هـەبووە، لەگـەڵ ئاگرپەرسـتن و پەرسـتنی ئاهورامەزدا.

(مانی): لە بنەڕەتدا لە پیاوە ناسراوەکان بوو، خۆی وەکو زەردەشت و بودا و عیسا بە نێـردراوی خـوا دادەنـا، لـەپێناوی تـەواوکردنی ئامۆژگـاری کـە پێشینان هێنابوویان، دینێکی تازە و گشتی بوو، وەك مەسیحییەت، بەرامبەر هەموو قەوم و نەتەوە و ڕەگەز بوو، بـاوەڕی ئـەوان وەکـو ئاینـەکانی بـابلی و ئێرانی تێروتەسەل بوو، لەژێر کاریگەری مەسیحییەت و ویدایدا جێگر بـوو، دروسـتکردنی ئـەم ئاینـە بـە پێچـەوانەی ڕوونـاکی و تـاریکی بـوو، یـان بەواتەیەکی دیکـە باشـی و خراپـی. لـەم دوو لایـە کـە بەرامبـەر بـە یـەك توندوتیژن، جیهان دروست بووە، لە مرۆڤی پاکدا ڕووناکی و لە دڵیدا تاریکی هەیە.

سەرانسەری ڕەوشتی مانوی لـەکاتی تەواوبوونـدا خراپـە لـە خـۆی دوور دەخاتەوە، هەموو گیان (ڕۆح) هەموو ڕووناکی کە بە مادە لە قەڵەم دەدرێـن، ئازاد دەبن و بەرەو ڕۆژ سـەردەکەون، ئاسمـان و زەوی لـەناو دەچـن و لـە یـەك جیادەبنەوە، فەرمانڕەوایی تیشك سـەربەرز و پایـەدار دەمێنێتـەوە، نیشـانەی

پیاوچاکان دەبنە دوو بەش، یەکەم کۆمەڵی ریشسپییەکانن کاربەدەست و لەخۆبووردوو بوون، گۆشتیان نەدەخوارد، ئازاری کەسیان نەدەدا و درۆیان نەدەکرد.

دەستەی دووەم: بۆیان هەبوو ژن بهێنن، دەیانتوانی وەك خەڵکی تر کار و ئیش بکەن و ئاگاداری ئاینەکەی خۆیان بن، نەدەبوو ماڵ و سامان کۆبکەنەوە، لەو ئاینە تازەیەدا قوربانی نییە و بتپەرستن نییە، نوێژ و رۆژوو پێویست بوو بکرێت.

ماندیەکان خۆشتن و نانی ئێوارەیان بەپێویست دەزانی، داوای لێبووردنی گوناهی خۆیان دەکرد، مانوی، ئاینی جولەکەیان لاباش نەبوو، مۆسا و پێغەمبەرەکانی دیکەی جولەکەیان بە کۆمەڵی شەیتانیان داناوە و خوای ئەمانیان بە خوای تاریکی داناوە.

سروودی ئەمان لە سەرچاوەی بابلییەکانەوە هاتووە، بیروڕای ئەمان لە ئامۆژگاریی زەردەشتەوە وەرگیراوە، عیسا لە ئاینی مانیدا پلەیەکی بەرزی هەیە، ئەو لە مەسیحییەت، سێ بەشی لە هەندێکی ئینجیلدا بە پەند وەرگرتووە، دوونادوون (تناسخ الأرواح) لە بودای وەرگرتووە، ناوی فریشتەکانیشیان سریانییە.

(برا یەزیدییەکان بە پاشماوەی کوردە زەردەشتییەکان دادەنێن). نزیکەی سەد ساڵێك لەمەوپێش لەسەر دەستی (شێخ عدی)دا بوون بە ئیسلام، بەڵام پاش مردنی شێخ عودەی بەسەد ساڵێك لە ئیسلامەتییەوە وەرگەڕانەوە سەر ئاینەکەی خۆیان، لەو ماوەیەدا چەند بەشێکی ئەو ئاینەیان لێ ون بوو، لە

چەند ئاینێك و چەند ڕاستی پەرستییەکەوە گـەلێك بیروبـاوەڕی ئاینکـاری بێگانە کە بەپێچەوانەی ئاینی زەردەشتی هاتنە تەنیشتی ئاینەکەیانەوە، لـەم کۆمەڵە بەشە پاینی و ڕاستی پەرستی (ئاینی یەزیدی) پەیدا بوو. لەڕاستیدا لە ئاینی یەزیدیدا بەشێکی گەورە و گرنگی ئاینی زەردەشـتی ماوەتـەوە وەك باوەڕکردن بە خوایەکی پاك و تاك و تەنیا و حەوت فریشتەکان و پێغەمبەران و مردن و زیندبوونەوە، کە چەندوچۆنی خوا لەگەڵ مرۆڤدا پاداشـت و سـزای خوایی و بەهەشت و دۆزەخە.

بەزەییان بە هەژاران و لێقەوماودا بێتەوە ڕێز لـە ئـاو و ئـاگر و بـاو گـڵ بگرن.

ئەمڕۆ ژمارەی سەری برا یەزیدییەکان خۆی دەدات لە سەد هەزار کەسێك. بریتین لە چەند هۆزێکی جویێ. کە ئاینی یەزیدی لەژێر سێبەری خۆیدا کـۆی کردوونەتەوە. یەزیدییەکان سەردەمێکی وایان بەخۆیانـەوە دیـوە کـە ژمـارەی سەریان گەیشـتووەتە ملیـۆن کەسـێك. لـەماوەی کوشـتن و سـەرداد ئێسـتا لەماوەی ئەو حەوت ساڵەدا بە دوو ملیۆن کەس دادەنرێن. ئەمە جگە لە تالان و بردن و سەرگەردانی (ماڵوێرانی و ڕیسواییش کە بەسەریاندا هاتووە، کە لە ژمارە نایەن لە هەموو ڕوویەکـەوە پاشـی خسـتوون، ئەمـە لەباپـەت دیـوی دەرەوەی ژیانیانەوە، لەڕووی دیوی ناوەوەی ژیانیشیانەوە، بەهۆی نەخوێنـدەواری دەستکاری ئاینەکەیانەوە لەلایەن هەندێ پیـاوانی ئـاینی خراپـی خۆیانـەوە، تەڵەکەبازی بێگانـەکان بـە مەبەسـتی داگیرکردنـی خاکەکـەیان و پچـڕینی بەروبوومیان، باری کۆمەڵایەتییان تەواو تێکچووە، ئەمەش بەهۆی زۆرداریـی و هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێنەوارییەوە لەلایەن داگیرکەرانەوە.

## شێخ عدی:

بەپێی قسەی هەندێ لە مێژوونووسانی عەرەب، لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا (شێخ عدی کوڕی مسافری) ئەمەوی کە زانایەکی دەریوێشی کاری (تصوف) و خواناسێکی بلیمەت بووە، پەنای بردووە بەر یەکێك لە شاخەکانی کوردستان، لەناو دێیەکی چۆڵی گاوراندا کە ونبوو، ناو شاخی (لاش) و لە ناوچەی شێخاندا ئارامی گرت و دەستی کرد بە گۆشەگیریی و خواناسی، دڵسۆزیی و دەستپاکی شێخ عدی بەرامبەر ئیسلامییەتی پیشان دەدات، نە ناوی (یەزیدی) هەیە لە سەردەمی ئەودا و نە ناوی دید (شەیتان)پەرستی.

بەپێی نووسراوی (الیزیدیە) صدیق الدملوجي سالّی (١٩٤٩)ز، بەلام (رایشوع) و (مسیونو) دەڵێن: شێخ عدی کورد بووە لەسەر ئاینی زەردەشتی بووە. لەپاش شێخ عدی بەسەد ساڵ کە ئاینی لەسەر دەستی (شێخ حەسەن)دا دامەزرا. ئەم شێخ عدی-یە لەگەڵ (یەزیدی کوڕی معاویە) و (شێخ حەسەن) هەریەکە وەك خوایەك لەلایەن یەزیدییەکانەوە دەپەرستن.

گۆڕی شێخ عدی-یان کردووە بە پەرستگای خۆیان، هەموو ساڵێك سەری لێ دەدەن و (حەج) لەوێ دەکەن. شێخ عدی ساڵی (٥٥٥) کۆچیدا بووە. خوای ئاسمان لە ئابلی (سرووشت پەرستەکان)دا لە هەموو خواکان گەورەترە، پێیان گوتووە (دیاوس) بەپێی لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی، ئەم وشەیە بەرە بەرە گۆڕاوە تا بووە بە (تاوس)، کە ئەمیش لەلای یەزیدییەکان پێی دەڵێن (تاوسی مەلك) کە خاویەکە گەورەیانە.

ئاینی یەزیدی لەشێوەی ئێستایدا کـە هەیـە، لـە زۆر ڕووەوە پێچـەوانەی ئاینی زەردەشتە. کەواتە ئاینی یەزیدی ئەمڕۆ بریتییە لە پاشـگەزبوونەوەیەك لە ئیسلامییەتی.

ئاینە کۆنەکەی باووباپیرانیان کە بریتییە لە زەردەشتی، بێجگە لـەوە لـە ئاینەکانی تریشەوە گەلێك بیروباوەڕی تـری تێکـەوتووە، وەك ئـاینی (مانـیّ، بوراهمایی) و سرووشتپەرستی و ئیسلامی، لەگەڵ ئامانەشدا هەموو ئـاینی یەزیدی، ئاینێکی سەبەخۆیە، لەشـێوەی گشـتیدا لـەو ئاینانـە-هـەموویان جیاوازە.

شێخ حەسەن: یەزیدییەکان پێی دەڵێن (شێخ شمـس) بـرازای شـێخ عـدی گەورەیە، لە ساڵی (٥٩١) کۆچیدا لەدایك بووە، پاش ئەوەی خوێندنی تـەواو کردووە، لەجێی ئەو بووە بە شێخی (ڕێڕەوی عـدی) زۆر زیـرەك بـووە، زانـا و هونەرمەند بووە.

نووسراوێکی هەیە بە ناوی (الجلوة لأهل الخلوة) زۆر شتی تیادا نووسیووە، هەمووی بە پێچەوانەی ئیسلامیەتییەوە نووسراوە. ئاینی یەزیـدی ئـەم پیـاوە داینـاوە کـە لـە زۆر ڕووەوە لـە ئیسـلامییەت و زەردەشـتی تـەواو جیـاوازە، دۆستەکانی شێخ حەسەن ئەم ئاینەیان بەلاوە خۆش بووە و پەسەندیان کردووە. لەدواییدا کردیان بە یەکێك لەو حەوت خوایانەی کە دەیانپەرستن، ناویـان نـا (دەردائیل)، کە فریشتەیەك بووە لە فریشتەکانیان. زۆر دژی شیعە بـووە. لـە موسڵ گیراوە خنکێنراوە لە ساڵی (٦٤٤)ك بەدرەدین کە سەرۆکی موسڵ بوو، پەلاماری ناوچەی لالشی دا لـە سـاڵی (٦٤٤)ك، لـە سـاڵی (٦٥٢)ك ئـەو

هێرشەی کردووە، زۆری لێ کوشتوون، هەر لەوانە سەد کەسی لێکردوون بە دارا و سەد کەسیشی لێ سەربڕیون و سەد کەسیان پارچە پارچە کرد بەسەر دەرگاکانی موسڵدا، پارچەکانی هەڵواسین، گۆڕی شێخ عدیان هەڵگێڕایەوە و ئێسکەکانیان سووتان.

صدیق الدملوجی و هەندێك لە نووسەرانی عەرەب دەڵێن: شێخ عدی عەرەب بووە و ئەمەوییە. مێژوونووسان (رامیشوع) و (مسیونو)یش دەڵێن کورد بووە و زەردەشتی بووە.

شێخ حەسەن کوڕی شێخ عدی دووەم لە نووسراوەکەیدا مصحفارەش گیانێکی کوردایەتی پەتی بەهێز و هەرەت دەبینرێت، مصحفارەش بە زمانی کوردی نووسیویەتییەوە.

## ناوی یەزیدی:

ڕەنگە مەبەستیان ئەوەبێت کە خواپەرستن نەك دێو پەرست. لە زمانی کوردیدا چ (ئیزەد) چ (یەزدان) بە هەردووکیان بە خوا دەڵێن. جا لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە من لەو باوەڕەدام کە یەزیدییەکان، یان بەناوی (یەزدان)ی باپیرە گەورەیانەوە ناونراون. (ئێزدی) کە خواپەرستن، نەك دێو پەرست. بە واتایەکی دیکە ناوی (یەزیدی) ناچێتەوە سەر ناوی (یەزیدی کوڕی مەعاویە).

دوو نووسراوی ئاینییان هەیە (جیلوە) و (مصحفارەش)، هەردووکیان بە زمانی کوردی نووسراونەتەوە، جلیوە بەشێوەیەکی ئاسمانی نووسراوە لەشێوەی مصحفارەش: بریتییە لە نووسراوێکی مێژوویی تیەی یەزیدییەکان.

سەعید بەگ لە ساڵی (١٩٤٤)ز کۆچی دوایی کردووە، تەحسین بەگی کوڕی چووە جێگای تەمەنی (١٣) ساڵ بوو لەژێر چاودێریی و سەرپەرشتی (میان خاتون)دا کاری بەڕێوە دەبرد.

## مێژووی یەزیدییەکان لە شنگاردا:

شنگار یاخود (سنجار)، شارێکی گەورە و زۆر کۆنی کوردە، چ لەڕووی مێژوویەوە، چ لەڕووی سەختیی جێگاوە، چ لەڕووی ئاو و بای سازگار و ئەنازەی جوان و مێرگوزارەوە زۆرجار کاول کراوە و جێگای خۆی گرتووەتەوە، شاخی شنگاریش بایەخ و نرخ و گرنگییەکی تەواوی هەیە، لەشکری تەیموری لەنگ هەموو کوردستانی گرتەوە ئەویش کاولی کرد. ئەوکاتە شنگاریش (٣٥٠٠٠) ماڵی تیادا بووە، بەهۆی دڵڕەقی لەشکری تەیموورەوە سەرەوژێر بوو، کاول بوو، کەسی تیادا نەما، لەم کاتەدا کە ساڵی (٦٩٧)ك بوو، بەپێی سەرگوزشتەی دەمی ئەم چوارسەد خێزانێك لە یەزیدییەکان (شێخان) پەنایان بردووەتە بەر شاخی شنار لە (جزیر) و (یارنکر و بیدلیس)، دەشتی دیجلە و جێگایانی تریشەوە گەلێك لە یەزیدییەکانیان دواکەوت، تا هەموویان لەو شاخە سەختە پوختە و ڕەنگینەدا جێگیر بوون. بەم ڕەنگە باری شنگار لەپڕ گۆڕا و زۆریشی نەخایاند بۆ ئەمە و نیشتەجێکانی شاخی شنگار بە گاور و موسڵمانیانەوە، بەزۆری و خواهیش بچنە سەر ئاینی یەزیدی. یەزیدییەکان هەر کەسێکیان ببینیایە لەو شاخە دەیان کرد بە یەزیدی، یان لەو ناوە نەیان

دەهێشت. یەزیدییەکان هەرچیان لەگەڵدا دەکردن، وەڵامیان دەدانەوە و زۆر کوشتاریان لێکرا.

لەساڵی (١٠٤٨)ك مەلیك ئەحمەد پاشای تورکی (عوسمانی)یش هێرشی بردە سەریان، لە دیاربەکر و سانزە هەزار کەسی لە یەزیدییەکان کوشت. دوانزە هەزار ئافرەت و کوریشی لێ گرتن بەدیلی بردنی بۆ فرۆشتن. ئەمەش زاوای (سولتان مورادی چوارەم) لە ساڵی (١١١٩)ی کۆچی سەرکردە کوردەکانیش لە ڕەواندوز بە کۆمەڵێکی گەورەوە لە هۆزەکانی خۆیان و زێبار هێرشیان بردە سەر یەزیدییەکان (شنگار) کوشتاریان کرد و دێهاتیان سووتاند و بەخۆیان و سامانی تاڵانیشەوە گەڕانەوە، ئەمەش بەهاندانی پیاوانی ئاینییەوە ڕوویدا. ئەگینا کوردی ڕەواندوز چ پەیوەندییەکیان هەبوو بەم یەزیدییە کلۆڵانەوە.

لە ساڵی (١١٢٧)ی کۆچی حەسەن پاشای سەرکردەی بەغداد، هێرشی بردە سەریان، کوشتارێکی زۆری لێکردن، تاڵانێکی زۆری لێبردن، ژمارەکی زۆریش لە ئافرەت و منداڵانیانن گرت بە دیل و بردنیانن بۆ فرۆشتن. لەشکرەکەی (حەسەن پاشا) داوێنپیسییان کرد لەگەڵ ئافرەتە دیلەکاندا. سەرکردەکان بە شان و باڵای حەسەن پاشایاندا هەڵدەدا.

جا ئەمە ئەگەر دەروونی موسڵمانەکان بێت و ڕەوای شتی وا نەنگە و ناپەسندن. ئیتر گلەیی لە یەزیدییەکان بۆچ بکرێت کە خۆیان بە دێوپەرستیان دادەنێن.

لە ساڵی (١١٦٧)ك سەرداری بەغداد (سلێمان پاشا) هورووژمی هێنایە سەر یەزیدییەکان، یەزیدییەکان لەسەر بەڵێن خۆیان دا بەدەستەوە، نامەردانە دەستی لێکردنەوە. هەزار پیاوی لـێ کوشتن، ئافرەتە جوانەکانیشـی بـرد بـۆ فرۆشتن.

ئەمین پاشای جەلیلی لەم هەڵمەتەدا یارمەتی تورکەکانی نەدا، هـەروەها لە ساڵی (١١٨١)ك لەلایەن سلێمان پاشای سەرداری موسڵەوە هێرشی کـردە سەریان، پاش کوشتن و تاڵان و بەدیلگرتنی یەزیدییەکان گەڕانەوە. لە سـاڵی (١١٨٧)ك سـەرداری موسـڵ (سـلێمان پاشـا) هـەڵی کوتایـەوە سـەریان. مەڕەکانی تاڵانکردن، سی کەسی لێگرتن، سی کوڕیشی لـێ داگیرکردن.

لـە سـاڵی (١١٩٣)ك محەمـەد پاشـای سـەرکردەی لەشـکری موسـڵ هەڵیکوتایە سەریان. شـینایییەکانی خـواردن و پێـنج کەسـی لـێ گـرتن و گەڕایەوە لای سلێمان پاشای جـەلیلی بـرای. ئەمـە چـەند نموونەیـەکی ئـەو هەڵمەتانە بوون کە برانە سەر یەزیدییەکان لـە سـاڵەکانی (١٢٠٦، ١٢٠٧، ١٢٠٨، ١٢٠٩، ١٢١٥، ١٢١٧، ١٢١٨، ١٢٢٤، ١٢٥١، ١٢٥٢، ١٢٥٤، ١٢٦٠)ی کۆچیشدا لە (بەغداد) یان لـە مـوسـڵ، یـان لـە شـوێنانی تـرەوە هەڵمەت دەبرایە سەر یەزیدییەکان.

گیار پاشای تورك بـە خـۆی و هـەزار سـەربازەکەیەوە هەڵیکوتایـە سـەر یەزیدییەکانی شەنگار، بەڵام کە زانی یەزیدییەکان لە دەربەندی (پیریتـی)دا دووسەد سەربازی لـێ کوشتن، لەترسی شکان و ئابڕووچوون دادی بردەوە بـەر یەزیدییەکان، کە داڵدەی بدەن و شەڕ بوەستێنن، تا سـەربازەکانی دەنێـژێت و

دەگەڕێتەوە بۆ موسڵ، ئەوانیش ڕێیان دا. ئیتر تا پەنجاساڵی تر شەڕ هەڵنەگیرسایەوە بەم ڕەنگە لەگەڵ ئەم هەموو کارەساتە سامناك و گرنگانەدا کە بەسەریاندا هات. یەزیدییەکان کۆڵیان نەدا و ورەیان بەرنەدا. لە (١٥/٩/١٩١٨)دا هێرشێکی تری بردە سەر یەزیدییەکان، هەرچی کاری خراپ بوو دەربارەی یەزیدییەکان کردیان، بەلاّم کاتێك زانرا لە (١٣/١١/١٩١٨)دا فەرمانڕەوای (عوسمانی) کۆچی کردبوو. شاری موسڵ کەوتە دەستی ئینگلیزەکان. دوابەدوای عوسمانی و حکومەتی عێراق باش بوو. لە ساڵەکانی (١٩٥٠)و (١٩٥٨)دا فەرمانڕەوای عێراق بە تەواوەتی خەمی پێشکەوتنی یەزیدییەکانی دەخوارد، چ لە (شێخان)دا، چ لە (شەنگار). هەموو لایەك باش بوو.

دوارۆژی ئاینی یەزیدی: کەس بەتەواوەتی ئەوە نازانێت کە نووسراوەکانی (جیلوە) و (مصحفارەش) لە بنچینەدا چ ناوەڕۆکێکی ناوازە و نایابیان هەبووە، کە بەو ڕەنگە لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەی سەری پەیڕەوەکانی ئاینی یەزیدی گەیشتووەتە نزیکەی ملیۆنێك لەگەڵ ئەم هەموو کوشتار و تالاّن و ڕیسواکردنەیشدا کە بەسەر یەزیدییەکاندا هاتووە، لەماوەی ئەم حەوت ساڵەدا، کەچی هێشتا ئاینەکەی خۆیان بەر نەداوە و تا دێت پتر لە جاران خۆشیان دەوێت و نازیشی دەکێشن، لەپێناویشیدا خۆیان بەخت دەکەن. ژمارەی سەری یەزیدییەکان ئەمڕۆ هەر بە سەد هەزار کەس دادەنرێت، کە لە هەموو لایەکی کوردستاندا بلاّوبوونەتەوە. بەڕاستی جێی داخە کە ئەم نەتەوە

کلۆڵە حەوتسەدساڵی خشت، خۆشیی ژیانی بەخۆیەوە نەبینیوە، هەموو هاوڕەگەز و هاونیشتمانێکی خۆیشی لەم ماوە درێژەدا دوژمنی بوویێت لە شەڕ و کوشتار و تاڵان.

چوارسەد ساڵی خشت (تورکەکانی عوسمانی) و سەردارنشینییەکانی کورد هورووژمیان بردە سەر یەزیدییەکان و لێیان کوشتن و تاڵانیان کردن، کچ و کوڕیان لێ بە دیل گرتن بۆ فرۆشتن. نەیانتوانی ئاینی یەزیدییەکان لە ئاینی خۆیان وەربگێڕن، نەیانتوانی سەر بە یەزیدییەکان دابنەوێنن. هەموو کارێکی خراپیان بەرامبەر بە یەزیدی کرد لەوانیش و لە پیاوە ئاینییەکانی ئیسلامیشەوە، دزی و پیاوخراپی و هەموو شتیان دەکرد.

ئەو هەموو کاری کوشتن و تاڵان و کچ ڕفاندن و ناخۆشییانە لەلایەن فەرمانڕەوا و پیاوە ئاینییەکانەوە بەرامبەر بە یەزیدی کراون. کە کوردن و لە کوردستانیشدا جێنشینن. یەزیدییەکانی قەفقاسیا ژمارەی سەریان دەگاتە (٢٥٠٠٠) کەس و لە ناوچەکانی تفلیس و (ئەریڤان، ئەلیکساندراپول، باکۆ و یاتوم)دا دەژین، زۆر پێشکەوتوون لە هەموو ڕوویەکەوە.

هەریەکێك بمردایە منداڵی وردی هەبوایە لەوانەی خۆیان یەکێك دەبووە سەرۆکی یەزیدی. ئەم شتە زۆری خایاند لە ساڵی (١٩٣١) کۆبوونەوەیەك لە موسڵ کرا لەلایەن ئەمانەوە شەش کەس دانران بۆ بەڕێوەبردنی کری یەزید و لە باوکییەوە بۆ کوڕ بمێنێتەوە.

## سۆفی:

ڕێبـازێکی ئـایینی تایبـەتی سـەری هەڵـدا لەلایـەن هـەڵگرانی ئـالاَی پاککردنـەوەی ئیـدیاکانی ئیسـلام کـە موڵکـداران، پـێش هەمووشـیان خەلیفـەکان شـێواندبوویان لـە سـەدەی حەوتـەوە، ئـیتر لـە ڕێبـاز و ئامۆژگاریـیـەکانی پێغەمبـەر دوورکەوتبوونـەوە، نوێنـەرانی ئـەم ڕێبـازە بانگەشەی تەرکی دونیایان دەرکرد و خەڵکیان هان دەدا واز لە موڵك و مـاڵ بێنن، خۆیشیان ژیانێکی سادە و هەژارانەیان بەسەر دەبرد و جلوبەرگی شڕیان دەکردە بەر، ڕایەکی وا باوە گوایـە ئەمانـە شـڕە جلـی (خـوری-صـوف)یـان کردووەتە بەر، بۆیە ناوی سۆفییان بەسەردا بڕاوە. ئەوەبوو لە سەرەتای سـەدەی هەژدەیەمەوە سۆفیگەریی بەناوبانگ لە بەسرا و کوفە و بەغـداد دەرکـەوتن، وەکو: ڕابیعەی عەدەوی سـاڵی (٧٥٤) مـردووە، مـەعروفی کـەرخی سـاڵی (٨١٦) مردووە. زەنوونی میسری سـاڵی (٨٦١) مـردووە. جونیـدی بەغـداد (٨٨٠) مردووە. حوسێن کوڕی مەنسوری حەللاج ساڵی (٩٢٢) مردووە.

ڕێبازی سۆفیزم هەر بریتی نەبوو لە بانگەشە بۆ پەیڕەوکردنێکی کتومتی شەریعەت، بەڵکو لەهەمان کاتدا نیشانەی داهاتنی چەرخ و قۆناغێکی تـازە بوو، کە مـۆرکی گـۆڕان و پێشـکەوتنی کۆمـەڵگای ئیسـلامی و هـەروەها ئاینەکەشی پێوەبوو.

دیاره سۆفیزم: پێش هەموو شتێك دەربڕینی ناڕەزایی بوو بەرامبەر بەو ڕەوشە (کۆمەڵایەتی) سیاسییەی لەئارادا بوو.

ڕێبازی سۆفیزم بە گشت بانگەشە و هاندانی بوو بۆ گەڕانەوە بۆ شەریعەتی ئیسلامی و سونەتی پێغەمبەر. ڕابەرانی ڕێبازی سۆفیزم لە چۆنییەتی گەیشتن بەو ئامانجە یەك ڕا نەبوون. بۆیە چەند ڕێگە و شێوازێکی سۆفی پەیدابوون، کە پێیان دەوترێت (تەریقەت)، ئەم زاراوەیەش ماناکەی دەبێتە ڕێگەی تایبەتی بە حەقیقەت و دڵنیایی و یەکبوونی لەگەڵ خودا، لەمانە تەریقەتی قادری، ڕفاعی، شازلی، سوهرەوەردی، مەولەوی، نەقشبەندی و هی تر.

پلەکانی تەریقەت لەو پلانەوە، لە تەریقەتەکەیەوە بۆ ئەویتر دەگۆڕێن، لە هەندێکیاندا (٢٥) پلە، یان مەقام هەیە لە تۆبەکردنەوە تا دەگاتە پلەی کۆیلەیی (عبودییەت).

تەریقەتی واش هەیە تەنها چوار پلەیە: شەریعەت، تەریقەت، مەعریفەت و حەقیقەت.

## تەریقەتی قادری:

بە ناوی سۆفی بەناوبانگ شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە (١٠٧٧-١١٦٦)ز، کە کوردێکی خەڵکی گوندی گەیلانی لای کرماشان بووە لە کوردستانی خوارووی خۆرهەڵات. نەوەی شێخ عبدولقادر عەبدولکەریمی گەیلانی (١٣٦٦-١٤١٠)ز تەریقەتەکەی هێنایە کوردستانی ناوەڕاست و لەوێ شێخەکانی نەهری سیلسیلەی خۆیان بۆ ئەو دەبەنەوە.

لە دەوروبەری ساڵی (١٣٦٠)دا دوو برا (عیسا و موسا) لە هەمەدانەوە بۆ شارەزوور هاتن و بنەماڵەی بەرزنجیان لەوێ دامەزراند، دوای ئەوەی لە کوردستانی ناوەڕاستەوە ئیجازەی تەریقەتی قادرییان وەرگرتبوو، هەموو شێخەکانی دواتری ئەم تەریقەیە، جگە لە شێخەکانی پێش ئەو دوو تەریقەتەی تر لە کوردستاندا باوبوون شازلیە و نوربەخشی، دامەزرێنەری تەریقەتی نوربەخشی، سەید محەمەدی نوربەخش، برای عیاد موسای بەرزنجی بووە، دواتر سەید بابە ڕەسوڵ تەریقەتی عەلەوی وەرگرت، کە لقێك بوو لە خەلوەتیە و لەناو بەرزنجییەکاندا بوو، تا کوڕی سەید محەمەدی نۆدێ لە گوندی قازانقایە سەید ئیسماعیل چوو بۆ بەغداد و لەسەر دەستی شێخ ئەحمەد ئیحسانی تەریقەتی قادری وەرگرت و ئەمەبوو قادری لەناو زۆربەی شێخەکانی کوردستاندا بڵاوکردەوە.

نەهری، سیلسیلەی خۆیان بۆ شێخ عیسای بەرزنجی دەبەنەوە کە نازناوی (قوتبی عارفین)ی هەبووە. قادری هەتا سەدەی نۆزدەش تاقە تەریقەتێکی زاڵ بوو لە کوردستاندا.

## تەریقەتی نەقشبەندی:

ناویان دەبرد بە (المجدرية) لەکاتی پەیدابوونیدا لە سلێمانی یەکێك لە گۆڕانکارییەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لە ژیانی پەیڕەوکەرانیدا دایهێنا، ئەوەبوو کە بەجۆرێکی هۆشمەندانەتر و واقیعییانەتر سەیری دوورەپەرێزی خەڵوەتی دەکرد. لە ڕوانگەی نەقشبەندییەوە مورید و دەروێش پێویستە هەموو دەمێك لەناو کۆمەڵدابن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەبێت هەمیشە فیکر و خەیاڵیان لای خوا بێت، ئەم تەریقەتە لەلایەن مەولانا خالید (شێخ زیائەدین) خالید نەقشبەندی، ساڵی (١٨١١) گەیشتووەتە سلێمانی، بەزۆر جێگای خۆی لە کوردستاندا کردەوە و بووە بە مونافیسی یەکەمی تەریقەتی قادری. زۆری نەخایاند کە پەلی بۆ کونجێکی جیهانی ئیسلامی هاویشت و خانەقاکانی لێ دامەزراند، هەر لە نەهری کوردستانەوە تا مەککە، لە مەدینەوە تا دیمەشق لە قودسەوە تا ئامێدی لە بەغدادەوە تا ئەمڕۆ و ئازربایجان، مەولانا خالید لای ڕای وا هەیە کە ڕەوتی ئەم تەریقەیە، گوایە لە سەدەی شانزەوە لە کوردستاندا هەبووە، شێخ شەهابەدین ڕەزبەدین لە هەورامان بانگەشەی بۆ کردووە.

شا عەبدوللای دەهلەوی لە هیندستان ئیجازەی وەرگرتووە، مەولانا خالید چوار ژنی هێناوە، دووانیان بۆ مەبەستی سیاسی بووە. لە ئەنجامدا شێخەکانی قادری و میراتی بابان بەئاشکرا کەوتنە دژایەتیکردنی مەولانا خالید و پەیڕەوکەرانی، تەنانەت شێخ مارفی نۆدێ تۆمەتی کفر و ئیلحادیشی نایە پاڵ مەولانا و داوای لە پیاوانی ئاینی کرد کە فتوای لەسەر بدەن.

لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەری مەولانا خالید تا دەهات فراوانتر دەبوو، لە ساڵی (١٨٢٠) بە یەکجاریی سلێمانی بەجێهێشتووە و لە دیمەشق لە ساڵی (١٨٢٨) بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوایی کردووە.

زیکری نەقشبەندی بەکرپی و هێمنی، مورید بە تەنها لە کونجێکدا دادەنیشێت و چاوەکانی لێك دەنێت لەناو دڵی خۆیدا لە خودا دەپاڕێتەوە و پەنا دەباتە بەر شێخەکانی تەریقە و ڕابەر (مورشید)ی خۆی.

لەکاتی زکردا جاری واهەیە هاوار دەکات، ئەوەی هاتە سەر زاری نایگێڕێتەوە، زۆر بەشی کفر و ئیلحادە، بەلام لێی ناگیرێت لە جیهانی دەروونیشدا ئەم مقانە پێیان دەگوترێت (شەتحە).

## ڕێبازی حەقە:

ساڵی (١٩٢٠) لە ئەنجامی پەرەسەندن و گەشەکردنی باوەڕ و ناوەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندیدا، دیاردەیەکی فیکری ڕۆحی و بەگشتی، کۆمەلایەتی لە ناوچەی کوردستانی خواروو سەری هەڵدا و لەمەدا شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، شێخ تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەکەدا ڕۆڵی باڵا و سەرەکی بینی. بانگەشەی برایەتی و یەکسانی دا و موڵکداریەتی هاوبەشی پەیڕەوکەرانی خۆی ڕاگەیاند، ئەم کارەی شێخ عەبدولکەریم گەلێ ڕادیکاڵییانە بوو، بەتایبەتیش بۆ کۆمەڵگایەکی سەر بە پەیوەندیی خێڵەکی و دەرەبەگایەتی کە لەسەر بنچینەی موڵکداریەتی تاکەکەسی و چەوسانەوەی دەسەلاتدار

دامەزرا، بۆیە هەقەکان، واتە کۆمەڵگەی شێخ عەبدولکەریم، هەر زوو کەوتنە بەر هێرشی و پەلاماری مەلا و شێخ و فەتواکانیان.

ساڵی (١٩٢٧) موریدێکی پێنجەمین شێخی نەقشبەندی لە بارزان، شێخ ئەحمەد بانگەشەی خوایەتی شێخی خۆی داو خۆشی بە پێغەمبەری ئەو دانا، بەڵام ئەو پێغەمبەرە دوای چەند مانگێك مرد و بانگەشەکەش لەئارادا نەما، لێرەدا هەڵوێستی شێخ ئەحمەد ڕوون نییە چۆن بووە.

هەقەکان دەبووایە هەمیشە لایەنی هەق و ڕاستی بگرن، بەم بۆنەیەشەوە ئەمان وشەی (هەق)یان لە قسەو گفتوگۆدا دووبارە دەکردەوە، بۆیە ناوی هەقیان بەسەردا برا.

ڕێڕەوی شێخ بۆ ئەوەبوو بۆ گۆڕین و چاککردنی کۆمەڵگا بوو. چاوەڕوانی هاتنی مەهدییان دەکرد، بەڵکو لەجیاتی گەڕان بەدوای دادی کۆمەڵایەتیدا، لە ئاسمان و لەسەر زەمین بۆی گەڕان.

گۆڕانکاریی هەرە گرنگ و ئەوەی هەقەکان دایانهێنا، لەلایەنی عەقایدییەوە بۆ پشتگوێخستن فەرزێکی گرنگ و سەرەکی ئیسلام وەکو نوێژکردن، بە مەشەوە ڕق و دوژمنداریيەتی خەڵکی موسڵمان و ئیماندارانیان بەسەردا بڕی، بەڵام هەقەکان هەروا بێ بنچینە ئەم هەڵوێستەیان وەر نەگرتبوو، بەڵکو ئازایانە داکۆکییان لە بوونی خۆیان دەکرد و هەر لە قورئان و شەریعەتەوە بەڵگەیان بۆ هەڵوێست و ڕەفتاری خۆیان دەهێنایەوە، مامە ڕەزا لە دەمەتەقیەکیدا وتبووی بۆیە وازیان لە نوێژکردن هێناوە، چونکە گەیشتوون بە یەقین و بەپێی ئایەتێکی قورئان کە گوتراوە (اسجد لربك حتى

يأتيك اليقين)، يان ڕاستييەكەی (وأعبد ربك حتی يأتيك اليقين). هەقـەكان بۆ ئەم ئايەتە، لێكدانەوەيەكی ژيرۆكانەيە ئەگەر ئەمان گەيشتبن بە يـەقين و دڵنيايی ئەوا چيتر پێويست بە نوێژكردن ناكات.

هەموو موڵـك و ماڵيـان كـرد بـە يـەك، دەوڵەمەنـد و هـەژار نـەمان، بەمەشەوە جياوازی چينايەتييان نەهێشت. هەروەها ئافرەتيان ئازاد كرد و لـە هەموو ڕوويەكەوە بوو بە هاوتای پياو، لەلايەن حكومەتەوە بە كۆمۆنيزم لـە قەڵەم دران هەر بەو تاوانەش لە ساڵی (١٩٤٤)ز مامە ڕەزا بەندكرا.

١- برايەتی: هەموو ئەندامانی هەقە برا و خوشكی يەكترين و لە هەموو ڕوويەكەوە يەكسانن.

٢- هەقايەتی: مرۆڤ هەقـە هەميشـە و لـە هـەموو حاڵەتێكـدا دەبێـت لايەنی حەق و ڕاستی بگرێت.

٣- ژيانی هاوبەشـی: هەقـەكان هـەموويان پێكـەوە ژيـانێكی يەكسـان دەژين، موڵك و ماڵی هەر يەكێكيان هی هەموويانە.

٤- ئابوونە: هەريەكێك يان هەر خێزانێـك دەبێـت مانگايـەك بـدات بـۆ بەڕێوەبردنی كۆمەڵەكەيان.

٥- بڕيار دەركردن: لە تەكييـەدا، كـە ئێـواران لێـی كۆدەبوونـەوە بڕيـار لەسەر هەموو شتێك (گەورە و گچكە)دەدەن.

٦- ئازادیی ئافرەت و يەكسانی لەگەڵ پياودا.

٧- ڕەوشت: ڕەچاوكردنی ڕاستگۆيی و دڵپاكی و دەروون چۆن لە ياساكانی كۆمەڵەدا.

٨- ڕێکخستن: لە هەر شوێنێکدا چەند کەسێکی هەقە بژین دەبێت تەکییە دابنێن و کۆبوونەوەی لێ بکەن و سەرتەکییە هەڵبژێرن.

تەریقەی دیکە هەیە: وەك تەریقەی تیجانی و تەریقەی بەکتاشی، بەپێی سەرچاوەکان نزیکەی سێ هەزار کورد سەر بەو تەریقەی تیجانییەن، دەوروبەری نیوەی ئەم ژمارەیە لە سوریا، لە ناوچەی چیای کوردان و (جبل الأكراد) و سەرووی شاری حەلەبدا دەژین و نیوەکەی تریش لە کوردستانی تورکیادان.

دوای کۆچی دوایی شێخ عادی یەزیدی سالّی (١١٦٠)، برازاکەی ئەبو بەرەکات کوڕی سەخەر کوڕی مسافر لە جێگەی ئەو دانیشت، ئەمێش بە پیاوچاك و ئیماندار ناسرابوو و لە لالش نێژراوە, دوای ئەو کوڕی ئەبو بەرەکات (ابو المطاهر الشيخ عدى) بوو بە خەلیفەی باوکی، کە بە (عودەی الكردى) ناوی دەرکردووە.

سالّی (١٢١٧) کۆچی دوایی کردووە، کوڕی ئەمیش لە لالشە، لێرەدا ئەگەر پشتگیری بۆچوونی سەرچاوە عەرەبییە بکەین و لاشیان وایە کە شێخ عادی عارەب بووە و لە شامەوە هاتووە، ئەوا پرۆسەی بەکوردبوونی ئەم بنەماڵەیە لە دووەمین خەلیفەی شێخ عادییەوە تەواوبووە، لەمەودواتر گومان لەسەر کوردایەتی بنەماڵە و خەلیفەکانی شێخ عادی نامێنێت.

(شمس الدين ابو محمد الحسن) سالّی (١١٩٤) لەدایك بووە کە بە شێخ حەسەن ناسراوە. لە شوێنی باوکی (عدى الكردى) دانیشت، شێخ حەسەن

نازناوی (تاج العارفين)ی هەبووە. یەزیدی بە (حەسەنی بەسری) ناوی دەبەن. زۆر زیرەك و بەهرەدار بووە، شیعر و نووسینی لەسەر تەسەوف هەیە، بۆ ماوەی شەش ساڵان چووەتە خەڵوەت و کتێبێکی بەناوی (الحلوة لأهل الحلوة) داناوە، گوایە ئەم کتێبە ون بووە و کەس ناوەرۆکەکەی نەبینیوە.

شێخ حەسەن لە ساڵی (١٢٤٦)دا گیرا و کوژرا لەلایەن ئەتابەگی فەرمانڕەوای موسڵەوە گۆڕی شێخ عادی تێکدا و ئێسقانەکانیشی سووتاند و زۆری لە یەزیدیان کوشتووە.

بەم جۆرە دەردەکەوێت کە ڕێکخەری سەرەکی بزووتنەوەی ئاینی و پاستی ئیزیدی شێخ حەسەن بووە. هەر ئەویش بووە دانەری فیکرە و ئیدیۆلۆگیای ئیزیدزم، کە پێدەچێت لەناو دووتوویی کتێبەکەیدا (الحلوة لأهل الحلوة) دارێژرابێت.

لە ڕاستیدا سەدەی شانزەیەم قۆناغێکی تری بۆ ڕۆڵی سیاسی ئێزیدیان داهێنا. دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتای دامەزراندنیدا، بایەخێکی زۆری بە یەزیدیان داوە، پشتی پێ دەبەستن، ساڵی (١٥٣٤) ناوچەی هەولێر درایە میری یەزیدیان حوسێن بەگ داسنی، دواتر سوڵتان سلێمان هەموو سۆرانی خستە سەر هەولێر و میری داسنی دەستی بەسەر هەموویدا دەڕۆیشت و لەلایەکی تریشەوە عیزەدین یوسفی کوردی ساڵی (١٥٤٣) مردووە، کە لە بنەماڵەی شێخ مەند بووە. دەستی بەسەر ئیمارەتی (قصینر)دا گرت و دواتریش بوو بە فەرمانڕەوای حەلەب. هەر لەماوەی سەدەی سیازدەدا

ئێزیدییەکان میرنشینێکی گەورەیان بە ناوی (قەلب و باتمان) دامەزران، هەموو ناوچەکانی بۆتان کە دیاربکەر، جزیرە، زاخۆ و موسڵی دەگرتەوە. ژمارەیەکی زۆری خێڵی کوردی و ناکوردی موسڵمان لە ڕووبەرەکەیدا دەژیان، هەروەها میرزا پاشای داسنی کە یەزیدییەکی خەڵکی بەعشیقە بوو، سالآنی (١١٦٥٠-١٦٥١) فەرمانڕەوایەتی موسڵی کردووە.

هۆکاری سیاسی: هەمیشە ئەو ڕەوشەی لە ئەنجامی جیاوازیی ئایینـدا دروست دەبێت بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاردەبات، ناکۆکی فیکری و عەقائیدی موسڵمان و یەزیدی زەمینەیەکی لەباری بۆ شەڕ و پێکدادانی ناوخۆیی ڕەخساندبوو. لە ئەنجامدا یەزیدییەکان نەك هەر دەستەڵاتی جارانیان نەما، بەڵکو زیانێکی ئێجگار زۆریان لە ژیان و ماڵی لێ کەوت لە سالآنی (١٦٣٨ و ١٦٥٥)دا مەلیك ئەحمەد پاشا والی کوردستانی سەروو و چەند لەشکرکێشییەکی خوێناویی کردە سەر یەزیدییەکان، دواتریش لە ساڵی (١٨٠٠) ئیبراهیم پاشای میری بابان دای بەسەر ئیزیدیاندا و زەرەر و زیانی زۆری لێدان. هێرشەکەی میری سۆران پاشای کۆرە لە ساڵی (١٨٣٢) بۆ یەزیدیان لە هەموو ئەوانەی پێشوو وێرانکاریتر بوو.

## کتێبی پیرۆزیان:

جیلوە و مەسیحە فارەش، ناوەرۆکی جیلوە بریتییە لە ئامۆژگارییەکانی خوایی و یەزیدییەکان حەلاڵ و حەرام و سزا و پاداش بۆ (یاریکردن، هێز و توانای خالیق و سیفاتەکانی نیشان داون). هەروەها جێگە و بایەخی ئیزیدیانی لەناو کۆمەلانی خەڵکی تردا دەستنیشان کردووە و ڕێگەی بۆ داناون، کە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ پەیڕەوکەرانی ئاینی تردا چۆن بێت. نووسەر و کاتی نووسینی جیلوە نەزانراوە. بەرهەمی نووسینی جیلوە نەزانراوە. نووسەری وا هەیە بە بەرهەمی شێخ عادی دادەنێت.

مەسیحە فارەش: باسی خەلقی دنیا و نەژادی و ڕەچەڵەکی ئیزیدیان دەکات. واباوە کە ئەم کتێبە هی شێخ حەسەن لە قەڵەم بدرێت. ئەمین زەکی بەگ گریمانی ئەوە دەکات کە مەسیحە فارەش ساڵی (١٣٤٢)ز نووسراوە، ئاماژە بۆ هیچ بەڵگە و سەرچاوەیەك ناکات.

مەلەکە تاوس: گرنگترین ڕۆڵی لە ئایین و کتێبە پیرۆزەکانی یەزیدا هی مەلایکەت، یان خواوەندی سەرەکییانە مەلەکە تاوس، کە لە یەکەمین ڕۆژی خەلقی دونیادا ئەمیش خەلکراوە. واتە لە ڕۆژی یەکشەممەدا. مەلیکە تاوس بە فەرمانی خوا، هەتاوی خەلق کردووە و خۆی بووە بە خواوەندی هەتاو، هەر بە فەرمانی خواش ئادەمی فریوداوە. کە گەنم بخوات و بەمەشەوە لە بەهەشت دەربکرێت، کەچی لە دەقی مەسحوقە ڕەشدا لەسەر شاکر فەتاح، کە تاوس بەبێ ئاگاداری خوا ئەمە دەکات و لە سزادانیش ڕزگاری دەبێت.

بەگوێرەی جیلوە مەلیکە تاوس خوایە و هەمیشە هەر هەبووە! ئەم کتێبی جیلوەیە بۆ یەزیدیان ناردووە، تا بێنە سەر ڕێگای ڕاست. بەم جۆرە مەلەکە تاوس لە مەسحە ڕەشدا یەکێك لە حەوت مەلائیکەتە خواوەندەکانە، کەچی لە جیلوەدا خوا خۆیەتی، لە هەردوو کتێبەکەدا ناکۆکی هەیە، یەزیدییەکان حەوت دانە سنجاقیان هەیە، مەلیکە تاوس پێی دەڵێن سنجاق کە بریتییە لە پەیکەری باڵدارێك لەسەر دارێکەوە وەستاوە.

١- تاوس ئێزدی (عەنزەل) ئەمە سنجاقی سەرەکییە و تایبەتییە بە شێخان، مەڵبەندی یەزیدییەکان ساڵی سێ جاران بە گوندەکانی ئەم ناوچانەدا دەیگێڕن.

٢- تاوسی سنجار: ساڵی جارێك بە گوندەکانی ئەم ناوچەیەدا دەیگێڕن.

٣- تاوس حەلەب: ساڵی جارێك بۆ یەزیدییەکانی سوریای دەبەن.

٤- تاوس خالدی: هی کوردستانی تورکیایە (دیار بەکر).

٥- تاوس مەسقونی: هینی یەزیدیانی ئەرمەنستانە.

٦- تاوسی تەبریز: هینی یەزیدییەکانی ئێرانە.

٧- تاوس زوزان: هینی ناوچەی هەکارییە.

گۆڕی شێخ عادی لە لاس: نزیك گوندی باعەزرا بووە بە قیبلەی یەزیدیان بەلای کەمەوە هەموو یەکێك ساڵی جارێك دەبێت حەجی بۆ بکات. خوڵی گۆڕەکەی بە پیرۆز دادەنێن تپەڵەی بچووکی لێ دروست دەکەن و پێی دەڵێن (بەراتە). دەبێت هەموو یەزیدییەك ئەوەی لەلابێت، هەروەها دانەیەك دەخەنە دەمی مردووەوە.

سەبارەت بە شێخ فەخرەدین کە (پەدین)یشی پێدەڵێن و فریشتە نورائیلە و بەگوێرەی مەسحە فارەش، ئادەمیزاد و گیانلەبەری دروستکردووە، کەچی هەر لە مەسحەقە ڕەشدا گوتراوە کە خوا ئادەمی لە چوار توخم دروستکردووە. خۆڵ، هەوا، ئاو، ئاگر و هەموو مرۆڤایەتی بە یەزیدانییەوە لە ئەمەوە پاش کەوتوون.

قەدەغە و تابلۆی یەزیدیان:

١- هەرکەسێك گەورە و بچووك، ئەگەر ساڵی سێ جار زیارەتی مەلەکە تاوس نەکات، کافر دەبێت.

٢- هەموو کەسێك گەورە و بچووك، ئەگەر ساڵی جارێك زیارەتی گۆڕی شێخ عادی نەکات، لە (١٥ بۆ ٢٠)ی تەیلویل ڕووی کافر دەبێت.

٣- هەموو کەسێك ئەگەر هەموو بەیانییەك نەچێتە ئەو شوێنەی ڕۆژی لێ هەڵدێت، بەمەرجێك کەسی سەر بە ئاینی تر نەبینێت کافر دەبێت.

٤- هەموو کەسێك ئەگەر هەموو ڕۆژێك دەستی برای ئاخیر و شێخ و پیرەکەی ماچ نەکات، کافر دەبێت.

٥- هەر یەزیدییەك ئەگەر گوێی لەوەبوو کە موسڵمان نوێژی پێ دادەگرن (أعوذو بالله من الشيطان الرجيم) ئەگەر ئەو کەسەی نەکوشت دەبێت خۆی بکوژێت، دەنا کافر دەبێت.

٦- لەکاتی مردنی یەزیدییەکدا، ئەگەر برای ئاخیرە و شێخ و پیرەکەی لەسەر نەبن، تەڵقینی نەدا، بەکافری دەمرێت.

٧- هەر کەسێك ئەگەر هەموو بەیانییەك بەراتە، واتە خۆڵی سەر گـۆڕی شێخ عادی، نەخوات، یان کە مرد ئەو خۆڵەی پێ نەبێت، کافرە.

٨- لەکاتی ڕۆژووگرتنیشدا ئەگەر هەر کەسـێك ڕۆژووەکـەی لای شـێخ و پیرەکەیەوە دەست پێ نەکرد و ئێوارەش بەشدار بێت پیرۆزی شێخ، یان پیرەکەی ڕەفتاری نەکردووە، ڕۆژووەکەی بەتاڵە و کافر دەبێت.

٩- هەرکەسێك ماوەی سـاڵێك دیـار نـەبوو، ژنـەی خـۆی حـەرام دەبێـت کەسیش ژنی پێ نادات و کافر دەبێت.

١٠- ئەگەر کراس و شەرواڵی تازە، پێش کردنە بەری، بە ئاو گۆڕی شـێخ عادی نەشۆرێت، ئەوەی بیکاتە بەر، کافر دەبێت.

١١- لەکاتی دوورینی کراسێکی تازەدا، ئەگەر خوشکی ئاخیرەی ئەوکەسە یەخەکەی بۆ نەبڕێت و نەیکاتە بەری، کافر دەبێت.

١٢- یەزیدی ناتوانن جلوبەرگی شین بکەنە بەر، یان قژی خۆیـان شـانەی موسڵمان و زیان و جوو شانە بکەن، ئەگەر گوێزانێك بە ئاوی مەرقەدی شـێخ عادی نەشۆرابێتەوە نابێت سەری پێ بتاشن.

١٣- یەزیدی نابێت بچێتە گەرماو و ئاودەستخانە، نابێـت لـەناو قـاپ و ئامانی موسڵماندا نان بخوات.

١٤- بۆ یەزیدیان قەدەغەیە خواردنی گۆشتی ماسـی، کولەکـە، بامیـە، فاسۆلیا، کەلەرم، خاس تەنانەت لەم شوێنەدا بن کە خاسی لـێ چێنراوە.

ڕۆژانــە دوو نوێـژ دەکـەن، لـە بەرەبـەیان و خۆرئاوابوونـدا، بـۆ نوێـژی بەرەبەیان. یەزیدی دوو ڕۆژووگرتنیان هەیە، یەکێکیان گشتییە کە هەموویان

دەیگرن بە ناوی ڕۆژووگرتنی یەزید، ئـەوی تـریش ڕۆژووگرتنـی خدرئـەلیاس تایبەتی و تەنیا بۆ پیاوانی ئاینییە.

یەزیدی ڕێگەی پیاوی داوە شەش ژن لەدوای یەکەمەوە بێنێت، (مەسـحە فارەش) بەشی (٩)، زۆریش بە ئاسانی دەتوانێت لێیان جیابێتـەوە، تـەڵاقیان بدات. بۆ پیاو ئەوەندە بەسە بە ژنی خۆی بڵێت تۆ شـێخی منـی، یـان پـیری منی، دایك، یان خوشکی منی.

مردن: وشەی مردن بەکار نابەن، چونکە باوەڕیان بـە دوونـادوون (تناسـخ الأرواح) هەیە و لایان وایە کە مرۆڤ هەرگیز نامرێت، بەڵکو ڕۆحەکـەی هـەر زیندووە لە لەشێکەوە دەچێتە لەشێکی تـر، بۆیـە ئـەمان بـە مـردن دەڵـێن (کراس گۆڕی). دەڵێن مرۆڤ نامرێت جل دەگۆڕێت.

هــەر لەســەر باســی یەزیــدی: یەزیدییــەکان ئێســتا و ڕابردوویــان- عەبدولڕەزاق حسنی، بەرگی حەوتەم، (موسعة وفریـدة) (١٤٠٠ك-١٩٨٠ز)، لە کتێبی جلوەدا هاتووە، کە کتێبێکی پـیرۆزی لای یەزیدییەکانـە، دەڵێـت، پارێزگاری زانیارییەکان بکەن کە ڕێگاتان نیشـان دەدات. ئەوانـەی خزمـەت دەکەن، ئەوانەی دێن و دەڕۆن مەبەست لە نـامۆی وەك جولەکـە، مەسـیحی، ئەنصاری، ئیسلام و هـەموو لایـەکی دیکـەی وەك ئەوانـە، چـونکە ئەمانـە زانیاری هەزارانن، کتێبەکانیان مـەدونی، چـونکە ئـەیگورن و ئێـوەش پێـی نازانن، هەموو شتێك لەبەرکەن کە ئەوە غەیبە. نهێنییە ئـەگینا لەسـەرتان ئەگورن.

پیاوە ئاینییەکان، ئیسلامەکان، یەزیدییەکان دەبەنەوە سەر یەزید و کورشی مەعاویە. هەندێك لە خۆرهەڵاتناسەکان ئەمان دەبەنەوە سەر ئاینی ئاری و دەڵێن وشەی یەزید، لە کوردی و فارسییەوە هاتووە. یەزدان، بەواتای خوا.

هەندێکی تر دەڵێن یەزیدی لە وشەی (یەزد)ەوە هاتووە، کە شارێکی فارسی بەناوبانگە، هەندێکی دیکە دەڵێن دەیانبەنەوە سەر (یەزیدی کورشی ئایسەی خارجی).

پێشتر لەم جێگای یەزیدییەکان- ئاینی دیکەی تیابووە و زراتەشتی- بەهۆی هاتنی ئیسلامەوە ئەو ئاینە لەناوچوو، ئەمانە پاشماوەی ئەو ئاینەن بەشێوەیەکی دیکە، چونکە ئاینی کۆنی لەناوچوو، ئاینی تازەی ئیسلامیش هاتەکایەوە، ناچار ئەمانە و ئاینەکەیان تێکەڵاوە.

پەیدابوونی سۆفیگەریی و بڵاوبوونەوەی ئەوانەی بەم کارە هەڵدەستن، لەو جێگایانەدا باوەڕی ئەو خەڵکەیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا و پاش خۆیان نەوەکانیان و خەلیفەکانیان، زۆرجار ئەمانە باوەڕی کۆنەکەیان تێکەڵ دەکرد. لە هەموو بیروبۆچوونی ئەو شێخانەوە بەم شێوەیە (شێخ عودەی کورشی مسافری ئەمەدی) وابووە لەو ناوە.

زۆرجار ئەو خەڵکەی کە دەبوونە سۆفی، یان دەروێش، دەکەوتنە دوای بیروباوەڕی شێخەکەیان هەرچۆنێك بوایە، کە ئەمەش لەگەڵ شەرع و عەقڵدا نەدەگونجا.

تیرەیەکی کوردی کە بەناوی (تریاهـا) یـان تراهـەکان- هاتوونەتـە ئـەو جێگایە و لەسەر ئاینی زەراتەشتی بـوون- لەگـەڵ ئەمانـەدا تێکـەڵ بـوون. باوەڕیـان بـە (دوونـادوون) هـەبووە. پـاش ئیسـلام و هـاتنی شـێخ عـودەی ئاینەکەیان وای لێهاتووە.

ناوی یەزیدی پێش سەدەی شەشەم نەبووە تا هاتنی- شێخ عودەی و لەسەر ڕۆیشتنی (تەریقەی عدویە) و بەم شێوەیە پێیان وتوون عدویە بەو تایفەیـە، پاشان پێیان وتوون یەزیدی.

ژمارە (٣). یەعقوب سـەرکیس لـە نووسـینە ئارامەکەیـدا کـە (راهـب رامیشوع) لە ساڵی (٨٥٥ك-١٤٥١ز) نووسیویەتی و گۆڕاوە بۆ فەڕەنسـی وا دەڵێت:

ناوی باوکی مسـافر کـوڕی ئەحمـەد، کـە ئـەوە لـە کوردەکـانی تیراهیـە (TAIRAHITES)یە، لـە هاوینـدا لـە زوزات دەبـوون و لـە زسـتاندا دەهاتنە دەوروبەری موسڵ. دانیشـتووانی زوزان هاتوچـۆیان لەگـەڵ خزمـانی (عـادی)دا بووە، ئەمانە، واتە یەزیدییەکان (٦٥٠) ساڵ بـوون ئەوانـەی کـە خزمی عادی بوون و ئیسلام و هەم کود بوون هەزار ماڵێك بوون.

لەکاتی شێخ عودەیدا ئەم تایفەیە پێیان وتوون (عدویە) بە ناوی شێخەوە لە ساڵی (٥٥٧ك-١١٦١ز) کۆچی دوایی کردووە.

لە مەسحەفە ڕەشدا وا هاتووە لە لافاوەکەوە تا ئێستا حەوت هەزار سـاڵە و لە هەموو هەزار ساڵێکدا خوایەکی تازە دێتە خوارەوە، لەو حەوت خوایە -

ئەو خوایە- ئایات و یاسا و شەرعمان بۆ دادەنێت و دەڕواتەوە. هاتنی کەی بۆ لای ئێمە دێت و بە زمانی کوردی لەگەڵماندا دەدوێت.

مەزهەبی تراهی مەزهەبی زەراتەشتییە (ابن اثیر) لە لاپەڕە (٨٢) لە بەرگی دوانزەیەمیدا دەڵێت: ئەمانە کافرن و ئایین و مەزهەبیشیان نییە و لە سنووری سۆران دەرچوون بۆ تالانکردن. ئەمەش لە ساڵی (٦٠٢ك و ١٢٠٥ز)دا بووە.

یەزیدی لە سەرەتاوە زەردەشتی بوون- بوونە ئیسلام، لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمین زوو دانەری (تەریقەتی عەدوییە)، یەکەم لایەن باوەڕیان پێ هێنا یەزیدییەکان بوون.

بەشێوەیەکی وا سەیریان دەکرد کە جیایە لە مرۆڤ، پاش ئەوەی لە ساڵی (٥٥٧ك-١١٦١ز) کۆچ دوایی کرد. لەنێوان خەلیفەکانیاندا هەندێ شت پەیدابوو، ئەوەش دوورخستنەوەیان بوو لە زانیاری ئیسلامییەتی و خستنەوەیان بۆ سەر ئاینە کۆنەکەیان.

باوەڕی تەوایان بە یەزیدی کوڕی مەعاویە هەیە، هەتا دەڵێن خودایە. باسی پەری و -خوداو- ئادەم و حەوا دەکات بە دووروودرێژی وەك ئەوە پێشوودایە.

## کۆمەڵەی ئەهلی هەق (کاکەیی):

ناوی ڕاستەقینەیان ئەهلی هەق و ئەم ناوەیان لاپیرۆزە، لە عێراقدا پێیان دەڵێن کاکەیی، لەلایەن پسپۆڕ و لێکۆڵەوانیشەوە زیاتر بەناوی (عەلی ئیلاهی)یەوە ناسراون.

عەلی ئیلاهی(٤-٥) ملیۆنیان هەیە.

بە دایلەکتەکەیان دەڵێن (ماچو) زمانی ئاینی ناوچەی شنرۆیە و ئەدەبیاتی دینی ئەهلی هەقی تیادا نووسراوەتەوە.

ئەمانە شاخۆشین سوڵتان ئیسماعیل بەرزترن لە عەلی، بۆیە بەمانە ناوترێت عەلی ئیلاهی. خۆیان ناوی (ئەهلی هەق) بەڕەوا دەزانن بەحساب خۆیان بە خاوەنی باوەڕی ڕاست و هەقی دادەنێن. دوو ناوی دیکەشیان هەیە - یارسانی و کاکەیی- یەکەم وشەی یارستان بە مانای وڵاتی یاران، ڕایەکی تر دەڵێت، خەڵکی هەورامان سوڵتان دەکەن بە سان و لای ئەمان ناوی سوڵتان ئیسا دەبێ بە سان ئیساوە، کەواتە مانای یارسان دێتە یاران سوڵتان. ئەمەی دووەم ڕاسترە.

بە قسەی ڤ. ژوکوفسکی. ئێرانییەکان دوو ناوی تریش بۆ ئەهلی هەق بەکاردێنن، کردبەچە، بە مانای بەچەی کورد و خروس کوش.

دووەم نەریتێکی ئاینیان دراوە (دۆگماکانی ئەهلی هەق: ئەوەی سیمای ئاینزایی، یان تەریقەیەکی ئاینی بە ئەهلی هەق دەبەخشێت، دوو مەبدەئی

تەسەوفە، بەتایبەتی تەسەوفی ئەوپەرگی ئەویش -یەکێتی بوون (وحدة الوجود) و تەجسیدی ئیلاهی الحلول.

ئاینی ئەصلی هەقە، ڕێبازێکە دەربارەی بوونی خوداوەند لە هەموو شتێکدا... نوری خودا لە هەموو شتێکدا هەیە تەنانەت لە ئاژەڵیشدا، ئازاردانی ئاژەڵ، خوا تووڕە دەکات، مەبدەئی دووەم تەجسدیی خودایە (حلول). لە ڕوانگەی ئەمەیشەوە، گوایە خوا لە لەشی ئادەمیزادێکدا تەجسید دەکات و دێتە ناو خەڵك، ئەصلی هەقە باوەڕی تەواویان بەم فیکرەیە هەیە، بگرە یەکێك لە بنچینە و بنەماکانی ئاینەکەیان، بەڕای ئەمان خوا چەندین جار بەشێوەی ئادەمیزاد دەرکەوتووە و لەناویاندا ژیاوە.

لێکۆڵەوەران لەو باوەڕەدان کە خوا لای ئەهلی هەق حەوت جاران دابەزیوە و وەکو مرۆڤ خۆی نیشانداوە. بەم بۆنەیەشەوە مێژووی ئاینەکە بەسەر حەوت چەرخدا دەبەشنەوە، کەچی خوا حەوت جار دانەبەزیوە لە ئاینی هەقدا تەجسیدی خودایی زۆرن، دووەم ئەگەر مەبەست لە حەوت تەجسیدیی خودایی، تەجسیدە سەرەکی و هەرە بەناوبانگەکانی بێت، ئەوا ئەوانیش حەوت نین، ڕاستییەکەی شەش تەجسید دەبن.

مەبدەئی دوونادوون (تناسخ الأرواح) کە باوەڕێکە بەزیندووبوونەوەی گیانی مرۆڤ دوای مردنی، واتە یەکێك کە مرد گیانی دەچێتە لەشی مرۆڤێکی ترەوە. ئەمان بۆ ئەم دیاردەیە وشەی (دوون) بەکاردێنن، ئەویش گوایە وشەیەکی تورکییە بەمانای کراس گۆڕین.

بەپێی ئەم مەبدەئە، گیانی هەر مرۆڤێك دەبێت (١٠٠١) جار لەش بگۆڕێت، واتە ئەوەندە جار بمرێت و زیندووبێتەوە هەر ژیانێکیش لە (١٠٠١) جارە، پێیێ دەوترێت (دوون). مرۆڤی چاك لە دوونی تازەیدا دەبێتەوە مرۆڤ، ئەوەی خراپیشە دەبێتە ئاژەڵ. (واتە لە هەزار و یەکەمین ژیانی)دا گیانی ئەو کەسە پاك دەبێتەوە و دەچێتە لەشی دیدەدارێك (چاوکراوە) و حەقیقەتی بۆ ئاشکرا دەبێت، دەگاتە پلەی فریشتە. لە دوا قۆناغی ژیانی مرۆڤایەتی، ژیانی فریشتەیە. هەموو کەسێك دەبێت پێی بگات. هەرچی شاخوشینە، خوا خۆیەتی و دابەزینی مانی ڕۆژی حەشرە دونیا خراپ بووە.

لەلایەکی کە هاتووە لە نووسراوی پیرۆزدا، کە سوڵتان ئیسحاق یاسای گوێزشکاندنی دانا و ئەوەی گوێز دەشکێنێت بە ئاگری دۆزەخ ناسووتێت.

بە بڕوای ئەهلی هەق، ڕۆژی حەشر لە ناوچەی شارەزوور دەبێت، چونکە ئەمان ناوی ئەم شوێنە بە (شازهور لێکدەدەنەوە). واتە ئەو جێگایەی شا (خوا)ی لێ پەیدا دەبێت، گوایە شاخوشین لەوێ دادەبەزێت.

بنیامین لە ڕۆژگارێکدا لە دوونی هەڵردا بووە -خوا بنیامینی گرتووە و لەژێر چیای (چادرگەدا) لە شنروێ، زیندانی کردووە. لەوێ کە بوومەلەرزە دەبێت ئەمان وا دەزانن ئەوە بنیامینە و دەیەوێت لەژێر چیاکەدا دەرچێت.

خوا حەوت جاران لە لەشی ئادەمیزاد دا تەجسیدی کردووە، کە ئەمانەن: خاوەندگار، عەلی، شاخوشین، سولتان ئیسحاق، قورمز (شاقولی ویس)، محەمەد بەگ و خان ئاتەش. لە دەقی کتێبی یارساندا، کە بە دەستنووسی

سولّتان ئیسحاق دانراوە، هاتووە، کە ئەمسالّ (٥٧٨ك ١١٨٢ز) لەدایك بووە. بەپێی ئەدمونز (٧١٦ك- ١٣١٧ز).

هەردەوێل کاکەیی سالّی (١٢١٤ز) بەگوێرەی ژیاننامەی شێخ عیسای بەرزنجی دەڵێت: سولّتان ئیسحاق لە سەدەی چواردەدا ژیاوە.

بەهەرحالّ سالّی (١١٨٢)ز لە ڕاستی دەچێت. سەرئەنجام: دەقی سەرئەنجام پەخشانی بە زمانی فارسی نووسراوە و شیعری بە دایالێکتی گۆرانی تیایە و سالّی (١٨٤٢) نووسراوە. مینۆرسکی کۆی کردووەتەوە و وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی و سالّی (١٩١١)ز بەچاپی گەیاندووە. بە دایالێکتی گورانیش: ئەوانەی بلاّوکراوەتەوە، دەفتەری ڕموزی یارسان، سەید قاسم ئەفزەل شا ئیبراهیمی و سرودهای دینی یارسانی. ماشاڵڵای سووری، کە محەمەد ئەمین هەورامانی بلاّوی کردووەتەوە، ماناکانی بەسرانی لێکداونەتەوە، هەروەها کتێبی یارسان کە بەپێی سەرچاوەکان، گوایە سولّتان ئیسحاق خۆی بە دایالێکتی گۆرانی نووسیویەتی، کتێب و شاهنامەی حەقیقەت: ئەم کتێبە سالّی (١٩٠٠ز) لەلایەن حاجی نیعمەت الله جەیحون ئابادیی موکرییەوە بە شیعر و زمانی فارسی نووسراوە.

لەپالّ ئەمانەدا، هەندێك شیعری شاعیرانی بەناوبانگی کورد وەکو سلوات نامە، خانەی قوبادی، عقیدەنامەی مەولەوی. هی بابا تاهیری هەمەدان، بەبێ شك لە ئەدەبیاتی ئەهلی هەق دادەنرێن.

## گوێزشکاندن و سەرسپاردن:

منداڵێکی شەش ساڵانە لەگەڵ دایك و باوکیدا دەچنە لای سەید و خەلیفەیەك. منداڵەکە داوێنی سەید دەگرێت و گوێزێکی دەداتێ. گوێزە دەشکێنێت و دەیدا بەوانەی ئامادەبوون. گوێزشکاندن تەنها بۆ کورە.

ئەهلی هەقە نوێژیان نییە، ڕۆژووگرتن سێ ڕۆژە. بۆ ڕۆژووگرتن لە ساڵێکدا ڕۆژی (١٣، ١٤ و ١٥)ی کانوونی دووەم ڕۆژوو دەگرن.

## تەلقین و شتنی مردوو:

مردوو یەکێك لە بنەماڵەی خەلیفە دەیشوات، ئەگەر ژن بوو ئەوا ژنی ڕەهبەر ئەمە دەکات. ئەو ئاگرەی ئاوی بۆ شوشتنی مردوو پێی گەرم دەکەن، تا حەوت ڕۆژ نابێت بکوژێتەوە. مردوو سەری بەرەو قیبلە گۆڕی سوڵتان ئیساو-بێت. پرسەیان حەوت ڕۆژە، حەوتەم لە جەمدا قوربانی بۆ دەکەن، بەحساب گیانی مردوو لە حەوتەمین ڕۆژدا دەچێتە لەشێکی ترەوە.

زیارەتگای ئەهلی هەقە گۆڕی سوڵتان ئیسحاقە لە گوندی شێخان کە بووە بە قیبلەیان. سێ جۆر کەس بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێن، بوختانکەر، زۆربڵێ، زماندرێژ، ڕێگر. سێ جۆرە کردەوە باوەڕی مرۆڤ بەربادەدەن: درۆکردن، تووڕەبوون، خۆڕازاندنەوە.

سێ شتیش باوەڕن: یەکەم ئابڕوو، دووەم ئەدەب، سێیەم ترس لە ڕۆژی حەشر. گەورەترین بەدکاری لە ڕوانگەی ئەهلی هەقەوە ئەمانەن: درۆکردن، فێڵبازی، دزین و سوێندخواردن بەدرۆ.

## عەلەوی قزلباش:

لە کوردستانی سەروودا -ئاینێکیان پێکهێناوە لە هەندێ ڕووەوە لە کۆمەڵەی ئەهلی هەقەوە نزیکە. ئەم دوو کۆمەڵەیە لەیەك جیادەبنەوە. ئەمانە بەناوی عەلەوییەوە یان قزلباشەوە ناسراون.

عەلی قول، واتە خزمەتکارە، عەلی یان عیسا قولی خزمەتکاری عیسا. موسڵمانان بەوان دەڵێن (اپیسلمان). ئەمانە هەموویان بەناوی عەلییەوە دەناسرێن، یان عەلی دەپەرستن. لە ساڵی (١٩٠٥) ئەمانەیانم بە ملیۆنێك کەس داناوە.

عەلی هەمیشە هەر خوابووە و بەشێوەی جۆراوجۆر دەرکەوتووە، خوا عەلی لە (١٠٠١) شێوەدا تەجسید کردووە. عەلی (خوای باوك) و عیسا (خوای کوڕ) و محەمەد (خوای ڕۆح) عەلەوییەکان باوەڕیان بە پێنج مەلائیکەکان هەیە کە یاریدەی خوایان داوە لە دروستکردنی دونیا و بەڕێوەبردنیان، دوای ئەمانیش (١٢) یاریدەدەری تر و ئینجا (٤٠) کەسی دیکە.

ئەمانە بە پێنج تەن ئال عبایان اصحاب الکسا و ناودەبرێن و ئەمانەن: عەلی، محەمەد، حەسەن و حوسێن، ئەمەیە و هونین و جودن ئەهلی حەقیقەت ئیمانیان بەم پێنج مەلائیکەتە هەیە، هەروەها شەبەکیش.

عەلەوی وەکو ئەهلی هەق -حاجی بەکداش دامەزرێنەری تەریقەتی بەکداشی بە تەجسیدێکی خودای دادەنێن، بە مردنی حاجی بەکداش دونیا بەبێ خودا مایەوە.

ڕۆژانە سێ نوێژ دەکەن: بەیانی، نیوەڕۆ، ئێوارە. عەلەوییەکان خێڵی کوچگین، تاقە نوێژێك دەکەن ئەوەش بەیانیان بەرامبەر بە ڕۆژهەڵهاتن، بۆ نوێژکردن دەستنوێژ ناگرن، بەڕای ئەمانە پاکی دڵ و دەروون گرنگترە لە پاکی لەش. ساڵی جارێك بە کۆمەڵ نوێژ لەبن دارێکی پیرۆزیان دەکەن، چونکە دەڵێن ئیمامی عەلی بۆ نوێژ بە کۆمەڵ دەڕۆیشت، لەڕێگا شەهید کرا. وەکو شیعە موحەرەم دەگرن، پرسەش بۆ ئیمامی حوسێن دادەنێن و لەخۆیان دەدەن، لەجیاتی دە ڕۆژی شیعە ئەمان کردبوویان بە (١٢) ڕۆژ، گوایە ڕەمزی (١٢) ئیمامی شیعەیە.

خدر ئەلیاس دەگرن، کە حەوت ڕۆژە و لە مانگی نیساندایە. هەموو ڕۆژی پێنجشەممەیەك ڕۆژوو دەگرن گوایە عەلی لەو ڕۆژەدا شەهیدکراوە، ئەمە تەنها بۆ پیاوی ئاینیان دەبێت. کەعبەی عەلەوییەکان تەکیەی حاجی بەکداشە نزیك شارۆچکەی کیرشەهر لەناوچەی ئەنگوردا. هەموو ساڵێك لە دەیەمین ڕۆژی موحەرەمدا حەج بۆ ئەوە دەکەن.

عەلەوییەکان گوندی کەرەتری لای کرماشان بەجێگەیەکی پیرۆزی خۆیان دەزانن، ناوی سەید کامان دا لەهودینە بە پیاوچاکانی خۆیانیان دادەنێن. چل بنەدار یانی تاقە داری سەر بەرزایی دەبن بە زیارەتگایان و قوربانییان بۆ دەکەن. مەشرووبات زۆر دەخۆنەوە و حەرام نییە، گۆشتی حەیوانی مردارەوەبوو دەخۆن. ئەم شتانە هەمووی نووسراونەتەوە و لە کتێبی تورکی-دا نووسراوە بە ناوی (بیوروك) یان (بەیاریق).

ئاینی کورد پێش ئیسـلام و هـاتنی ئیسـلام بۆیـان و بـاوەڕ و ئاینیـان و مەزهەبیان هەتا کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچـی لـە ناوچـەی شـارەزوور و لوڕستاندا بوون.

د.حسـامەدین نەقشـبەندی، مامۆسـتای مێـژووی کـوردی ئیسـلامی، یارمەتیدەری بەشی مێژووی-کۆلێجی علوم و مرۆڤایەتی زانکۆی سلێمانی.

کوردەکـان بەرهەڵسـتییەکی زۆر گـەورەیان کـرد لـەکاتی داگیرکردنـی ئیسلامەکاندا و زۆریان کوشت، نەچوونە نـاو ئـاینی ئیسـلامەوە بـەئارەزووی خۆیان، بەڵکو بەزۆر و کوشتن و نـاڕەزایی، سـەرەڕای چـوونە نـاو ئیسـلامەوە باوەڕیان پێی نەبوو، بۆیە زۆرجار لەژێر فەرمانیاندا دەچوونە دەرەوە.

لە شەڕی جەلەولادا (سەعدی کوڕی وەقاس) قـەع قـاع کـوڕی عومـەر و تەمیمی، لەسەر ئەو سوپا دوانزە هەزار ئیسلامەوەبوون، شەڕێکی زۆر گـەورە ڕوویدا، کە دوو مـانگ بوو دەورە درابوون، بۆیە بڕیاریان دا هێرش ببەن، واتـە ئیسلامەکان کە چواردەوری ئەو جێگایە (چاڵ-خەندەق) بوو هێرشیان کـرد و دەڵێن لەو شەڕەدا (هەزاران کەس) کوژراوە، گۆڕەپانەکە پـڕ بـوو لـە لاشـە و خوێن، لەوکاتەوە ناونرا بە (جەلەولا وەقیعە)، کە بـە عـەرەبییەکـەی دەڵێـت (جُلِّلت بالقتلی) = (اي صارت جلية بالدماء) بەواتای پڕ بوو لە کوژراو، یـان پڕ بە خوێن.

لەم شەڕەدا ئیسلامەکان دەستکەوتێکی زۆر و بێ شوماریان دەسـتکەوت، کە دەڵێن هەر سوارێك (نۆ هەزار درهەم) و (نۆ سەر حەیوان)ی بەرکـەوتووە، دەڵێن دەستکەوتەکان هەمووی بایی سێ هەزار= سـێ ملیـۆن درهـەم بـووە،

پێنج یەکی ئەو دەستکەوتانە کە هاشم ناردوویەتی بۆ سەعد، بایی (شەش هەزار درهەم بووە= ٦ ملیۆن) دەستکەوتی تری دابەشکرا بەسەر عەرەبەکاندا.

لەنێوان ئیسلامەکاندا ئەم (سەبایە) ناوبرا بە سەبیە= دیلی= جەلەولا (واتە ژن و کچ هەموویان بوون بەموڵکی ئەو عارەبانە.

یەزدی گوردی سێیەم کە زانی جەلەولا گیراوە، لە زەهاوەوە ڕۆیشت بۆ شاخەکان، قەع قەع بەدوایانەوە بوو هەتا خانەقین و هەتا گەیشتە (قەسری شیرین)، ئەوەش لە ساڵی (١٧)ی کۆچی (٦٣٨) زاینی، هەر هەمان ناوبراو (بەندنیجین) واتا (مەندەلی) گرت بەبێ شەڕ و پاشان داقوق و خانیجار= (توزخورماتوو) و کورە باجەرمی بەواتای زەوی= ناوچەی پارێزگای کەرکوکی ئێستا هەتا گەیشتە سنووری شارەزوور. جەریدی کوڕی عەبدوڵڵا هاتە خانەقین (ئەوانەی مابوون هەموویانی کوشت).

هورمزان، حاکمی ئەهواز بوو، دوای ئەوەی شکا لە شەڕی (قادسیە)دا، شەڕێکی دیکەی کرد لەگەڵ عارەبەکاندا بە سەرۆکایەتی عەتەبە کوری غەزوان، ئاشتییان بەست بەوەی کە ئەهواز و موهرجانقزق بدرێن بە هورمزان، بەڵام ناکۆکی لەنێوان ئیسلامەکاندا ڕوویدا لەسەر زەوی و زار، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە کوردەکان زۆر لێهاتوو بوون لە سەربازی و شەڕدا دوای گرتنی (حەلوان) زەهاو، لەلایەن سەرۆکێکی ئیسلامەوە بەناوی (جەریر ئەل بەجلی) = (جرير البجلي)، ئەمەش خزم و قەومەکانی خۆی لەوێ دانا، ئەمانە هەتا سەدەی (٣)ی کۆچی- (٩)ی زاینی لەوێدا مابوونەوە.

دانیشتووانی داقـوق سـەر بـە خەوارجـەکان بـوون. هـەروەها کوردەکـان هاوباوەڕی شۆڕشی بابەکی خورەمی بوون، مامۆسـتا تۆفیـق وەهبـی بـاوەڕی وایە، مەزدەکی لە خـوارووی شـارەزوور و دەوروبـەری سـلێمانی و کـەرکوك و هەولێر بووە لە سەدەی شەشەمی زاینییەوە و مارسابا خۆی مەزدەکی بـووە و لە دانیشتووانی خەڵکی (بیت گلابی)= بیت گولاّبی- هەڵەبجەی ئێستا، پێش ئەوەی ببێتە نەسرانی و نـاوی ئـەو کاتـەی (گوشـنەرداد- گوشـەنەرداد لـە گۆڤاری گەلاوێژ (١١و ١٢/ ١٩٤٠-٦٨). مار وشەیەکی ئارامییـە بـەواتای گەورە، کە بە سەرۆکەکانی ئایین دەوترێت.

## شرقاتی ئێستا بەواتەی شاری کورد:

الأسقف: وشەیەکی یۆنانییە، بەواتای موراقب- سەرپەرشتیار.

مەتران: وشەیەکی یۆنانییە، بەواتای (سەرۆك) رەئیس.

یەك فرسەخ: بە شەش کیلۆمەتر.

بلازەری دەڵێت: (هورمزان کوردە، چونکە موهرجان قزق لـە (لوڕسـتانی بچووکەوە) جێگای دانیشتووانی کوردە.

الأنفال: کۆی النفلە: واتە ئەنفال، دەستکەوت لەلایەن کافرەکانەوە.

الصالحیة: ساڵحییە ئەوانە سەر بە حەسەنی کوڕی سـاڵح کـوڕی وەزیدیـە کۆمەکین لە شیعەی سەر بە زەید کورشی عەلی، کوڕی زەینەل عابدین کـوڕی حوسێن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالّبە.

لە شانزەی مانگی زوو قعـدەی سـاڵی (١٢٠٨)ی کۆچـی لەشـکری ئاقـا محەمەد خانی قاجار، کە شەش هەزار کەس بوون لـە تـورکی ئەسـتر ئابـاد و سـوادکیو و پیـادەی مازنـدەران و دەشـت لـە کوترخانـەوە ڕۆیشـتن و پاشـان گەمارۆی شاری (بم)ی دا، لوتف عەلی خان بە لەشکرێکەوە لەو شارەدا بـوو، خەڵکی شار لەگەڵ لوتف عەلی خاندا بوون، شەوان لە دەنگی کەرەناو تـەپڵی شەڕ خەڵکەکە خەویان لـێ نەدەکەوت، ژن و منداڵان بە دەنگی بەرز، قسـەی ناشیرینیان بـە ئاغـا محەمـەد خـان دەوت، کـە یەختـە بـووە-خەسـاو، ئـەم گەمارۆدانە چـەند مـانگێکی خایانـد و برسـێتی ڕووی کـردە دانیشـتووان و تەنگیان پێ هەڵچنرا، بە فەرمانی لوتف عەلی خان، دە هەزار کەس لە پـیر و پیرێژن و منداڵیان لە شار کردە دەرەوە، بۆ ئەوەی ئەوەی هەیە بەشـی ئەوانـەی ناوەوە بکات. گەرمارۆ چوار مانگی کێشا، خواردن نـەما، سـەگ و پشـیلە و هەرچی هەبوو خورا، لەملاشەوە ئاقا محەمەد خـان وەك مسـتیلە چـواردەوری شاری گرتبوو، نەیان دەهێشت هـیچ خواردەمـەنی و سـەوزە بچـێتە شـارەوە، هەندێك لە خەڵکی لەبرسان مردن، لە هـەمووان زیـاتر منـداڵی شـیرەخۆرە، چونکە دایکیان بەهۆی نەبوونی خواردنەوە شیریان نەبوو بیان دەنێ، خـەڵکی کرمان زۆر مەردانە پاڵپشتی لوتف عەلی خانیان دەکـرد، سـەرەڕای مـردن و ناڵە و هاواری برسێتی.

یەکێك لە سەربازەکان دەرگای شاری کردەوە بۆ لەشکری ئاقا محەمەد خان. لوتف عەلی خان لە شاری بم دەرباز بوو، کرمانییەکان پاش چوار مانگ و نیو

گەمارۆدان، کەوتنە ژێر چنگی شەست هەزار کەسی خوێنخـواری بێبـەزەیی، کەوتنە کوشتن و بڕین و تالآن.

بە قسەی خاوەن گیتی گوشـا: ئاقـا محەمـەد خـان هـەموو لەشـکرەکەی مەرەخـەس کـرد بـۆ تـالآن و بـەدیلگرتنی کرمـان، پیاوەکـان دەکـوژران و منداڵەکان و ژنانیان بە دیل دەگرت، بەزەییان بەکەسدا نەدەهاتەوە، کوشتن و کوێرکردنی خەڵك و کاولکردنی خانوو بەرەو قەڵاکان. پاشان بڕیـاری دا و لـە ملی شەششسەد کەسیان دا، کە بەدیلی گیرابوون و سێسەد دیلی دیکە، سەری سەربڕاوەکان هەردوو سەری براویان کردە ملی یەکێك لەو دیلانە و لە شـارەوە ماوەی چل فرسەنگ لەپێش سوارەکانەوە ئەم سێسەد کەسەیان ڕەتاندووە، پاش ئەوەی گەیشتنە شار، ئەو سێسەد کەسەشیان سەربڕی و لـەو نۆسـەد کەسـە، منارەیەکی لـێ دروستکردن لە شاری بم.

پاش ئـەوە بـە شـانزە سـاڵ، واتـە سـاڵی (١٨١٠ز-١٢٢٥ك) قەمـەری، گەڕۆکی ئینگلیزی (پاتین جەر)، کە لە شاری بمەوە پەڕیوەتەوە، ئەو منارەیەی بە چاوی خۆی دیبوو کە هەر مابوو.

ئاقا محەمەد خان چووە سەر شـاخی کـورختران (قلعـە دخـتر)، بڕیـاری دا هەرچی سەرکردە و پیاوە ناسـراو و ناودارەکـانی ئـەو شـارە ئامادەکـەن لـەو جێگایەدا، هەریەکەی بەجۆرێك سزادان، گوێ بڕین، چـاو دەرهێنـان، لەسـەر کێوەکەوە فڕێدانە خوارەوە.

ناوبراو لەکاتێکدا نوێژی دەکرد، هەندێ دیلیان بۆ هێنـا، ئەوەنـدە کینـە لەدڵ بوو نەوەستا تا نوێژەکە تەواو بکات، هـەر لـە نوێژەکەیـدا دەسـتی بـۆ

قورگی، یان بۆ چاوی، یان بۆ گوێی دەبرد، بەو نیشانەیە بە واتای بیکوژن، یان گوێی ببڕن، یان چاوی دەرهێنن، هەر لەو نوێژەدا (١٧) دیل بەو شێوەیەیان لێ کرا.

هەرچی بوو بەتاڵان بردیان، تەنها خۆڵ و بەرد نەبێت. لە فارسنامەی ناسری-دا هاتووە: ژن و منداڵی دیل هەشت هەزار کەس بوون و هەمووی بەخشی بە سەربازەکانی لەشکرەکەی.

سایکس دەڵێت: لەشکرەکە بیست هەزار ژن و منداڵان بە دیلی گیران و بە ناوی کەنیزەکەوە بردوویانن و لە کتێبەکەیدا وای نووسیوە، دەڵێت: لەوەش زیاترە، لەلایەکی ئەو ژنانەیدا بە لەشکرەکەی کە لەگەڵیاندا ڕابوێرن و پاشان دەتوانن بیانکوژن. بە قسەی شێخ یەحیا (هەموو لەشکرەکەی کردە سێ بەش، بەسەر شاردا هەر سێ ڕۆژ بە بەشێکیدا منداڵ و کچ کە لە جادەکان و کۆڵانەکاندا دەپەڕینەوە، بێ بەزەییانە دەیانکوشتن).

پاش ئەوەی لەشکری ئاغا محەمەد خان لە شار دەرچوون، بە هەزارەها کچ سکیان پڕکردبوون، پاشان بە ناچاریی لەباری خۆیان دەبردن.

سایکس: دەڵێت بیست هەزار جوت چاوی خەڵکی بم-یان دەرهێنا.

ملگم: نووسیویەتی ئەوانەی کوێرکران و بێ چاو مانەوە، حەوت هەزار کەس بوون.

قسەی خەڵکی دەڵێت، حەوت مەن و نیو چاوی خەڵکی بم-یان دەرهێنا، ئاغا محەمەد خۆی بە دەستی خۆی جوت جوت چاوی دەرهێنراوەکانی دەژمارد.

لە چاڵێکدا پێنج هەزار ئێسقانی لاشەیان دۆزیوەتەوە کە لەو جێگایەدا، ئاقا محەمەد خان خەڵکی کوشتووە، ئەم ڕق و کینەیەی محەمەد خان دژی خەڵکی شاری بم و کرمان، ئەوەبوو کە ژنان و منداڵان دژی ئاقا محەمەد خان هاواریان دەکرد- خەساو و کردبوویان بە شیعر، بۆیە زۆر ڕقی لێیان بووە.

ئێرانییەکان کۆمەڵێکن لە بەشێکی خۆرهەڵاتی نەژادیان (هیندۆئەورووپایی)یان پێی دەڵێن، ئەم نەژادەش کە بە هیندۆئەورووپی ناو دەبرێن، ئەمڕۆ لە ئیسپانیا و پورتوغال، لە ئەورووپا تا ئێران و ئەفغانستان و پاکستان و هەندێ لە ئاسیادا بڵاوبوونەتەوە، کۆمەڵانی خۆرئاوا لە میللەتانی ئەورووپایی دروست بوون، هەموو خەڵکانی ئەورووپا هیندۆئەورووپی نین، لەوانە فەللەندی و مەجەری لە دەستەی هیندۆئەورووپی نین.

دەستەڵاتی خۆرهەڵات کۆمەڵانی هیندۆئەورووپای بریتییە لە هیندییەکان و ئێرانییەکان، کە ناویان هیندۆئێرانییە. هەندێك لە زانایان باوەڕیان وا نییە کە هیندۆئەورووپایی لە بەشێکی دوورگەی ئەسکەندنیاوە هاتوون.

لە ئەنجامی پەیدابوونی سەرمایەیەکی زۆردا، بەرەو ناوچە گەرمەسێرەکان کۆچیان کردووە، لە ئەورووپای ناوەندی بڵاوبوونەتەوە و پاشان بۆ جێگای دیکە ڕۆیشتوون، هەندێکی دیکە لە زانایان، ناوەندی سەرەکی هیندۆئەورووپاییەکان بە باکووری ئەڵمانیا و باشووری دانیمارك لە دەشتە فراوانەکانی بەشی ئەورووپا دەزانن. هەندێکی دیکە لە زانایان بەپێچەوانەی ئەوە، باوەڕیان وایە کە هیندۆئەورووپایی لە ئاسیادا بوون، لە ناوچەی دەوروبەری تاجیکستانی

ئێستا و خوارووی پامیر بە جێگای هیندۆئەورووپایی دەزانن و باوەڕیان وایە کە لەوێوە کۆچیان کردووە، بەشێکیان بەرەو ئەورووپا و بەشێکی دیکەیان بەرەو هیندۆئێرانی و ئەفغانستان و ئاسیای بچووك ڕۆیشتوون، لە خۆرهەلاتی دانوب تا پامیر تەنها جێگای قەومی هیندۆئەورووپایی نەبوون، بەڵکو جێگای ژیانی هەندێ لە قەومەکانی ئێرانیش بووە.

هەموو ئەو ناوچەیە لە ڕۆژانی مێژوودا، بە واتای لەکاتی نووسینەکانی سەر بەرددا، نووسینی داریوش جێگای خەڵکانی جۆربەجۆری سکاییەکان بووە، کە نەژادیان ئارییە.

لە ئەنجامی سەرماوسۆڵە و تەنگەبەری جێگا و گەڕان بەدوای لەوەڕگادا، تیرەی هیندۆئێرانی بەرەو جێگای گەرمتر کۆچیان کردووە، بەشێکیان لە خاکی ئێراندا ماونەتەوە، بەشێکی دیکەیان بەرەو دەشتاییەکانی ئاسیای بچووك و بەشێکیان بەرەو ناوچەی گەرمتر بۆ هیند و پاکسان ڕۆیشتوون.

ئاریا لە ئاوێستادا بەواتای نەجیب، پاك، شەریف و ئازاد هاتووە، هەندێ لە زانایان باوەڕیان وایە کە ئارییەکان لە ڕۆژگاری کۆندا لە دەشتەکانی پامیر و جێگای دیکە ژیاون و لە شەش هەزارەی تا پێنج هەزارەی پ.ز لە جێگای خۆیان ڕۆیشتوون و بەرەو ئێران و هیندستان هاتوون. لەگەڵ دانیشتووانی ئەو جێگایانەدا ماونەتەوە. بێگومان لە ڕۆژانی ڕابردوودا ئاری هەموویان لە یەك خاکدا ژیاون، پاشان لەپێناوی دۆزینەوەی خاکێکی پانتر و باشترا کۆچیان کردووە.

بنەڕەتی ئەم واژەیە لە ئاوێستادا بە ئیریە هاتووە، بەواتای پاك و پاکزاد و یەك نەژاد و لێهاتوو.

ئەگزان توس (Agzan Tos)، کۆنترین نووسەری یۆنانی کە ناوی زەردەشتی بردووە. ئەگزان توس-ی لێکۆڵەوەر بووە، ئەم زانایە لە سەدەی پێنجەمی پ.ز (٤٥٠-٥٠٠)پ.ز ژیاوە، نووسەرەکانی کە لە قسەی ئەوە باسیان کردووە، ئەم مێژوونووسە کاتی زەردەشت بە (٦٠٠٠) ساڵ پێش هێرشی سوپای خشایەر شا بۆ یۆنان نووسیوە.

دیوژنس لوتیوس (Dowzns Luteos) ئەم زانایە لە دەوروبەری (٢١٠)پ.ز ژیاوە هەندێك شتی ئەگزان توسی یادکردووە و کاتی بوونی زەردەشتی بە شەش هەزار ساڵ هێرشی سوپای خشایەر شا بۆ سەر یۆنان نووسیووە.

هەرمودوروس (Hormodoros) قوتابی ئەفلاتون بووە. ئەو دەڵێت: کاتی زەردەشت پێنج هەزار ساڵ پێش شەڕی ترویا بووە. ئەفلاتون، ئەم زانایە لە ساڵی (٤٢٩) پ.ز لەدایك بووە، لە ساڵی (٣٤٧)پ.ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو لە پەرتوکەکەیدا ناوی (الکی بیادس) لەو پەرتوکەدا لەژێر نووسینەکانی ئەودا، یاداشتی تیایە لەلایەن قوتابییەکانییەوە وەك (ارستو یان ارستات لیس). ئوردوك سوس و هەموو دورروسی، لەو پەرتوکەدا نووسیویانە، کاتی زەردەشتیان بە شەش هەزار ساڵ پێش ئەفلاتون داناوە.

## پلینیوس (Plinyas):

پلینیوسی رۆمی کە بە پلینووسی گەورە ناسراوە، لە ساڵی (٢٣)ز لەدایك بووە لە ساڵی (٧٩)ز کۆچی دوایی کردووە. پەرتوکێکی گەورەی لەدوای بەجێماوە بە ناوی مێژووی کردگاری- تأریخی تەبیعی، لەو پەرتوکەدا نووسیویەتی:

(١) پلینــووس- نووســینی پــەرتوکی تــأریخی و سرووشــتی تەبیعییــە (Hataralls Historia)، لە (٣٧) بەرگدایە- سەرەڕای ئــەوەش زانینــی جوگرافی، جوتیاری و پزیشکی و پیشەسازی بــووە. ئــەم زانایــە ســووتاوە لــە ئەنجامی بورکانی کێوی وزو (Wezur) بووە بەژێر شالاوی بورکانەکەوە.

پلوتارخوس (Plotarkhos):

پلوتارخوس، یان پلوتارخی یۆنانی کە لە ساڵی (٤٦)ز لەدایك بــووە، لــە ساڵی (١٢٠)ز-دا کۆچی دوایی کردووە، کاتی زەردەشتی بە پێنج هەزار ســاڵ پێش شەڕی توریا بووە.

## تیوپومپوس (Tiopompos):-

ئەم زانایە لە سەدەی چوارەمی پ.ز-دا ژیاوە هاوکاتی فلیپ و ئەسکەندەر بووە، لە پەرتوکی مێژووی یۆناندا دەربارەی زەردەشت نووسیویەتی پێش شەڕی توریا بە پێنج هەزار ساڵ بووە.

## سوئیزاس:

ئەم زانایە لە ساڵی (٩٧٠)ز ژیاوە لە فەرهەنگێکی خۆیدا کە ماوە، ناوی زەردەشتی بردووە، پێش شەڕی توریا بە پێنج هەزار ساڵ بووە.

## ئەردەشێر خەبەردار:

ئەم زانایە پارسی زمانە، لە پەرتوکەکەیــدا ئێــران و ئێرانییــەکان، نــاوی هیندستان و ئێرانی بردووە کاتی زەردەشتی بە (٦٥٠٠) پ.ز نووسیوە.

## بارون بوون سن:

خەڵکی ئەڵمانیایە، یەکێك لە پەرتوکەکانی بە ناوی جێگای میسر و لەوەدا باسی زەردەشتی کردووە بە شەش هەزار و پێنجسەد ساڵ پ.ز نووسیوە.

## ڤۆڵتەر:

فەرەنسای ماری ئاروئە ناسراوە بە ولتەر: ڤۆڵتەر (١٦٩٤-١٧٧٨)ز فەیلەسوف و نووسەری فەرەنساوی، لە کتێبێکیدا خوێندنەوەی (ئاداب و رۆحیاتی مللی). سێ شتی زۆر گرنگی تیادا نووسیوە، کە بنەرەتی مرۆڤن: بیوورای باش، گفتەی باش، کردەوەی باش. ئەمەی ناو بردووە بە بنەرەتی خو و رەوشتی مرۆڤ، وتوویەتی زەردەشت شەش هەزار ساڵ پێش کورشی گەورە بووە.

## ئەسپنسر:

ئەم زانایە کە لە لێکۆڵینەوەکان، لە گەورەکانی تازەی فارس و هیندستانە لە (٢٢٣)ز پەرتوکی خۆی بە ناوی (خولی ژیانی ئارییە)کانەوە لە ساڵی (١٩٦٥)ز لە بۆمبای لە چاپدراوە، ژیانی زەردەشتی بە (٧١٢٩) ساڵ پ.ز نووسیوە.

## میترایانی تیشك پەرستن:

پێش زەردەشت ئارییەکان تیشکیان پەرستووە، لە ئاوێستادا تیشك گەورەترین یەزدانە، لە نووسینەکانی هنمامنش-دا ئەم ناوە بە نووسین و بەدەنگ لە ئاوێستادا بە مێژوو هاتووە.

له سانسکریتدا به میترا و له پەهلەویدا بە میتر و لە پارسی ئەمڕۆدا بـە مهر دەخوێنرێتەوە. کۆنترین بەڵگەیەکە نووسین کە ناوی ئەم خوا کۆنەی ئاری نووسـراوە، بەدەسـت ئێمـە گەیشـتووە، تابلۆیـەکی قوڕینـە دەگەڕێتـەوە بـۆ (١٤٠٠) ساڵ پ.ز.

لە ساڵی (١٩٠٧)ز، لە کابوتوکیا لـە شـارەکانی ئاسـیای بچـووك، لـە جێگایەك بە نـاوی بوغـاز کـۆی دۆزراوەتـەوە. لـە یـەکێك لـەو تابلۆیانـەدا پەیمانێکە لەنێوان هیت و میتانیدا یارمەتییان داوا کـردووە لـە دوو خـودای گەورە بە ناوی تیشك و ئارونا، کە خوای هیندۆئێرانی بوون، هەر لە تەنیشـت ناوی ئەو دوو خودایەوە، ئاوی دوو خودای کۆنی هیند و ئێرانی ئیندراونسـاتی هاتووە.

میترا: بەواتای هاوڕێ و هاودەم و یەك دڵ و دۆست. خوای ئاگاداری خـۆر و ناوی یەکە لە دە ئاگرەکانی، هەروەها ناوی یەکێك لە ئاپ سەرە کە کۆمـەڵێك لە فریشتەکان -کەمینگێنەن- خـانن- ژنـن لـە ئاسمانـدان و ژنـی گەنـد و هەرتەمانەش کۆمـەڵێکن ئەندامن.

کریت: هەکانی کوڕی ئادییت لەو حەوت خوایانەن کە لە ئاسماندا دەژین و لەسەروو ئەوانەوە وارونایە بەری و بەری شەش خودایە و ئـادیتی نـاوە. مـیترا لەوەوە ئارامی گرتووە، لە پەرتوکەکانی هیندیـدا، مـیترا لـە شـێوەی خـوای خۆردا کەمتر خۆی دەنوێنێت، بـەڵکو خـوای تیشـك و دۆسـتی و ڕوونـاکی و ڕۆشـنایی و سەرچـاوەی خـۆرە. لـەناو هیندییەکانـدا سـوری، یـان سـویتری حەوتەمین ادیت.

ئارون: خوای ئاسمان و خوای هەموو شتە و خوای شەویشە. میترا خوای ڕۆشنایی و ڕووناکییە وەکیلی ڕۆژە میترا و ئارونا لە خودا کۆنەکانی هیندییەکانە، میترا خوای ئاو و دەریاکانە و یەکێك لە ڕەوشتەکانی ئاود-دام بەواتای تەنگ پێ هەڵچنینە و ژنی ئەو ئارونییە کە خوای شەرابە.

میترا یان مهر- تیشك، لە ئاوێستادا ڕێنیشاندەری کۆمەڵانی خەڵکی ئێرانی مەزدایە، ئەو دوژمنی درۆ و درۆزنانە، نابێت هیچ کەسێك لە سەرکردەی خێزان و کوێخا و شا و هەژاران درۆ بکات، چونکە ڕووناکی ئازاری درۆ و درۆزنان دەدات.

## مەزدا پەرستی:

زەردەشت دامەزرێنەری ئاینی مەزدایە لە ئێران. ناوی ئەم پێغەمبەرە (مەزرحوشتر) لە ئاوێستادا هاتووە، بە واتای خاوەنی حوشتری زەرد، زاناکان بە واتای کە ناوی زەردەشت لێك دەدەنەوە، ویندشمن و مولەری ئەڵمانی وایان لێکداوەتەوە کە خاوەنی حوشترە.

کاسلێ: ئەڵمانی وای لێکداوەتەوە بە واتای پڕ ئەستێرە، دەهار لە: بەلێکی وای لێکداوەتەوە درەخشانی وەك زێڕ. بارتولومە: دەڵێت زەردەشت بە واتای حوشتری پیر و خاوەنی حوشتری پیرە.

## جێگای لەدایکبوونی زەردەشت:

هەندێك باوەڕیان وایە زەردەشت لە ناوچەی خۆرئاوای ئێران لـەدایك بـووە. هەندێك باوەڕیان وایە زەردەشت لە خۆرهەڵاتی ئێران لـەدایك بـووە. هەنـدێك باوەڕیان وایە زەردەشت لە بەلنج لەدایك بووە.

بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی بەرەو خۆرهـەڵاتی ئێـران ڕۆیشـتووە بـە پـانی پشتی ویشتاسب، ئاینەکەی خـۆی بڵاوکردووەتـەوە. لـەدایکبوونی زەردەشـت، هەروەك چـۆن پێغەمبـەرەکانی ئەفسـانەیان لەگەڵـدا باسـکردوون، ئـەمیش هەروەك ئەوان شتی زۆری لەسەر نووسراوە.

زەردەشت لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە تـا پـانزە سـاڵی لای پیرەمێردێکـی خوێنەوار بە ناوی برزین (Brzen) قوتابی بووە، زۆر زیرەك و لێهاتوو بـووە، دەربارەی کردگار و جیهان وردی خوێندوویەتی تا لەناو قوتابییەکاندا نهێنـی یەکەم بووە، هەر بۆ ئەم مەبەستە پیشتوێنێك کە نیشانەی زیرەکی ئـەو بـووە داویانەتێ و بەستوویەتی.

زەردەشت کەوتە بیرکردنـەوە بـۆ ئـەوەی لـەو خەڵکـە دوورکەوێتـەوە، لـە تەمـەنی بیسـت سـاڵیدا خـاڵ وەرگـیرا لـە کێـوی سـەبڵان، لـە نووسـینی زەردەشـتییەکاندا بـە نـاوی ئاوشـیدارین (Ushidaren) هـاتووە، ئـەم خەڵوەکێشـانە (١٠) سـاڵی خایانـدووە، لـەدوای ئـەو (١٠) سـاڵە کـە ئاهورامەزدا وەحی بۆ زەردەشت نارده خوارەوە، ئەوەش لەو ڕۆژەدا بوو کە یەکەم ڕۆژی دروستبوونی ئادەمیزاد بوو لەسەر زەوی.

مەلائیکە و فریشتە فروهەر ئاسمانیان بــە شــان هــەڵگرتبوو، لەخۆشــیدا بوون، ئاهورامەزدا لە وەحییەکەیدا بۆ زەردەشت، وتی من تۆم پــێش هــەموو شت دروستکردووە، پێش هەموو فریشتە و ئایزدان تۆ لە هەموویان باشتریت، زەردەشت کە ئەمەی بیست، زۆر دڵشــاد بــوو و هــەموو شــتی لــێ ڕوون و ئاشکرا بوو، زانی کە لە جیهاندا دوو هێزی دژ بەیەك هەن، یەکێکیان باش و سوودمەندە بــە نــاوی (ســینتامینو)، دووەم خراپــە و نابــەکارە بــە نــاوی (ئەنگرەمینو)، کە ئەهریمەن بیری کردەوە چۆن دەبێت مرۆڤ تێ بگەیەنێت لــە باشە و خراپە، بۆیە لە کێو هاتە خــوار و چــووە نــاو دێکــەی خــۆی، کەوتــە باسکردن لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، خەڵکی ئەوکاتە دوو بەش بوون، بەشێکیان لە شاردا دەژیان، زەردەشت لەو بەشە بوو، ئەمانەش کردگار پەرســت بــوون، وەك ڕۆژپەرست بە ناوی مهر- تیشك، هــەروەها مــانگ و ئەســتێرەکان و بــاران و ئاگریان لا زۆر بەڕێز بووە و بە سەرچاوەی ژیانیان داناوە.

کۆمەڵی دووەم: کۆچەر و دەوارنشین بوون (دیۆ) خراپەکارانیان دەپەرســت، درۆ و دزی و کوشتن و تاڵانیان دەکرد، زەردەشت داوای لــە هــەموان کــرد واز بهێنن لە کردەوەی خراپ و بێنە سەر ڕێگــای ڕاســت و ناســینی تــەنها یــەك خودا... ئەم بانگەوازەی بۆ هەموان بوو.

یەکەم کەسێك باوەڕی بە زەردەشت کرد، کوڕی مامی بوو بە ناوی مــدیو ماه (Madyu Mah). هەتا کۆتایی ژیانی لەسەر ئەو ئاینە بــوو بــە دڵ و بە گیان و بە ماڵ هەوڵی بۆ دەدا. پیاوە دینییە کۆنەکان ئەمیان دانا بە کافر و خراپ و دژی وەستان، بەڵام زەردەشت نەوەستا، بۆیە ناچار کۆچی کرد بــەرەو

باکووری خۆرهەڵاتی ئێران لەکاتی وەرزی زستاندا سەرماوسۆڵە و بەفر و باران بوو، هەرچۆن بوو گەیشتە لای گوشتاسپ کە پادشابوو، توانی شا ببینێت، باسی تەنها یەك خوای بۆ کرد، ئەو هاتە سەر ئاینی زەردەشت لەگەڵ وەزیرەکەیدا بە ناوی جاماسب و یەکێکی دیکە لە نزیکەکانی شا، بە ناوی فراشوشترا (Frashoshtra) پاشان بە ئاشکرا بانگەوازی ئاینی زەردەشت کرا و هەمووان هاتنە سەر ئەو ئاینە و ناوبانگی دەرکرد، وردە وردە گەیشتە هەموو نارچەکانی ئێران. بەوەی کە خودا یەکە و لەو زیاتر خودایەکی دیکە نییە، ئەی خەڵکینە باوەڕتان هەبێت بە سێ بنەڕەتی پیرۆز، ئەوەش: بیری باش، گفتەی باش، کردەوەی باش، بۆ ئەوەی ڕزگاربن.

لە پەرتوکی گاداتا کە بەشێکی زۆری گفتەی زەردەشت خۆیەتی و زمانی گاتا و ڕوونکردنەوەی ئاوێستا پاڵپشتی ئەوە دەکات کە زەردەشت شانزە جار ناوی خۆی بردووە.

منداڵانی زەردەشت: زمانی زەردەشت (هووی دخت) خەڵکی بەڵیج بووە.

زەردەشت سێ کوڕ و سێ کچی هەبووە، ناوی کوڕەکان:

١- ایست وایستر.

٢- اوروتانەر.

٣- هورچترە.

ناوی کچەکان:

١- فرنی

٢- تریتی

٣- پوروچیستا.

پێشتر باس لە دایکبوون و جێگای ژیانی سەرەتای زەردەشتیان کرد، لەلایەن قسەی هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکانەوە.

دیسان هەندێك لە زانایان دەربارەی زەردەشت:

هرتسلفد: خۆرهەلات و ئێران ناسی ئەڵمانی (١٨٧٩-١٩٤٧)ز، کە شارەزایی و ناسینی پەهلەوی هەبووە، لە مێژووی ئێرانی کۆن و عێراق و ئیسلامدا، ڕووناکبیرترین کەسێك بووە لەو کاتانەدا لە سنووری (١٩٠) پەرتوك و نامەی دەربارەی مێژوونووسین و زمان و ئاینی کلدانی و ئیلامی کۆن و ئیسلامی نووسیووە، ناوی ئەو لە تەختی جەمشید دا هەیە، پەرتوکێکی گرنگی هەیە لەژێر ناوی (ئێران و خۆرهەلاتی کۆن)، پەرتوکێکی دیکە دەربارەی (زەردەشت و جیهان و کاتی ئەو). دۆزینەوە و خوێندنەوەی نووسینی پەهلەوی لە فەیروزئاوا نووسینەکانی مەشهەد نزیك کازرون، لە ئیشە گرنگەکانی ئەوە. ئەو لە نووسینەکەیدا وا دەڵێت:

لە گاتادا زەردەشتی بە هۆش و لێهاتووی کە بەباشی و خۆشی بە دەنگێکی پڕ ئاوار و میهرەبان لەگەڵماندا دەدوێت، ئەو مرۆڤێکە، کە بۆ دروستکردنی ڕەوشتی باش و مرۆڤانە، بە خۆشبەختی و ڕووناکی و ڕێنیشاندەریان و کشتوکاڵکردن و ژیان، قەومەکەی ڕاپەڕاندووە دژی خورافات و خەیاڵپەرستی.

## پرۆفیسۆر گیکر:

گیکر خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانی (١٩٩٣) لە پەرتوکی فەرهەنگی ئێرانی خۆرهەڵاتدا وای نووسیوە، ئاینی زەردەشت کە لە گاتادا پارێزراوە، پلەی خورەوشتی زەردەشتی پایەیەکی بەرزی مرۆڤایەتی و فەلسەفەی ئەو، بە باشی لە گاتادا تێ دەگەیت، زۆر بە ئازایانە و سەربەزییەوە گرنگترین شتی دەرخستووە لەکاتێکی کۆندا بۆ گەلەکەی خۆی، رێگا و شێوەی ئاینی یەکتاپەرستی بڕیاری داوە، ئەو لەلایەن خوداوە بە نامە پێوازی لێکراوە، بۆ لەناوبردنی هێزی شەڕ و خراپە، بەدڵی خۆش و قسەی باش ئەو خەڵکەی لە دواکەوتن ڕزگار کرد. ئامۆژگاریی زەردەشت لە پەرتوکی پیرۆزی ئاوێستادا نووسراوە، کە خاوەنی پێنج بەشە، یان پێنج پەرتوك بەم شێوەیە:

١- یەسنا.

٢- یەشت.

٣- ویسپرد.

٤- وندیداد.

٥- وردە ئاوێستا.

## ١- یەسنا:

(٧٢) بەشە، هەریەکە (١٧) بەشی ئەو گاتای کـە دروسـت بـووە و بـە گفتەی ئسپنسر پەرتوکی یەسنا و گات کە یەك کۆمەڵە پەرتوکـە دەربـارەی هێزی ڕۆحانییەکانە، یەسنا گەورەترین دەرخستنی ئاینییە، هەروەها ئـەدەب و فەلسەفەیەکە هینی ڕۆژگاری کۆنە ماوەتەوە، یەسنا لەڕووی شێوە دایالێکت- لەهجەوە لەگەڵ هەموو بەشەکانی دیکەی ئاوێستادا جیاوازی هەیە.

یەسنای کۆن ئەگەرچی تێکەڵاوی شیعر و نەسـر بـووە، ئـەم یەسـنایەی ئێستا، هەر ئـەو یەسـنایەی کـاتی ساسـانییەکانە، لەگـەڵ یەسـنای کـاتی هنمامەنشینییەکاندا کەمێك جیاوازی هەیە، بەشێك لـەم پەرتوکـە لـەکاتی ئەسکەندەردا لەناوچووە. بەشی زۆری یەسنا (گات) لەخودی خۆی زەردەشـتە. بـەم شـێوەیە ئـەم پەرتوکـە، بـە پـەرتوکی پـیرۆزی بنـەڕەتی زەردەشـتیان دەژمێردرێت. گات خاوەنی پێنج بەشە و ناوی هەر بەشێك لـە یەکـەم وشـەی گات وەرگیراوە.

بەشی یەکەم: ئاهونەو ئی تی کە بە پەهلەوی ئاهودگات دەبێت، خـاوەنی حەوت بەشن و سەد بەند و (٢١٠٠) وشەیە.

بەشی دووەم: ئاوشت و ئی تی بە پەهلەوی ئاشتودگاتە، ئەمەش بریتییـە لە چوار بەش و (٦٦) بەند و (١٨٥٠) وشەیە.

بەشی سێیەم: سپنتەئین یو بە پەهلەوی سـینتمدگاتە، ئـەم بریتییـە لـە چوار هات و (٤١) بەند و (٩٠٠) وشەیە.

بەشی چوارەم:- وهوخسترە، بە پەهلەوی ئان و هوخشترەگاتە، یەك بەش و (٢٢) بەندو (٤٥٠) وشەیە.

بەشی پێنجەم: وهیشتو ایشتی، بە پەهلەوی و هیتت واشت گاتی ناوە، خاوەنی یەك هات- بەش و (٩) بەند و (٢٦٠) وشەیە.

هەموو ئەم پەرتوكە ڕاز و نیازی زەردەشتە لەگەڵ ئاهورامەزدا و گفتوگۆ و گوێگرتنی لەگەڵ ئەودایە. لەم پەرتوكەدا زەردەشت لە زۆر جێگایدا خۆی دەناسێنێت و خۆی دەنوێنێت كە پێغمبەری هەڵبژاردەی خودایە.

پەرتوكی یەسنا: لای زەردەشتەكان زۆر پیرۆزە، بۆ ئێرانییەكان پەرتوكێكە كە نموونەی نەژاد و گەلی ئەوان دەردەخات. پەرتوكێكە یەسنا بە هەمیشەیی هێرش دەكاتە سەر درۆكردن و درۆزن، ڕاستی بە پیرۆز دادەنێت، وەك ئەمەی خوارەوە:

١- نزیكبوونەوە لە خودا بەهۆی ڕاستی و ویژدانی پاكەوە بەجێدێت.

٢- شان و شەوكەتی پاك، بەهۆی ڕاستییەوە دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت.

٣- خۆشی بۆ ئەوانەیە كە ڕاستن، ناخۆشی بۆ ئەوانەیە كە درۆزنن.

٤- ئەو كەسەی دۆست و پاڵپشتی ڕاستییە، دۆستی ئاهورامەزدایە.

٥- ئاهورامەزدا سەرچاوەی ڕاستی و ویژدانی پاكە.

٦- كاری ڕاستی و باشی خۆت، بە ئاهورامەزدا بسپێرە.

٧- ڕاستی دانای ئێزدی فێركەرە. ڕاست، دانای ابزدت فێر دەكات.

٨- باشترین دەستكەوت لە ڕاستییەوەیە.

٩- باشترین لەزەت، ئارەزووی ژیان، كردەوەی ڕاستییە، لە یاسای ڕاستیدا.

١٠- فەرمانبەرانی ڕاستی هۆی ئاوەدانکردنەوەی زەمین و خۆشی جیهانن.

١١- ئەو خەڵکانەی درۆزنن و درۆدەکەن، ژیانی مرۆڤ لەناودەبەن.

١٢- قوتابی درۆکەر: کە گفتەی خراپە دەڵێت، خەڵك لە ئیشوکاری دوور دەخاتەوە.

١٣- بەرهەڵستکردنی دژی درۆ، باشترین پێشکەشییە لەلایەن ئاهورامەزداوە.

١٤- خەڵکی ڕاست دەبێت نزیك نەکەونەوە لە خەڵکانی درۆزن.

١٥- خەڵکی درۆزن ناشیرین و ناهەموارن.

## ٢- یەشت:

ئەم ناوە لە ئاوێستادا (یەشتی) و لە پەهلەویدا یەشتە کە بەواتای ئەوەی لەگەڵ یەسنا یەکێکە. یەشت لە ڕووی مێژووییەوە باسی جوگرافیا و ئەفسانەی پادشاکانی پێش زەردەشت دەکات. هەروەها ستایشی خودا و ڕووداوی کردگار و خەڵکی باس دەکات.

گرنگترین بەشی یەشت، لەڕووی مێژووی ئاینەکانەوە باس دەکات، ئابان یەشت، مهر یەشت، زامیاد یەشتە.

لەکاتی زۆر کۆندا سروودی یەشت شیعر- وێژەی هەبووە. ئەو یەشتەی لە بەردەستدایە لەکاتی زەردەشتدا نووسراوە، لە هەموویان کۆنتر، لەوانە، دەربارەی خوای پیرۆز وەك (میترا) و وایو و بەهرام و چەند بەشێکی دیکەشە.

ئەمانە هەمووی پەیوەندی بە سروودی گەلەکانی ئاریای یەکەمجارەوەیە. بۆیە ئەم پەرتوکە نوێنەری ئاینی مەزدیسنا نەبووە.

### ٣- ویسپرد:- ویسپرد دوو بەشە:

ویسپ: بە واتای هەموو هەموانی ورد، بە واتای نهێنی، گەورە، سەروەر و ڕابەر، بەتێکڕای هەمووی، بە واتای سەروەران. ویسپرد خاوەنی (٢٣) بەشە، باسی ستایش و پێشەوایانی ئاینی و نوێژکردنە.

### ٤- وندیداد:

لە بنەڕەتدا ئەم وشەیە دیودات بووە، ئەم پەرتوکە بەشی داد- احکام و یاسای ئاینییە، هەندێکیش دەربارەی ئەحکامی موغەکانە پێش زەردەشت.
پرۆفیسۆر گای بار: دەربارەی ئەم پەرتوکە نووسیویەتی، وندیداد بەتێکڕای دەستوور و یاسایەکە، کە ئامانجی لەناوبردن و سڕینەوەی هەموو ڕووداوێکی خراپە و ئەهریمەنییە لەو ڕۆژگارەدا. وندیداد: خاوەنی (٢٢) بەشە.

### ٥- وردە ئاوێستا:

ئەم پەرتوکە بە پەهلەوی پێی دەوترێت خورتەك ئایستان، بە واتای ئاوێستای بچووك، دەربارەی نوێژ و ڕوونکردنەوەی جەژن و مەراسیمە... هتد.

## بەهەشت و جەهەننەم لە ئاینی زەردەشتدا:

ئاینی زەردەشت سێ بنەڕەتی هەیە: هومەت: (بیری باشە)، هوخت (قسەی باش) و هورشت (کرداری باش). ئەم سێ شتە دەوترایەوە لەلایەن ئەوانەی لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون، کە ئەمەش بەرزترین ویژدانی مرۆڤە. ئەوانەی ئەمانەیان تێدابووە و لای ئاهورامەزدا خۆشەویست بوون و دەچوونە بەهەشت. بەپێچەوانەی ئەم سێ شتە: بیری خراپ، قسەی خراپ، کرداری خراپ، کە لای ئەهریمەن خۆشەویست بوو، لای ئاهورامەزدا خراپەکار بووە، جێگای ئەوانەی وان، جەهەننەمە.

ئەمە بوو ئەو پێغەمبەرەی ئاری کە لە سەرەتای ئاینەکەیەوە ئەم سێ پیرۆزەی دانا بۆ مرۆڤ.

بەهەشت بە سێ نهۆم دانراوە، یەکەم نهۆم جێگای گفتەی باشەیە، لە ناوەڕاستی ئەستێرەکاندایە. نهۆمی دووەم: لە کەشکەشاندا مانگە. نهۆمی سێیەم: لە کەشکەشانی سەرووتر ڕۆشناییە. ئەوانەی کردەوەی باشیان هەبووە و بەو سێ نهۆمەدا دەڕۆن و دەگەنە بەهەشت.

لە نهۆمی سێیەمدا، لە ئاوێستادا بە ناوی ئەنغرەر ئۆجە زانراوە بەواتای ڕۆشنایی بێ پایان، وشەی بەهەشت لە بنەڕەتدا وەوەهیشت و فردەوس بەواتای ئەنگدوهیشت بەواتای باشترین ژیان، یان باشترین جیهان.

بارەگای گەورەی ئاهورامەزدا پان (عرش اعظم) لە ئاوێستادا بەناوی گرونمان و لە نووسینی فارسیدا بە گرزمانی پێ دەڵێن. بەهەشت خۆشترین و باشترین جیهانە لەو جێگایەدایە.

**دۆزەخ: جەهەننەم:- ئەویشسێ چینە- نهۆم:**

دانراوە بۆ ئەوانەی بیری خراپ، گفتەی خراپ، کـردەوەی خراپیـان هەیـە و بەوە دەڵێن دژمن و دوژخت و دژورشت، ئەم سێ ناوەی هەیە. گوناهکـار پـاش ئەوەی دەگاتە سەر پردی چینوت هەمان پردی سـراتە. یەکـەم جێگـا لەوێـدا جێگای بیری خراپە، گفتەی خراپە، کرداری خراپـە، پـاش ئـازار و هیلاکـی و سەرلێشـێوان دەگاتـە قۆنـاغی چـوارەم کـە پێـی دەڵـێن ئانغمرتمنگـە (Angnratemengha). کـە جێگـای ئەهریمەنـە، بـە خـاوەن و مـاڵی درۆکەران ناو دەبرێت.

لە ئاوێستادا پاش مردن لەسەری بەیانی چوارەم ڕۆژیـدا، ڕۆح لـە گیـانی مرۆڤ جیادەبێتەوە، ئەگەر مردووەکە کردەوەی باشی هەبوویێت، هەستی ئـەو و ویژدانی ئەو لە شـێوەی کچـێکی زۆر جوانـدا لـەپێش ئـەوەوە دەڕوات بـەرەو فردەوس، لەسەر پردی چینوت بەپەلە دەڕوات و دەچێتە بەهەشت، کـە لـەوێ هەمیشە بەهار و گوڵ و گوڵزارە و هەموو جۆرە خـواردنێکی بـاش و خۆشـی تێدایە.

ئەوەی خراپەکار بێـت: یـەکێکی خراپـەکار لەشـێوەی پیرەژنـدا بـە بـاڵاو جلوبـەرگێکی زۆر خراپـەوە، بـە بـەردەم ئـەوەوە دەڕوات کـە ڕێنیشـاندەری جەهەننمە و پردی جینـۆت کـە بـۆ چـاکەکاران پـان و فـراوان دەبێـت، بـۆ خراپەکاران باریك و تیژ دەبێت، لەوێوە دەکەوێتە خـوارەوە بـە سـێ قۆناغـدا دەڕوات: بۆ خراپەکاران، بیری خراپ، گفتەی خراپ، کـردەوەی خـراپ، دەگاتـە قۆناغی چوارەم، کە جێگای گوناهکار و درۆزنانە، خواردنی ئەو زەهرە، هەموو

شتێکی خواردنی بۆگەناوی و بە هەموو جۆرە ئازارێك ئازار دەدرێت، لەگەڵ دێو و گوناهکاراندا کاتی ناخۆشی بەسەر دەبات.

ئەگەر هات و کردەوەی خراپ و باشەی یەکێك وەك یەك بێت. ئەو دەبەنە جێگایەك بەناوی (هەمیستگان)، لەو جێگەیەدا نە لەزەتی بەهەشت دەچێژێت و نە ئازاری دۆزەخ. پردی چینوت بۆ ئەوانەی کردەوەیان باشە بە ئەندازەی (٩) نیزە، یان (٢٧) تیر پان دەبێت. بۆ گوناحکارانیش وەك دەمی تیغی لێ دێت باریك و تیژ.

هەموو ڕۆح دوای مردن سێ شەو و سێ ڕۆژ لەسەروو سەری مردووەکەوە دەمێنێتەوە، ڕۆژی چوارەم لە لاشەی مردووەکە دوور دەکەوێتەوە.

## پێنج جار نوێژکردن لە شەو و ڕۆژێکدا:

مەرج و کاتی نوێژکردن لە مەزدیسنادا بەم شێوەیەیە: بۆ پێنج بەش دابەش بووە بەسەر شەو و ڕۆژدا و هەریەکەیان بە ناوی فریشتەیەکی تایبەتییەوەیە.

١- هاون گا: لەکاتی دەرچوونی خۆردایە تا نیوەڕۆ.

٢- ڕپیت وین گا: کاتی ئەم نیوەڕۆیە تا کاتژمێری سێی پاش نیوەڕۆ.

٣- اوزیرین گا: لەکاتژمێری سێی پاش نیوەڕۆیە تا ئێوارە ئەستێرە دەردەکەوێت.

٤- ایویس ڕوتریە گا: کاتی ئەم لەسەرەتای ئەو تا نیوەشەو.

٥- اشهین گا: کاتی ئەم لەنیوە شەو بەدواوە تا خۆرکەوتن.

هاونی، پیت وین، اورزیرین، ایویس ڕوتریم، اشهین، پێنج فریشتەن ئاگاداری ئەو ڕۆژە دەکەن و هەر یەکێك لەوانە کۆمەڵێك لە ایزدان وەکو: تیشك و ڕام، اردیبە هەشت، ئازەر، اپم نەپات، ایزد او، فروهەر، اوپرتات، سروش، ڕش، اشتاد، یان لەگەڵدایە.

## مەرجی نوێژکردن:

١- گیان پاککردنەوە لە هەموو جۆرە پیسییەك.

٢- پاککردنەوەی جلوبەرگ لە هەموو پیسییەك. لە شتی مردارەوەبوو، یان پیسی ماڵیات-حەیوانات، هەروەها نینۆك، خوێن و... هتد.

٣- لەبەرکردنی کراس و پشتوێن.

٤- دەست و دەموچاو شۆردن.

٥- جێگای نوێژکردن دەبێت پاك بێت لە هەموو جۆرە پیسییەك- دەوروبەری جێگای نوێژکردن تا چل هەنگاو یان بەلای کەمەوە سێ هەنگاو، دەبێت پاکوخاوێن بێت.

٦- جێگای نوێژکردن: نابێت لە یەکێك سەنرابێت، یان بە پارەی دزی کرابێت.

## شێوەی دەستنوێژگرتن:

دەست تا مەچەك و دەموچاو تا بناگوێ و ژێر چەناگە و ناوچاوان، قاچ تا قولەپێ سێ جار بە ئاوی پاك و زۆر بەباشی بشۆرێت، پاشان دۆعای دەست و دەموچاو شۆردن کە ناوی (سرووش)ە، دەخوێنرێت و بە تازەکردنەوەی پشتوێن- پاشان خوێندنی نوێژ.

لەکاتی نوێژداو لە جێگایەکدا کە ئاو نەبوو، بە لـەپی دەسـت سـێ جـار دەدرێت بە خۆڵێکی پاکدا لە زەوی و دەیهێنێت بە دەموچاو و پشتی دەستدا.

## قیبلە: ڕووتێکردن:

لەبەر ئـەوەی خـودا لـە یـەك جێگـادا نییـە بـە هەمیشـە نوێـژکردن و ڕووتێکردن دەبێت ڕوو بکرێتە هەموو ڕۆشـناییەك وەك خـۆر، مانگـە، چـرا، ئاگر.

نوێژی مەزدیسنا:

نوێژی یەکەم: ئاوێستای

خشنەترە ئاهورامەمەزدا

اشم و هووە هیشتم استی

ئاوشتا ئاستی اوستا اهمایی

هیت اشائی و هیشتائی ایشم.

بـە کوردییەکـەی: بـە شـادی ئاهورامـەزدا و بـەناوی خـوای بەخشـندە. بەخشندەی میهرەبان پاکە و ڕاستی باشترین چـاکەیە و مایـەی کامەرانییـە، کامەرانی بۆ کەسێك کە ڕاست و خواستی باشترین ڕاستییە.

## نوێژی دووەم: بە ئاوێستایی:

خشنە ترە ئاهورامەزدا

یەتا ئاهو وئی ڕیو

ئاتــارتوش اشــات چــيت هيچــا- دنگهــوش دزداشــنگهو. شــيئوت نيــنم ئانگنوش مزدائی- خشترم چا ئاهورايی ايم دريگو بيود دت واستارم.

بــه كوردييه كــه‌ی: بــه شــادی ئاهورامــه‌زدا- بــه‌ناوی خــوای به‌خشــنده، به‌خشنده‌ی ميهره‌بان- كه ئه‌و سه‌رداری جيهان (ئاهو)[1] بــه‌توانا و لێهــاتووه هه‌ر ئه‌وه سه‌رداری ئايين (رتورو) به‌هۆی پاكی خۆی به‌توانايــه دانــه‌ری بــيری باشه و (وهومن) نازناوی كه‌سـێكه كــه به‌رامبــه‌ر داخــوازی مــه‌زدا، ڕفتــار بكات، فه‌رمانڕه‌وايی ئاهورايی وێژه‌ی كه‌سێكه، كه ده‌روێشــان و بــێ نــه‌وايان ده‌ستگيرۆدی بكات.

## نوێژی سێيه‌م به ئاوێستای:

ينگهه هان ائت يسن بيئيتی و نگهــومزدا و اهــورد وئشــا اشــات هيچــا پاونگ. همچا تسچاتاو سپما يزمئيد.

به‌كوردييه‌كه‌ی: مه‌زدا ئاهورا ئاگاداره كه زياتر و باشتر ستايش ده‌كات به شێوه‌ی ڕاستی، ستايشی ئه‌و پياو و ژنانه ده‌كه‌ين.

## جه‌ژنه‌كان:

١- جه‌ژنی نه‌وزۆز: له يه‌كه‌م ڕۆژی ســاڵدايه، يه‌كــه‌م ڕۆژی فه‌روه‌ردينــه، هه‌روه‌ها پێی ده‌وترێت هرمــزد، كــه نــاوی پــيرۆزی ئاهورامه‌زدايــه و بــه‌نانی جه‌مشيد پادشای پێش دادی و به‌ناوبانگه. يه‌كێك لــه تايبه‌تييــه پيرۆزه‌كــانی

[1] اهو: دادپه‌روه‌ری بنه‌ڕه‌تی.

نەورۆز ئەوەیە کە لە مانگی فەروەردیندا بووە، ئەو ڕۆژەیە کە مرۆڤ بۆ یەکەم جار لەو ڕۆژەدا دروست بووە.

٢- جەژنی شەشەمی فەروەردین: ڕۆژی شەشەمی فەروەردین کە ڕۆژی خوردادی ناوە، ڕۆژی لەدایکبوونی ئاشو زەردەشتە- اسپیقان پێغەمبەری گەورەی ئێرانی کۆن، زەردەشتییەکانی ئێستا لەو ڕۆژەدا جەژن دەگرن.

٣- گەهنبار: جەژنێکی گەورەی مەزدیسناکانە کە لەو ڕۆژەدا- قسەکردن هاتووەتە دی.

٤- تیرگان: جەژنی ئاویژانی ناوە، لەم ڕۆژەدا کە ڕۆژی تیری ناوە لەو مانگەدا، زەردەشتییەکان ئاو بەیەکتردا دەکەن، بەو ڕۆژە ناسراوە کە ئێرانییەکان سەرکەوتوو بوون بەسەر توانییەکاندا.

٥- جەژنی مهرگان: ئەم جەژنە لە ڕۆژی مهرایزد کە لە مهر مانگەدایە، ئەو ڕۆژەیە ئێرانییەکان، بە سەرۆکایەتی کاوەی ئاسنگەر بەسەر زووحاکدا سەرکەوتوو بوو. فەرەیدونی کوڕی جەمشیدیان کردووەتە پادشا.

٦- جەژنی سدە: بەپێی لێکۆڵینەوەی کۆن لە دەیەمی مانگی بەهمەندایە، کە پێی دەوترێت ابان ڕۆژ، پەنجاو پێنج ڕۆژ پێش جەژنی نەورۆزە، ئەو ڕۆژەیە کە هۆشەنگ شای ئێران- ئاگری دۆزیوەتەوە.

٧- جەژنی مانگەکان: ئێرانییە کۆنەکان هەر ڕۆژێك لە مانگدا کە ناوی وەکو ناوی مانگەکەیە. ئەو ڕۆژەیان دەکرد بە جەژن. بۆ نموونە وەکو ڕۆژی فەروەردین لە مانگی فەروەردیندا دەبووە جەژن و ڕۆژی ئوردی بەهەشت لە مانگی ئوردی بەهەشتدا ئەو ڕۆژە دەبووە جەژن.

## (ناوی ڕۆژی مانگەکانی کۆنی ئێران)

| ژ | ناوی پارس | ناوی ئاوێستا | بەواتەی چی= |
|---|---|---|---|
| ١ | هرمز | Ahura-Mazda | خوداوەندی یەکتا و بێ هاوتا |
| ٢ | بەهمەن | Wohumana | بیری باش |
| ٣ | اردی بەهەشت | Asha-wahishta | چاکترین و بەرزترین ڕاستی و پاکی |
| ٤ | شەهری وەر | Khshatrawairya | پادشایەك کە خەڵکی دەیەوێت یان وڵاتێك |
| ٥ | سپندارمزد | Spentqa-Armast | پیرۆز لەخۆبردن و میهرەبان. |
| ٦ | خورداد | Ha-orratata | لەشساغی، تەندروستی، رسای، ڕێکوپێك |
| ٧ | امرداد | Ameretata | بەمەرگی |
| ٨ | دی بەازر | Datoshu | دادپەروەر، دروستکەر. |
| ٩ | ئازەر | Athar | ئازەر- ئاگر |
| ١٠ | ئاپان | Apan | ئاو |
| ١١ | خێر | Karure-khshuita | خۆر |
| ١٢ | ماه | Maongha | مانگ |
| ١٣ | تیر | Teshtarya | تشتر، ئەستێرەباران |
| ١٤ | گئوس | Geush | جروجا تەوەر کە هەیە. |
| ١٥ | دی بەمهر | Datosha | دادپەروەر، دروستکەر |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦ | مهر | Mithra | میهرەبان و خۆشەویستی عەهد و پەیمان |
| ١٧ | سرووش | Sraosha | فەرمانبەرداری |
| ١٨ | رشن | Rashna | دادپەرستی |
| ١٩ | فەروەردین | Farawashi | فروهەر، فریشتە، هێزی پیشڕەو. |
| ٢٠ | ورهرام | Weretraghna | پیرۆزی |
| ٢١ | رام | Ramar | خۆشی، شادی |
| ٢٢ | لباد | Rata | با |
| ٢٣ | دی بەدین | Datosha | دادپەروەر، دروستکەر |
| ٢٤ | دین | Daena | ئاین، ویژدان. |
| ٢٥ | ئارد | Ashicwanghoi | بۆ توانا، داخواز |
| ٢٦ | اشتاد | Arshtata | ڕاستی |
| ٢٧ | ئاسمان | Asmana | ئاسمان |
| ٢٨ | زامیاد | Zemu | زەوی، زەمین |
| ٢٩ | مانترە سپند | Manthra-Spenta | وشەی پیرۆز، قسە ئاسمانی. |
| ٣٠ | انارام یان ئیران | Anaghara-Raocha | ڕۆشنایی بێ پایان |

## ژنهێنان:

لە بەشی چوارەم بەندی (٤٧) وندیداد، ئاهورامەزدا دەڵێت: ئەی شەسپیتمان زەردەشت، ئەوانەی ژنیان نییە من ژنیان دەدەمێ، ئەوەی مێردی نییە، مێردی دەدەمێ، بۆیە هەمووان کۆمەکی هەموو ئەوانە بکەن کە کەمدەستەڵاتن، ژن بهێنن لەکاتی باڵغبوونیاندا.

مارەکردن:

لە ئاینی زەردەشتیدا مارەکردن بە پێنج جۆرە:

١- ژنی پادشای: بەوە دەڵێن کوڕ و کچ، دایك و باوکی کوڕ و کچ ڕازیبن.

٢- ایوك ژن:- بەوە دەڵێن، کچێك برای نەبێت و باوکی هەبێت، کە شوی کرد، یەکەم کوڕی خۆی دەدا بە باوکی، بەوە دەڵێن (ایوك ژن) بۆ ئەوەی باوکی کچە بە وجاغ کوێریی نەمێنێتەوە.

٣- چاکر ژن: ئەمە بۆ ژن و بۆ پیاوە، یان بۆ بێوەپیاوە، پیاوێك لە ژنی یەکەم منداڵی نەبێت، بەڕەزامەندی ژنەکەی، ژنێکی دیکە دەهێنێت، ئەم ژنە تازەیە وەك کارەکەری ژنی یەکەمی دەبێت، پێی دەڵێن چاکرژن، چونکە ژنی یەکەم بە پادشا ناوبراوە.

٤- خود سەرژن: بریتییە لەوەی کوڕ و کچ تەمەنیان لە بیستویەك ساڵیدا بێت، بەبێ ڕەزامەندی باوك و دایکی هەردوولایان بە یەك بگەن، بۆ ئەم مەبەستە موبدان مارەیان دەبڕێت، بەڵام ئەم دووانە بێبەش دەبن لە هەموو شتی ماڵە باوکیان، کچ لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا و کوڕ لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا، بە ڕەزامەندیی باوك و دایکیان دەتوانن شوو بکەن و ژن بهێنن، شێوەی شوکردن و ژنهێنان لەناو خزمدا:

ا- بۆ ژن: کوڕی مام و خاڵ و پوور نابێت.

ب- پیاو: کوڕ و کچی مام، پوور... ئەوانەی شیریان خواردبێت لەگەڵیدا نابن.

٥- ستر زون: کە ژن و پیاو منداڵیان نەبێت، منداڵێك هەڵگرنەوە، یان لە دۆست و خزمی خۆیان کە هەژاربن، بیکەنە منداڵی خۆیان. خاوەنی هەموو شتە، ئەمە کە منداڵی بۆ دەیدات بەو دایك و باوکەی کە بەخێویان کردووە.

جیابوونەوە: لە ئاینی زەردەشتدا جیابوونەوە بە ئارەزوو نییە، بۆیە لەبەر ئەوەشە باسی مارەیی ناکرێت.

١- ژن یان پیاو شێت بێت، مافی جیابوونەوەی هەیە، یان ئەگەر لە سەرەتاوە نەیزانیبێت و پاشان بزانێت کە دێوانەیە، واتا شێتە.

٢- هەرکاتێك پیاوەکە لە پیاوەتی کەوتبێت، ژن دەتوانێت جیابێتەوە.

٣- هەرکاتێك پیاو سێ ساڵ لە ژنەکەی دووربێت، ژن دەتوانێت جیابێتەوە.

٤- هەرکاتێك پیاو یان ژن، یەکێکیان بە کاری خراپەی داوێنپیسی هەستان، ئەوەی دیکەیان دەتوانێت جیابێتەوە.

٥- هەرکاتێك ژن ئازار بخوات بەدەست پیاوەکەیەوە، دەتوانێت جیابێتەوە.

٦- هەرکاتێك ژن بە قسەی پیاوەکەی نەکات، پیاوەکە مافی جیابوونەوەی هەیە.

٧- هەرکاتێك پیاو ژنێك بهێنێت بەدزییەوە کە ژنێکی دیکەشی هەبووبێت، پاش ئەوە ئاشکرا بێت، لە ژنە تازەکەی تەڵاقی دەکەوێت.

٨- هەرکاتێك یەکێکیان واز لە ئاینی زەردەشتی بهێنێت، تەلاقی دەکەوێت- جیادەبنەوە.

زەردەشت دەڵێت کاری خراپ و گوناحکردن، مرۆڤ بە دەستی خۆیەتی، مرۆڤ دەتوانێت خراپە نەکات.

گوناهی گەورە لە ئاوێستادا بەم شێوەیەیە:

پەیمان شکێن، درۆکردن، خۆپەرستی، ڕق و کینە، بێدادی، بێ عەدالەتی، ناپاکی، کلاّولەسەرنان، خووی تایبەتی خراپ، سستی، لە خۆباییبوون، سحربازی، دزیکردن، دووزمانیکردن، کینە هەڵگرتن، سووخواردن، بتپەرستی، وشەی ناشیرین وتن، درۆ هەڵبەستن، ئازاردانی جانەوەران، ئازاردانی هەژاران، تەمەڵی، ژن زۆرهێنان، واتا چەند ژنێك، داوێنپیسی، خراپەکردن، هەتیوبازیی، خۆکوشتن.

گریان و خۆکوشتن بۆ مردوو:

مافی ژن لە ئاینی زەردەشتیدا: زۆر بە باشی پارێزراوە، بەرامبەرە لەگەڵ پیاودا، پیاو نابێت دوو ژن بهێنێت. ئاینی زەردەشت، ئاینێکی پاکوخاوێنە، ئەگەر گەورەترین پاککەرەوەیە، پاکترین و ڕووناکترین ڕووناکییە و بەسوودە بۆ مرۆڤ، لەبەر ئەوەیە بووەتە نموونەی ئەو ئاینە.

لای هەندێك نەزان باوەڕیان وایە کە زەردەشتییەکان ئاگرپەرستن، چونکە زەردەشتییەکان بەرەو ڕووناکی یان ئاگر نوێژ دەکەن، ئەوان ئاگرپەرست نین، بەڵکو ئاگر بە ڕەمز و نموونەی ئاهورامەزدا دادەنێن. زەردەشتییەکان هەمیشە یادی خواوەندی یەکتا و ئاهورامەزدای بەهاوتا دەکەنەوە. زەردەشت ئاگری بەناونیشانی نموونەی ئاینەکەی خۆی هەڵبژاردووە.

## ئاگردان:

لە ئێرانی کۆندا تەنها جێگای نوێژکردن نەبووە، بەڵکو دادگـا و جێگـای دادوەرمان و خوێندن بووە. موبد لەم جێگایانەدا، دادپەروەری، چارەسەرکردنی نەخۆشـی و برینـداران و خوێنـدنیان فێـری منـداڵان کـردووە و جێگـای پەرتوکخانە بوو، زۆر بایەخیان داوە کە ئەو جێگا پـیرۆزە نابێـت پـیس بێـت، ئاگاداری کراوە لەلایەن بەری و ئاگردان. ئەمانـە زۆر پاکوخـاوێن و دڵسـۆزی ئاینی زەردەشتی بوون، هەموو ئەو شتە باشانەیان گەیاندووەتە خەڵکی.

## ملتون:

نووسیویەتی زەردەشت یەکەم بیرکەرەوەیەکـە، ئاینەکـەی خـۆی بەشـێوەی ئاداب و ئەخلاق دروستکردووە، ئەو یەکەم کەسێك بـوو ئاسمـان و زەوی بـاش شیکردبووەوە و لە دروستبوونییەوە، ڕاستی و دروستی کردبووە فەرمانڕەوا.

## کاسارتلی:

دەڵێـت مەزدیسـنا دەتوانێـت شـانازیی بەخۆیـەوە بکـات، کـە خـاوەنی فراوانییەکی زۆر باش و بەرزترین و جوانترین سیستمی ئەخلاقییە.

## پاڕانەوەی زەردەشتییەکان:

سێ جار لەسەر یـەك دەڵێـت بـە فـەرمانی تـۆ ئـەی ڕوونـاکی هـەموو ڕووناکان، باوەڕی پێ دەکەم و تێ دەفکرم-دەیهێنمەوە یادم، دەیڵێم و کاری پێ دەکەم بەرامبەر ئاینی پیرۆزی مەزدیسـنا، بـەختیارم بەرامبـەر بـە کـردەوەی باش، تۆبە دەکەم لە هەموو گوناهکردن، بە پـاکی و بـە باشـی ئـەو شـەش هێزەی گیان پەیڕە و دەکەم، کە بریتین لە: (کـردەوە، قسـەکردن، بـیر- فکـر،

هۆش، دانای، وێژە). پەیڕەوی تۆ دەکەم بە بیری باشە، قسەی باشــە، کــردەوەی باشە.

## ئەمشا سپند:

بەواتای پیر و زۆر جوان، کۆکردنەوەی دەبێتە امشا سپندان- لە ئیســلامدا بەوە دەڵێن- مەلائیکە، ئەم وشەیە لە ئاوێستادا بە امشەپسنتە هــاتووە، کــە لە سێ بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم، پتی (١) کە بۆ نەفی- لابردن بەواتای (نە) یان نا بەواتای بەبێ، بەشی دووەم (مشە) بەواتای مردن و لەناوچوون.

بەشی سێیەم- سپسنتە کە ئێستا پێی دەوترێت سیند بــەواتای- ســوود- قازانج، هینــەران و پــاك و دەرمــانکردن. هەرســێ بەشــەکەی بــەواتای- بــێ کۆتایی، بێ مەرگ و سوودهێنەران.

خواوەند (١٥١) ناوی هەیە لە ئاوێستادا، بەئاوێستای و بە کوردی لێرەدا نەمان نووسیوە ناوی خوداکان.

## ئاینی بودا:

ئەم ئاینە لە فەرمانڕەوای (ئاشوکا)[1] لە سنووری هیندســتانەوە زیــاتر ڕۆیشت و لە باکووری خۆرئاوای تا کشمیر و قەندەهار و کابول بڵاوبــووەوە، تــا گەیشتە ڕۆخی جەیحون، ئەمەش پێش زاینی مەسیح بووە.

---

[1] اشوکا: Asoka یەکێکە لە گەورەترین پاشاکانی هیند لە زنجیرەی موریــا Murrya کــوڕی بنیــداش Bendas، کــە لــە ســاڵی ٢٢٧ تــا ٢٦٤پ. فــەرمانڕەوا بــووە لــە ئەفغانستان، دەوروبەری ڕووباری سەند و گنگ بــەواتای هــەموو بەشــەکانی ئــەمڕۆی

ئـاینی بـودا گەیشـتبووە بلـخ، ئـەو جێگایـەش جێگـای دانیشـتووانی زەردەشتییەکان بووە. پەرستگاکانی بـودای زۆر بـوون. مێژوونووسـی یۆنـانی ئەلکساندرپولی هیستۆر (Alexander Ployhistor) لە سنووری ساڵی (٦٠-٨٠) پ.ز پەرتوکێکی نووسیوە دەربارەی شمن ها- راهب، ناوی بردووە بە نـاوی بلخـەوە، اتوخوسـی دووەم: پادشـای سـلوکی لـە (٢٤٦-٢٦١)پ.ز دەستووری دا بە شمنەکان- ڕاهیبەکان کە لـە هـەموو ناوچـەی ئێـران و ئـەو جێگایانەی لەژێر دەسەڵاتی سلوکیدایە، بۆ ڕاهیبەکان بـە زوویـی ئارامگـا و نەخۆشخانە دروسـت بکـەن، بـۆ بڵاوکردنـەوەی ئـاینی بـودایی، لـە سـاڵی (٦٧)پ.ز کۆمـەڵێك لـە پیـاوە ئاینییـەکانی بـودایی ئاینەکـەی خۆیـان گەیاندووەتە چین، ئاشکرایە کە چەند کەس لەو ڕاهیبانە چوون بۆ چین، تەنها ناوی پێنج کەسیان هەیە:

١- ئان هوان.

٢- ان شی کائو.

٣- ت ان وتی ان ماهین.

٤- ان ناچین.

---

هیند —جگە لە ناوچەی کۆتایی باشووری نەجـدوکن هـەمووی کـردە یـەك دەوڵـەت- پاڵپشـت و پشـتیوانی ئـاینی بـودای زۆر کـرد و گیـانی ئـازادیی لـە سەرانسـەری هیندستاندا بڵاوکردەوە.

ئەمانەش ناوی خۆیان بە زمانی چینی نووسیوە. لە بلّخ لـە خۆرهـەلاّتی ئێراندا جێگایەکی گرنگ و ناوەنـدی بـودای هـەبووە، پەرسـتگای نەوبـەهار دەگەڕێتەوە بۆ پیاوە ئاینەکانی ئەو ئاینە.

یەکێك لە گەڕۆکەکانی چینی بە ناوی هـوان تشـنگ (U.Tsing) لـە ساڵی (٦٢٩-٦٤٥)ز لە گەشت و گەڕاندا بووە و دەڵێت: لـە شـاری بلـخ-دا سەد دانە دیر- کمتیشای بودای و سێ هەزار شمن- ڕاهیبـەر و زاهیـد هـەن. ناوبراو لە کەنیسەی نەوبەهار یەك مانگ ماوەتەوە، ئەو تەشتەی- ئاوی بـودا کە خۆی تیادا شۆردووە، لەو جێگایەدا پارێزراو بووە، یەك دانی بوودا لەوێـدا بووە.

ئەبوبەکر محەمەد کوڕی جەعفەر نورشتحی (٢٨٦-٣٤٨)ك لە بازاڕی ماخ بلنچ دەستنیشانی کردووە، دەڵێت: ساڵ بەساڵ بت تاشین لـەم شـارەدا زیـاتر دەبێت و کرێنیشی زۆرتر دەبێت.

هەندێك لە پشگێرەکان باوەڕیان وایە کە گنـوتم لـە شـەرو ڕدینیـە شـتی ئاوێستادا هاتووە، هەمان بودایە کە باوی یەکی لە دیـوە بەرهەڵسـتەکەرانی زەردەشتە هاتووە.

نەوبەهار لە بنەڕەتدا، نووهار بووە، بـە واتـای کنیسـای تـازە. لـە کـاتی فەرمانڕەوای هارونە ڕەشید-دا، فەزلی بەرمەکی فەرمانبەری خۆراسان بـووە- لە ساڵی (١٧٩)ك، لە ئەنجامی ئاژاوەنانەوە لە بەڵنچ، ئەو چووە ئەوێ، لـەوێ فەرمانی دا نەوبەهار وێران بکەن، بنەڕەتی هێندە پان و بەرین بووە بە ئاسانی

کاول نەکرا، بەڵام بەشێکی لێ خراپ کرا، پاشان مزگەوتێکی لەوێدا لێ دروستکرد.

ڕازێکی ناوخۆی هەبووە، بتی بوروتی سوری دەوڵەتی گەورەی بودایی لەناو بلنچ-دا. دانیشتووانی خۆراسان بە ڕاهیبەکانی بودایان وتووە ڕاشمن و بە ئاینەکەیان وتووە شمنیە. بە باوەڕی پورداود ئەم وشەیە لە سەرمن لە سانسکریت وەرگیراوە- سەرمن- بەوکەسە دەوترێت واز لە ئیش و کار و ماڵ و منداڵی بهێنێت و ژیانی خۆی لە خەڵوەتدا بەپەرستن و نوێژکردنەوە بەسەر بەرێت، سەرمن بە واتای زاهید وازهێنەر لە خۆشی جیهان، کە بە زمانی پالی بووەتە سمن یان شمن، خۆی بە بودا وتراوە سەرمن، گوتم، لە فارسیدا وشەی شمن بۆ پیاوە دینییەکان بەکار نەهێنراوە، بەڵکو بە واتای بتپەرستن.

ابوریحان بیرونی: لە (تحقیق ما للنهد) وا دەڵێت: بەو هۆیەوە کە ئێمە دووربووین لەوەی نەمان دەزانی ئاینی بودایی چییە، یەکێك لەو کۆمەڵە بە شمنیە ناسراون، ئەم قەومە هەرچەند لەگەڵ هیندییەکاندا جیاوازییەکی زۆریان هەیە، بەڵام لە هەموو ئایین و مەزهەبێك کە زۆر نزیکترن بۆ هیندییەکان لە ئاوپانیشاد لەدایك بووە و هەر لەوێشدا گەورە بووە، وەك لای خوارەوە:

گوتم شاکیە- مونی: پزیشکێکی تیرەی شاکیە و دامەزرێنەری ئاینی بودایە، لەنێوان بنەماڵەیەکی دەستەڵاتداردا (چینی لەشکری) لە سەدەی شەشەمی پ.ز لە شاری کاپیلاو شتو کەوتووەتە بناری بنارسی چاوی هەڵهێناوە، باوکی گوتمە سەرۆکی تیرەی کشاتریا و سەر بە پاشاکانی کوسالاو

نـاوی شـودهوونا بـووه، دایکـی نـاوی مایـا (Maya)، لـه یه‌کـه‌م ڕۆژی له‌دایکبوونیدا دایکی مرد و پاشان پوری بردوویه‌تییـه لای خـۆی و بـه‌خێوی کردووه و په‌روه‌رده‌ی کردووه.

له ته‌مه‌نی گه‌نجیدا ژنی هێناوه، کوڕێکی بووه بـه نـاوی (راهـو لاشـو)، چه‌ند جارێك نه‌خۆشی سه‌ختی گرتووه و که‌وتووه‌ته کاتی مردن و زۆر ئـازاری چه‌شتووه، له ته‌مه‌نی (٢٩) ساڵیدا وازی له ماڵ و منداڵ و ژیان هێناوه، وه‌ك ڕاهیبه‌کان که‌وته خه‌ڵوه‌کێشان، ئـه‌و مـاوه‌ی حـه‌وت سـاڵ لـه‌ژێر چـاودێریی ڕاهیبه‌کاندا ڕیازه‌ی کێشـاوه زۆر زۆر به‌ناخۆشـی، لـه بـه‌کاره ڕیـازه‌ت هـیچ ئه‌نجامێکی به‌ده‌ست نه‌که‌وت، وازی له هـه‌موو شـت هێنـا، خۆشـی و شـتی تایبه‌تی خۆی تا ئه‌وه‌بووه (اوریولاو) پاشا بووه بۆ داگاها، شه‌وێك له شه‌وه‌کان له‌ژێر دره‌ختێکدا بوو، پاشان ئه‌و دره‌خته به‌ناوبانگ بووه بـه نـاوی (دره‌ختـی زانا)، دانا، ڕۆشنبیر و پزیشك- حه‌کیم، له‌و کاتانـه‌دا بـه دانـا و ڕاهیـب و- پزیشکه‌کانیان وتووه بودا.

له‌م ڕووه‌وه چوار ڕاستی بـه ئـه‌و ڕوونبـووه‌وه، ئـه‌م جیهانـه (ڕه‌نجـدان بـۆ فه‌رمانڕه‌وایه)، ده‌شتوانی به‌و ڕه‌نجه کۆتایی بهێنێت.

زۆری برد پێنج که‌س بوونه مریدی ئه‌و، ئـه‌و بـه وانـی وت مـن پـیرۆزم، پاشان که‌وته بڵاوکردنه‌وه‌ی ئاینه‌که‌ی خۆی، ماوه‌ی (٤٤) ساڵ، تا له سنووری ساڵی (٤٨٠)پ.ز له کاتی ڕۆشتنیدا بۆ له کوسینارا، کۆچی دوایی کردووه.

له فه‌لسه‌فه‌ی بودادا هیچ شتێك له جیهاندا وه‌ك خۆی نامێنێته‌وه. جیهان دروست بووه له شه‌پۆلی ژیان، هه‌میشه له جوڵاندایه.

هەموو شتێکی دروستبوو هەمیشەیی نییە، هەموو شت ڕەنجدانە، لە جیهاندا لە ڕەنجدان زیاتر هیچی دیکە نییە.

نە لەش دەمێنێت و بەختیارییش تاسەر نییە... هتد. حەیوان سەربڕین بۆ قوربانی لە ئاینی بودادا نییە.

بوودا دەڵێت:

١- ڕاستی زۆر بەرز ڕەنجدانە.

٢- ڕاستی بەرز گەیشتنە بە ڕەنج.

٣- ڕاستی بەرز ڕزگاربوونە لە ڕەنج.

٤- ڕاستی بەرز ڕێگایەکە بەڕێگای ڕەنج دەگات، تا کاتێک بیرم نەگەیشتبووە ڕاستی تەواو.

ئەم چوار ڕاستییەم نەبینیبوو، حەیران و سەرگەردان بووم، بەڵام کاتێک ئەوانەم بینی، باوەڕم کرد کە لەوانەوە ڕۆشنابیم دۆزییەو.

لەدایکبوون ڕەنجە، پیری ڕەنجە، مردن ڕەنجە، گریان و زاری و نەخۆشی و نائومێدیی هەمووی ڕەنجە، پێنج بەشی هەست بریتین لە: جسم-لاشە، چەشتن-احساس، بیرکردنەوە- ادراك، چۆنییەتی گیان و زانین کە هەمووی بەستراوە بە چوار شتەوە: شتی وشك، شتی شل، شتی گەرمکەرەوە، شتی لەرزاندن (با) هەوا.

## کرداری خراپە:

١- لەناوبردنی زندە، مرۆڤ و مالیات.

٢- دزیکردن کردەوەی مرۆڤ خۆی بۆ خۆی

٣- داوێنپیسی.

٤- درۆزن.

٥- دووزمانی، کردەوەی بە قسە بە گفت.

٦- قسەی ناشرین کردن.

٧- وشەی خراپ.

٨- تەماع کاری.

٩- بەدخواهی. کردەوەی گیان

١٠- سەیرکردنی نابەجێ.

بودایيەکان باوەڕیان دایە لە دروستبوونی مرۆڤەوە تا ئێستا (٢٣) بودا هەبووە، جیهانیان لە ئازار و ناخۆشی و ئەشکەنجە پاککردووەتەوە، بودای بیستوچوارەم کە دوا بودایە هەموو جیهانی خستە دادپەرستی و خۆشی و کامەرانی و خاوەنی هەموو شتی باشەیە.

## ئاینی مانوی:

مانی دروستکەری ئاینی مانۆییە، کوڕی فاتك یان فتق کوڕی ابو برزام و لە حسکانی (Hskani)یەکان بووە، ئاگام پێوسی باوکی خەڵکی شوش بووە. ناوی دایکی نەوشیت یان یونسیت-یان پێی وتووە، لە پەرتوکی

فەرهەرست (ابن ندیم) نووسراوە- رامیس و بەقسەی ئەو تاخیم و بە قسەیەکی کە مریەم یان مرمریم هاتووە.

لە نووسینی تەقی زادەدا بەرگی نۆیەم، هاتووە، کە دایکی مانی لە بنەماڵەی ناسراوی کوم سەرکان بووە. دایك و باوکی لە پارتییەکان بوون.

لە نووسینی مەسیحیدا (لاتینی) ناوی مانی بە (قوربی قوس) و لە یۆنانیدا بە (کوپریکوس) هاتووە.

مانی لە بابل لەدایك بووە، بەواتای لە بەشی باشورر بە قسەی خۆی و (گێڕانەوەی بیرونی) لە دێی مەردینو لە کوتی عولیا، لە کاتی فەرمانڕەوای چوارەم ساڵی ئەردەوانی لە ساڵی (٥٢٧) مێژووی ئەستێرەناسەکانی بابل لە یەکەم مانگی نیسانی بابلی لە ساڵی (٣١١)پ.ز بووە، لە نووسینێکی چیندا کە لە ساڵی (٧٣٢)ز-دا نووسراوە لەدایکبوونی مانی لە هەشتەمی یساند بابلی بە واتای (١٤)ی ئەبریلی ساڵی (٢١٦)ز لەدایك بووە.

فاتك- بنەڕەتی هەمەدانییە و لە تەیسەفون جێگیر بووە. پاش ئەوەی مانی لە تەمەنی (١٢) ساڵیدا لەلایەن خوداوە، وەحی بۆ هاتە خوار بەهۆی فریشتەیەك بە ناوی توم (Tom) پێی ڕاگەیاند، تۆ لەم مرۆڤانە نیت (واتا نور- ڕووناکی خودایت، هێشتا منداڵیت و لەو خەڵکانەی خراپن، دووركەوەرەوە، پاش ئەوەی مانی تەمەنی گەیشتە (٢٤) ساڵ تۆم هاتەوە بۆ لای و پێی ڕاگەیاند، تۆ ئێستا کاتی ئەوەت هاتووە نامەی خۆت دەرخەو خۆشت دەرخە کە تۆ چیت. پاش ئەوەی وەحی بۆ هاتە خوارەوە و بوو بە پێغەمبەر، کەوتە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی لە ساڵی (٢٤٠)ز.

شاپوری یەکەم بووە شاهەنشا، بەهۆی برای شاپور کە نـاوی فـەیروز بـوو، مانی لەگەڵ ئەودا و دوور لە براکانی خۆی چووە لای شا، ئاینەکەی خـۆی بـۆ شا ڕوونکردەوە لە تەیسەفون، شاپور بـاوەڕی هێنـا بـە ئاینەکـەی، ئەمـەش پاڵپشتێکی بەهێز بوو، مانی کەوتە گەڕان بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی خـۆی، لەدوا ساڵانی فەرمانڕەوای ئەردەشێردا مـانی بـەرەو هیندسـتان ڕۆیشـت بـۆ هەمان مەبەست، لەوێشەوە بۆ ئێران و پاشان بۆ بابل و میسان و خۆزستان و هاتەوە بۆ لای شاپور، لەکاتی فەرمانڕەوای هورمزدا مانی لەبابلـدا بـوو، لـە کاتێکدا بارامی یەکەم بـووە جێنشـینی ئـەو، بـەهۆی جوڵانـدن و هانـدانی موبدەکانـەوە کـە بـە چـاوێکی خـراپ سـەیری مـانی دەکـرد، لـە کۆتـایی فەرمانڕەوای بارام، مانی لە بابلەوە بەرەو باشوور بەدرێـژایی ڕۆخـی ڕووبـاری دیجلە کەوتبووە ڕێ تا گەیشتە ئـەهواز لەوێشـەوە نیـازی هـەبوو بچـێت بـۆ خۆراسان و ڕۆیشت، لەوکاتەدا فەرمانی پێکرا بچـێتە شـوش و بـە کەشـتی گەڕایەوە بۆ تەیسەفۆن، لەوێشەوە بۆ پیرگلیا لە ڕۆخی ڕووباری سـیروان چـووە لای پادشا، شاد شابانو بە یەکەوە هاتن و لەبەردەم دەرگا ئـەویان بینـی، شـا پێی وت بەخێر نەیەیت، مانی وەڵامی دایەوە من چیم لە ئێوە کردووە خـراپیم چییە، شا پێی وت تۆ بەکەڵکی چی دێیت، نە بۆ شەڕ دەڕۆیت و نە بۆ ڕاو، تۆ پزیشکی باشیت و ئەوەش ناکەیت کەمانی وتی: من هیچ دووزمانیم دژی تـۆ نەکردووە. بە فەرمانی پادشا، مانی خرایە بەندیخانەوە، ئەم کارەی بارام کـردی دژی مانی بە هاندانی موبدی گەورەی زەردەشتیان بوو بە ناوی (کەرتر) بـوو، گوایە (٢٦) ڕۆژ لە بەندیخانەدا ماوەتەوە.

مانی لە ساڵی (٢٧٦)ز. کۆچی دوایی کردووە، هەندێك لەو باوەڕەدان کـە (سەلب) هەڵواسراوبێت. پەرتوکەکانی مانی حەوت پەرتوکن: (پەرتوکی سفر الأسرار- ڕۆیشتنی نهێنی، ١٨ بەشە- واتا باب) نووسراوە.

مانی بەهیچ جۆرێك باوەڕی بە تەورات و بە موسا نەبووە، هەریەکێك لـەو پەرتوکانەی خاوەنی بەشی زۆر زۆرن، دەربارەی ئاینی مانوی، ڕوونبووەتەوە کـە بیروباوەڕی ئەو لە ئاینە کۆنەکانی ئێرانی وەك زەروانی، زەردەشتی، ئەفسـانەی بابل، باوەڕی عیسا، تەریقەت گنـوس، وەسـبی- صبـي، وەرگرتـووە لـەناو ڕووناکی ئەو هەمـو ئاینانە، ئاینەکەی خۆی دەرهێناوە.

ئاینی مانی لە سەدەی سێی زاینیدا لـە ئێرانـەوە گەیشـتووەتە میسـر و بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما.

لە ساڵی (٧٦٣)ز. بووە ئاینی (تورکان ایغور)، بەشێك لە خـەڵکی چـین پێش هێرشی مەغۆل لەسەر ئـاینی مـانی بـوون، مەغۆلـەکان لـە سـەدەی سیانزەیەمدا پێشەوا ئاینییەکانی مانییان کوشتووە. وایان دەزانی ئـەوان دژی جەنگیزخانن، مانی- زەکـاتی بـە یـەك لـە دە (١٠\١) دانـاوە، لـە شـەو و ڕۆژێکدا چوار جار نوێژکردن.

مانی لەکاتی فەرمانڕەوای بەهرامی کوڕی شـاپوردا کـوژراوە، لاشـەکەی کراوە بەدوو لەت و هەر لایەی لە جێگایەکدا هەڵواسراوە، بـە بـاوەڕی مـانی دروستبوونی جیهان لە دوو شتەوە هاتووە: یەکەم: ڕووناکی و دووەم تاریکی.

ڕووناکی پێنج شتی هەیە- وەك سفات، کە بریتین لە: خەوبینین، زانـایی، دانایی، غەیب زانی، دەرککردن- زیەرك و دانایی. هەروەها پێنج شتی دیکـە:

(خۆشەویستی، باوەڕ، وەفا، لێبووردن، حکمەت و زانایی، خواوەندی لەگەڵ ئەمانەدایە.

دوو شتی دیکە کە بنەڕەتین ئەوەش ئاسمان و زەوییە. ئەوانەی ئاسمانین پێنجن، کە بریتین لە: (خەوبینین، زانایی، دانایی، غەیب و دەرککردن).

بەشی زەویش پێنجە: (نەسیم، باو هەوا، ڕووناکی، ئاو، ئاگر).

پێنج شتی خراپە کە هێنی تاریکییە بریتین لە: (تەمومژ، ئاگربەردانەوە، بای زەهراوی، دووکەڵ، تاریکی).

هەندێ لە بیروباوەڕی مانی: بنەڕەت و بیروباوەڕ و ئاینی مانی، ئیمان بە چوار گەورەییە: (خودا، ڕووناکی، ئاو، توانایی- قدرت).

حکمەتی خوا فریشتەی بەهەشتی ڕوناکییە و ڕووناکی ئەو خۆر و مانگ و هێزەکانی، ئەو پێنج فریشتەن: ئاینی مانی بریتییە لە وازهێنان لە بتپەرستی، وازهێنان لە درۆکردن، وازهێنان لە بەغیلی، وازهێنان لە مرۆڤکوشتن، وازهێنان لە داوێنپیسی، وازهێنان لە دزی.

لە ئاینی مانیدا چوار جار نوێژکردن لە شەو و ڕۆژێکدا، دەستانیان بەرەو ڕۆژە، واتە قیبلە.

١- ڕۆژووگرتن لەکاتێکدا خۆر لە بورجی قەوسدایە و مانگ چواردە شەوە، دوو ڕۆژ لەسەریەك ڕۆژوو دەگیرێت بەبێ خواردن چواردەیەم و یانزەیەم.

٢- مانگ کە تازە بەدەر دەکەوێت، دوو ڕۆژ لەسەر یەك ڕۆژوو دەگیرێت و ماوەی ئەو دوو ڕۆژە هیچ ناخورێت.

٣- کاتێك مانگ سەری دەرهێنا و خۆر لە بورجی دەلۆدا بێت، پاش تێپەڕبوونی هەشت ڕۆژ پێویستە سێ ڕۆژوو بگیرێت.

هەموو ڕۆژێك دوای خۆرئاوابوون شت دەخۆن، ڕۆژانی یەکشەممە و دووشەممە لای مانوییەکان پیرۆزە.

پاش مردنی زاد هرقر، مقلاس بووە سەرۆکی ئەو تیرەیە، پاش ئەوە مانویەکان بوونە دوو بەش، دەستەیەکیان بە ناوی (تیشك- مهر)، دەستەی دووەم بە ناوی (مقلاسیە).

مقلاسییەکان لەگەڵ هەموو مانویەکاندا لە ڕووی ئاینەوە جیاوازییان هەبووە، لەوانە دەربارەی دوو ڕۆژ ڕۆژووگرتن لەسەریەك.

مەزدەك و ئاینی ئەو:

مەزدەك لە سەرەتای فەرمانڕەوای قوبادی ساسانی (٤٨٨-٥٤١)ز باوکی خەسرەو ئەنوەشیروان. مەزهەبێکی هێنا کە شێوەی وەك ئەو وابوو، بنەڕەتی ئەو بەشداری بوو لە ماڵ و ژندا، مەزدەك پاش ماوەیەك کۆمەڵێکی لە پیاوە دینییەکان لە دەوری خۆی کۆکردەوە، تەنانەت قوبادیش چووە سەر ئاینی ئەو.

بەو هۆیەوە قوباد لەسەر فەرمانڕەوایی لابراو بەندیش کرا، پاشان بەهۆی ژنەکەیەوە لە بەندیخانە ڕایکرد و پەنای بردە بەر پادشای (هەیاتلە)[1]، ئەو

---

[1] هەیاتلەیان هێنا تایفەیەك بوون لە نەژادی مەغۆل لەکاتی فەرمانڕەوای ساسانییەکاندا بەلَنچ و خێوە و ناوچە و دەورووبەری ئەو ناوانەیان گرتبوو و لەساڵی ٤٢٥ز پەلاماری ئێرانیان دا و وردە وردە لەگەڵ گەلانی دراوسێی خۆیاندا تێکەڵ بوون و گەلی خوارزمیان دروستکرد.

کاتانەی قوباد لە بەندیخانە و لای پادشای هەیاتلە بوو براکەی بە ناوی جاماسب لەجێی ئەو دانیشتبوو لە ساڵی (٤٤٨-٤٩٦)ز. زۆری نەخایاند قوباد بەهۆی پادشای هەیاتلەوە و کۆششی (زەرمهر) کە یەکێك بوو لە پیاوە ناسراوەکانی ساسانی، بەم هۆیەوە گەڕایەوە سەر کار.

پاش قوباد، کوڕەکەی خەسرەو ئەنوەشیروان بووە فەرمانڕەوا، ئەو لە کۆتایی ساڵی (٥٢٨)ز و سەرەتای (٥٢٩)ز مەزدەکا و مەزدەکییەکانی کوشتووە و بنبڕی کردن، ئەو ئاینەی لەناوبرد، پاش ماوەیەك ئەو خەڵکانەی کە چ پیاوە ئاینی و چ خەڵکەکەی تر کە لەسەر ئەو ئاینە بوون، خۆیان شاردبووەوە، بەناونیشانی جۆربەجۆر بەرامبەر بە دەوڵەت هەوڵی تێکدانیان دروستکرد.

هەروەها لەکاتی فەرمانبەری- عەباسییەکاندا دیسان کەوتنە شەڕکردن و ناخۆشی زۆریان هێنانە ڕێ، لەئەنجامدا و لەکاتی فەرمانبەری مەعتەمە بیلا (٢١٨-٢٢٧)ك.ق. شکان و زۆر زیانی ماڵی و گیانییان لێکەوتەوە. سەرەڕای ئەوەش وازیان لە ئیشکردن نەهێنا، تا سنووری ساڵی (٣٠٠)ك جارجارە کەوتنە شۆڕش و ئەو هەمووکاتانە وازیان لە بڵاوکردنەوە نەهێنا، ئەوان لە ساڵی (٣٠٠)ك بە تەواوەتی تێکشکان و لەناوچوون.

تەنسر: نووسینی نامەی تەنسر لە ساڵی (٥٥٧-٥٧٠)ز نامەیەکی نووسیوە بە زمانی پەهلەوی دەربارەی ئیشوکاری سیاسی، کۆمەڵایەتی، بەڕێوەبەرایەتی و ئاینی ساسانی نووسیوە و مەزدەکی بە پیاوێکی چارەسەرکردن ناوی بردووە.

## محەمەد ئقبال لاهوری:

لە پەرتوکەکەی خۆیدا (سیر فلسفە ایران) دەڵێت: ئەم پێغەمبەرە گەورە و کۆنەی خەڵکی لە سەردەمی نەوشیروان ساسانی لە (سەدەی شەشەمی زانینی) ژیاوە. زۆر پێشکەوتوو بووە... هتد. چوار شتی گرنگی نیشانداوە، ئەوەش کە چوار هێزی بنەڕەتین: پاکی، پارێزگاری، تێگەیشتن، خۆشی.

مەزدەك دەڵێت: هەموو مرۆڤ لە جیهاندا وەك یەکن، ئەوانەی خاوەن موڵکن، خەڵکی دەکوژن بە نامەردانە. پیاوە ئاینییەکانی زەردەشتی کە ئەوانیان خۆش نەدەویست، لە پیاوە ئاینییەکان ئەوان، خەڵکی لەسەر ئاینی ئەوانیان زۆر کوشت.

## ابن بەڵخی:

دیسان لەکاتی ئەودا دەڵێت: بەو کاتەی جاماسبی برای قوباد چووە سەر تەخت و قوبادی لابرد و ئاینی مەزدەکی بە (اباحەت -بێباوەڕی) ناو دەبات.

وشەی مەزدەك لە مەزداوە وەرگیراوە، بە زمانی ئاوێستا بە واتای خودا و ئاهورامەزدا کە پاشان اورمز و هورمز بووە ناوی باوکی مەزدەك.

زۆر لە مێژوونووسانی جۆربەجۆر وایان باسکردووە، بامداد بووە لە پەهلەویدا بامداد نووسراوە پاشان بووەتە-بامدادان، جێگای لەدایکبوونی دیسان لەلایەن مێژوونووسەکانەوە جیاوازیی هەیە، دینەوەری، ئەو بە خەڵکی ئەستەخر دادەنێت، ابوریحانی بیرونی ئەو بە خەڵکی نسا دادەنێت. دانەی (تبصرة العوام) ئەو بە خەڵکی تەبرێز دادەنێت.

## ابو ڕیحانی بیورتی:

له (آثار الباقية)دا دەڵێت مەزدەك كوڕی بامدادان خەڵكی نسا، كە سەرۆكی موبد، موبدان بە واتای- قازی قوزات- بووە. ئەوەش لە ڕۆژگاری قوبادی ساسانیدا دەركەوتووە. لەڕووی بەشداری ماڵی و ژنەوە یەك بێت، ئەمەشی بەشێوەیەكی زۆر فراوان بڵاوكردووەتەوە.

## تەبەری:

دەڵێت لە شاری مەزریە، یان مەدریە بووە، ئەوەی گرنگە مەزدەك داوای پێغەمبەری نەكردووە. بەڵكو خۆی بە پیاوێكی ئاینی زەردەشتی داناوە، بەلام هەندێك شت و هەندێك چارەسەری تایبەتی بۆ ئەو ئاینە داناوە.

## قوباد:

پاشای ساسانی، باوەڕی بە ئاینی مەزدەك هێناوە، هەندێك دەڵێن لەبەر ئەوە بووە، حەزی لە ئامۆزاژنێكی خۆی كردووە، بۆیە چووەتە سەر ئاینی مەزدەك. قوباد ماوەی پێنج ساڵ پشتیوانی لێ كردووە. قوباد لە ساڵی (٤٩٦)ز لابراو بەند كرا، براكەی ئەو (جاماسب) بووە جێنشینی، قوباد توانی لە بەندیخانە ڕابكات و پەنای بردە بەر (اخشونوار) پادشای هەیاتلەكان، ئەویش یارمەتی باشی دا و سوپایەكی بەهێزی بۆ ڕێكخست و بەرەو ئێران گەڕایەوە. ئەمەش لە ساڵی (٤٩٨-٤٩٩)ز بووە جاری دووەم بووەوە بە پادشا، دوای ئەوە پشتیوانی لە مەزدەكییەكان كرد، لە ساڵی (٥٢٩)ز قوباد باوەڕی وابوو ئیشی مەزدەكییەكان بەلایەكدا بخات، بۆ ئەم كارە كوڕەكەی بە ناوی

خەسرەو بەم ئیشە هەستا، ئەو بە فێڵکردن هەرچەندی توانی لە پێشەوا ئاینی مەزدەکەیانی بانگ کرد بۆ تەیسەفون، ئەوانەی هەموو کوشت، دوای ئەوە لە هەموو جێگاکاندا کەوتنە کوشتن و بڕین و ئازاردانی مەزدەکییەکان.

کەلمان هوار (١٨٥٤-١٩٢٧)ز یەکێك لە خۆرهەڵاتناسە گەورەکانی فەرەنسا لە دۆستە نزیکەکانی فەرهەنگ و زانیاری ئێرانی لە پەرتوکی ئێران و ئێرانی، دەربارەی مەزدەك وای نووسیوە: مەزدەك کوڕی بامداد لەنەی شاپوری خۆراسان چاوی هەڵهێناوە، بەرنامەیەکی ئاینی لە وڵاتدا هێنایە کایەوە، قوباد ئەوی ئازاد کرد بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی خۆی، قوباد بە ئاشکرا و بێ ترس پاڵپشتی و پارێزگاری لێکرد، زانیاری مەزدەك لە ڕێ و شوێنی باوەڕی مانی بوو، ئەو دەیوت مانی و ئاینەکەی خاوەنی ڕووناکی و تاریکی بووە، لای مەزدەك جیهان لە سێ شت دروست بووە: ئاو، ئاگر، زەوی. لەم سێ شتەش خێر و شەڕ دروست بووە.

خواوەند پادشا لەسەرەوەیە، چوار هێز بەرامبەری وەستاون: پاك، دانا، پارێزگاری، سەروەر، ئەم چوار هێزەش کاروباری جیهانیان خستووەتە سەر حەوت وەزیر بە ناوی: (سالار، پیشکار، پلوان یان پەروان، کاروان، ئیشو کاری منداڵانی لە ئەستۆدایە. پەرتوکی زەندمەزدەك).

مەزدەك دەیویست ڕووی خەڵکی بەرەو جیهانێکی مادی ڕاکێشێت لەسەر بنەڕەتی ئاینی زەردەشتی، هەروەها ڕووداوی سیاسی و ئابووری بگۆڕێت، تیۆری مەزدەك کە لە پەرتوکی (زەند)دا دەریبڕیوە پیاوانی ئاینەکان ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، چونکە دەیانزانی نابوتی و نەمانی ئەوانە، ئەو پەرتوکەی

مەزدەك بە ناوی زەندەوە هێنابووی- ڕوونکردنەوەیەکی تازەی هەبوو و لەگەڵ ئاینی مەزدەکدا وەك یەك نەبووە.

مێژوونووسانی ئیسلامی باوەڕیان وایە، زەند تەفسیر- ڕوونکردنەوەیەك بوو، کە مەزدەك بەشێوەیەکی بەرز و باش نووسیویەتی، هەروەها باوەڕیان وایە، پاش کوشتن و بڕینی مەزدەکییەکان، پەرتوکێك بە ناوی زەند لە ئێراندا هەبووە، کەمال پاشا لە نامەیەکدا (في تصحيح الفظ الزنديون)- ڕاستکردنەوە لە قسەی زەندەکاندا. دەڵێت: پیاوە دینییەکانی زەردەشت پەرتوکی زەندیان زۆر بە ترسناك دادەنا لە ئاینی مەزدایدا. بە پیاوە دینییەکانی زەندیان وتووە زەندێك، زەندێك بە یەکێکیان وتووە کە پەیڕەوی پەرتوکی مەزدەك بووبێت و زنديق-یان بە پەیڕەوانی ئاینی مانی و مەزدەك وتووە.

## اسعد تلس:

بە ڕیوایەتی خوارەزمی دەربارەی پەرتوکی زەند، بەدوور و درێژی باسی کردووە، واشی داناوە کە تەفسیری ڕوونکردنەوەی ئاوێستایە.

## نولدکە:

باوەڕی وایە کە ئایدیۆلۆژیەتی ئیشتراکی مەزدەك، لەگەڵ سۆسیالیزمی ئەمڕۆی ئێمەدا جیاوازییەکی هەیە، ئیشتراکییەتی مەزدەك، لەسەر بنەڕەتی ئاینی بووە، ئەو نەیتوانی بەرنامەی ئابووری خۆی لەڕووی ئیشتراکییەتەوە بچەسپێنێت، بۆیە لەم ڕووەوە شکستی بەدەست هێنا. لای مەزدەك پێنج شت

لە هەموو شت زۆر خراپتر بووە: کەلەگیری- تعصب، کینە، تۆڵە، پێویستی، مالکیەت- خاوەن زەوی و هەموو شتێك.

لای مەزدەك نابێت ژن و موڵك هەبێت، ژن بۆ هەموانە و مولکیش بۆ هەموانە، ئەمە بووە نارەزایی زۆر کەس لەم ڕووەوە.

ڕینالد نیکلسون دەڵێت:-

مەزدەك وەکو ئەفلاتون فەیلەسوف نەبووە، بتوانێت یەك سەرکردایەتی ئیشتراکی ئایدیۆلۆژی خۆی لەسەر کاغەز بهێنێتەوە، ئەو بەهاوکاری لەگەڵ پیاوە ئاینییەکانی خۆیدا گۆڕانێکی بەدی هێنا، بەڵکو ئەو پیاوێکی تێکۆشەر و ئازا و ڕاستکەرەوە بوو. باوەڕی مەزدەك بەرامبەر یەك بوون لە ژیاندا دژی فیودالیزم، ئەوەش کە نابێت ئەوانەی زەوییان هەبێت، پێویستە وەك جوتیار ڕەنج بدەن، لەم ڕووەوە دەبێت هەموان بەرامبەری بن و لەهەموو شتێکی دیکەشدا.

مەزدەك باوەڕی بە سێ شتی بنەڕەتی هەبووە: (ئاو، ئاگر، زەوی- خاك).

بە باوەڕی مەزدەك نابەرابەری و نەبوونی وەك یەك- لە بنەڕەتی کینە و تووڕەیی و شەڕەوەیە. مەزدەك بە پیاوە ئاینییەکانی خۆی ڕاگەیاندووە کە پێویستە پەیڕەوی دوو بنەڕەتی کە هەیە بیکەن، ئەوەش: قەدەغەکردنی کوشتن و زیان بە خەڵکی گەیاندن. ئامۆژگاری کردوون هەتا بەرامبەر دوژمنەکانتان میهرەبان بن و بۆ میوانداریی ڕووخۆش و هەتا گیانی خۆتان بەخت بکەن.

کوشتنی ماڵیات- حەیوانات و خواردنی گۆشت و خوێنی ئەوانە، بۆ خەڵکی حەرام کردووە، مەزدەك خەڵکی لە کینە و دوژمنایەتی و شەڕ و دووبەرەکی دوور دەخستەوە.

له تەنیشـت ئاینـەکانی مـەزدینا، زەروانـی، میترائـی، مـانۆی و ئـاینی مەزدەك هەبووە.

هەندێك ئاینی سامی نەژاد لە ئێراندا هەبووە، وەك یەهودی کە لە سـاڵی (٧٠٠)پ.ز سەلمان سەر پاشای ئاشوور، چووە سەر ئیسرائیل و شاری سـامەرا کە پایتەختیتان بوو، گرتـی و شەسـت هـەزار جولەکـەی لـەوێ هێنـا و لـە ناوچەکانی مادا داینان.

## سبی- صبی و مەندائی:-

### سبی:

کۆمـەڵێك بوون بـەپاڵی ئاینـەکانی ئێرانـی کۆنـدا، بەتایبـەتی لـەکاتی فەرمانبەری پارت و ساسانییەکاندا ژیاون، ئـەم کۆمـەڵـە، خۆیـان بـە سـبی ناوبردووە لە دەشتەکانی- میشان، لە سنووری انشان-ئـیلام، یـان سـۆمـەری کۆندا جێنشین بوون، مەندائی ناوی جێگایە و سبی ئاینی کۆمەڵێك بووە کـە بە عەرەبی (مغتسلە)یان پێ وتوون، بە واتـای ئـەو کەسـانەی بـە فـەرمانی پاکی گیان و لاشەی خۆیان لە ئاوی ڕووباردا شۆردووە و نیازی دڵـی خۆشـیان وتووە.

وشەی مەندا پاشماوەی سبییەکان بەشێوەی مادا و ئامادە هـاتووە، وشـەی مادی و مادی وەرگرتووە، کە لە زمان و مێژووی یۆنانی کۆندا (مەدی) و بـە زمانی عەرەبی پاش ئیسلام پێیان وتووە (مانگ). سـبییەکان لـە کەنهانـەوە کۆچـیان کـردووە بـەرەو بـاکووری سـوریا و لـە ناوچـەی حـەران هاتوونەتـە

دەروبەری فورات، ئەو کاتانە، ئەو جێگایانە سەر بە ماد بووە، بەواتە لەژێر فەرمانڕەوای مادەکاندا بووە. لەبەر ئەو هۆیە ناونیشانی ماد یان ماندایان بەخۆیانەوە ناوە، بە درێژیایی ئەو هەموو مێژووە ئەو ناوەیان بەخۆیانەوە پاراستووە.

## سبییەکان:

بنەڕەتی خۆیان لە میسرەوە دادەنێن لە کاتی کۆچکردنی یەهودییەکاندا لە میسرەوە بۆ کەنعان، نووسنی کەنعانیان بەکارهێناوە، بەم شێوە ئەم سێ تیرەیە (سبی، ئیسرائیلی، فەلەستین)ی خۆیان بە سامی و کۆن و خاوەن مافی پێشکەوتوو داناوە، هەروەها سامی و کەنعانی خۆیان ناسیوە و واش دەناسرێن، بەشێوەیەکی باسکردن، وەك ڕازیکردن مەندائی[*] و عبری بە میسری ئەناسن و گوایە سامی نەژاد نین.

مەندائییەکان دوای یەهودییەکان، دووەم لابوون کە کۆچیان کردووە بۆ سەر خاکی ماد لە فەلەستینەوە[**].

---

[*] هەندێك لە خۆرهەڵاتناسەکان و زمانناسەکان وەکو دکتۆر ماتسوخ و پرۆفیسۆر نولد، کە باوەڕیان وایە مانای وشەی (مەندای) صفەیە و مەندا بەواتای زانا و عیرفان. وەرگێراوە، وشەی مەندان بە واتای عرفانە- زانیاری.

[**] میشل، یان میسان هەردووکی یەکێکە، لە کۆتایی شاخی حەمرینەوە تا کەناری ڕووباری کارۆن و کرخە و دیجلەی پێ دەڵێن.

یەهودییەکان لە فەرمانڕەوای هەخامەنشینەکاندا ئاوارە و پەرتوبلاو بوون لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئێراندا، بەڵام سبییەکان پاش ئەوەی گوێزایانەوە بۆ خۆرئاوای ئێران، یان ناوچەی ماد ئەوەش لە گۆمی ڕۆخی ڕووباری فورات و دیجلەوە بەرەو دەشتی میشان ڕۆیشتوون و لە دەوروبەری کەرخی میسان- میشان جێگیر بوون و حکومەتێکی نیوە سەربەخۆیان هەبووە لەژێر فەرمانڕەوای میشان شاهی لە خانەوادەکانی ئاشانی و ساسانی بەڕێوەبراوە.

ئەمانە توانییان خۆیان و ئایین و نووسین و زمانەکەشیان بپارێزن لەکاتی فەرمانڕەوای ساسانی و ئیلامدا.

## سبی- صبی:

کۆمەڵێکن لەگەلانی سامی، کە جێگای ژیانی سەرەتای ئەوان لە میسر و فەلەستینی کۆندا بووە ئەمڕۆ لە باشووری ئێران و عێراقدا دەژین، مەندانییەکان دەتوانین بڵێین لە یەکەم دەرچووانی فەلەستین، نزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا لە ئەنجامی شەڕوشۆڕی ناوخۆیان لەگەڵ لاکانی دیکەدا، ناچار جێگاکانی خۆیان بەجێهێشتوو ەو کۆچیان کردووە بەرەو ڕۆخی ڕووبارەکانی ئەردەن و بەرەو باکووری سوریا و پاشان بۆ نێوان دوو ڕووبار و لەوێشەوە بۆ خۆزستان، کە لەژێر فەرمانڕەوای ئەشکانیدا بووە.

ئەمانە خاوەنی پەرتوکی ئاینین- مەندابییەکان خۆیان بە پیاوی ئاینی و ئادەم و شیت و نوح و بە یەحیا دادەنێن.

## مەندای:

ئەمانە ئادەم بە یەکەم پێغەمبەر و یەحیا بە دوا پێغەمبەر دادەنێن، مەندای و یەهودی بەشەڕ هاتوون لەسەر ئایین پاشان مەندابییەکانی فەلەستینیان بەجێهێشتووە و کۆچیان کردووە. ئەمڕۆ کۆمەڵی مەندائی لە شاری ئەهواز، ئابادان، خورەم شەهر، سەربەندەر، دەشتی میشان (سوسەن گرد، هویزە، بوستان) و لە عێراقدا لە بەسرە، بەغداد، حلفایە- حلە، کەرکوك، ناسریە، مەندەلی و لە عەمارە و دەوروبەریدا دەژین، لە کۆتاییدا هەندێك لە مەندابییەکان بەرەو ئەوروپا و ئەمریکا و ئوستralیا کۆچیان کردووە، هەندێکی دیکەیان بەرەو وڵاتانی دەوری خلیجی فارس ڕۆیشتوون و لەوێ دەژین.

ئەم شتانە لای ئەوان گوناهە، وەك:

دزی، درۆزنی، داوێنپیسی، ڕیور خواردن زۆر گوناهە لایان، مرۆڤکوشتن لە هەموو گوناهێك گەورەترە، کە بەهیچ جۆرێك پاك نابێتەوە. گۆشتی گا و ئەسپ و حوشتر حەرامە، ڕیشتاشین حەرامە.

گنزوربا: ناوی کتێبی پیرۆزی ئەوانە لە لایەکی دیکە بە گنزربا (Genza Rabba) نووسراوە.

مەندای: باوەڕیان بە خوا هەیە و باوەڕیان بەزیندووبوونەوە هەیە، باوەڕیان بە بەهەشت و جەهەنم هەیە... ئەمان بە بەهەشت دەڵێن (الـمادت هورا) بە

واتای جیهان ڕووناکی- ڕووناك. به جەهەنم دەڵێن (المـادة شـوخا)، بـه واتـای جیهانی خراپەکاران.

باوەڕیان وایه دوای مردن، ڕۆح له گیـانی مـردوو دەچـێته جێگایـەك بـۆ لێپرسینەوە، پێی دەڵێن (اواترمەزنیا) پـاش لێپرسـینەوە ئەگـەر بـاش بـوو، دەچێته بەهەشت و ئەگـەر خـراپ بـوو دەچـێته جەهەنـنـەم. لـه جەهەنمـدا- اواترمەزنیا جێگایەکی تیایه زۆر خراپه پێی دەڵێن (مگرانی).

کۆمەڵانی صبـی:- سبییەکان چوار بەش، یان چوار کۆمەڵه، یان فیرقەن:

١- خاوەن ڕووحانییەکان.

٢- خاوەن هەیکەلەکان.

٣- خاوەن خەڵکی.

٤- خاوەنی خربانیه، که بنەڕەتی ئەوە، پێی دەڵێن حرنائیه، یان حرانیه.

## ١- خاوەن ڕۆحانییەکان:

ئـەم کۆمەڵەیـه باوەڕیـان وایـه کـه جیهـان دروسـتکەری هەیـه، ئـەو دروستکەرەش زانا و دانایه، ناخۆشی و هیچ نابینێـت، کـەس نییـه بتوانێـت بگاته لای ئەو، تەنها بەهۆی ڕۆحی گیانی پاکەکانەوە نەبێت.

## ٢- خاوەن هەیکەلەکان:

باوەڕیان به ئەستێرەی حەوتەوانەوە هەیه، خۆر دادەنێن بـه خـوای هـەموو خواکان... هتد. پەرتوکی مەندائیییەکان: پەرتوکی ناسراوەکان بریتین له:

١- پەرتوكی گنزاربا (صحف ادم) كە پیرۆزترین پەرتوكیانە.

٢- پەرتوكی دراشا ادیهیی (زانیاری یەحیا)یە.

٣- پەرتوكی سیدرا ادنشماتا، دەربارەی كفن و دفنی مردووە.

٤- پەرتوكی قلستا دەربارەی یاسا و ژنهێنانە.

٥- پەرتوكی دیونان- دەربارەی باوەڕی ئاینییە.

٦- پەرتونكی بروح- دەربارەی بەخت، لەدایكبوون، باشە و خراپەی ئەو.

٧- پەرتوكی انیانی، یان پەرتوكی انا سعید، دەربارەی خوێندنە.

## ئەنجام:

ئەم نووسینە بریتییە لە دەستدرێژیکردنی دەوروبەری کوردستان دژی کورد لە هەموو لایەك، کە چۆن بەدیلی بە کوشتن و سووتاندن و بارکردن و وازهێنان لە ئاینی خۆیان- کۆچ پێ کردن لەو کاتەوەی کە مێژوو هەیە.

یەکەم: ئاینی کۆنی ئارییەکان و زیاتر زەردەشت پەرست بوون، تیرەکانی کۆن هەرلایەو بۆ خۆی ئاینێکی تایبەتی خۆی هەبووە. هەر لەسەر ئەو ئاینانە شەڕ و هەرا دروست بووە. ئەوانەی دەوڵەتیان هەبووە زیاتر سەرکەوتوو بوون. بۆ چەسپاندنی ئاینەکەیان، ئەم شتانەش دەگەڕێتەوە بۆ کاهینەکانی ئەو کاتانە، کە چۆن هەوڵیان داوە بۆ چەسپاندنی ئاینەکەیان، لەناو ئارییەکاندا- سرووشتپەرستن باو بووە. وەك پەرستنی ڕۆژ، یان ڕوناکی مانگ، ئاگر، بۆ هەرشتێك لەم بابەتانە شتێکیان داناوە بۆ پەرستن -ئاو- ئاناهیتایان داناوە کە زۆر بەڕێز بووە لەناویاندا- ئەمەش هەتا کاتی زەردەشتەکانیش هەر مابوو، وەك لە بێستونا پەیکەری ئاناهیتا هەرماوە، یان مەلائیکەتێك لەشێوەی پیاوێکی پیردایە، دوو باڵی هەیە و لەکاتی فڕیندایە بە ناوی (فروهەر) لە کاتی زەردەشتەکاندا هەبووە، تائێستاش زەردەشتییەکان وەك پەیکەرێکی بچووك دروستکراوە دەیکەنە ملیان.

کاسییەکان: کاسییەکان کە زیاتر لە پێنج سەدە فەرمانڕەوای نێوان دوو ڕووباریان کردووە. خوای ئەمان جیاواز بووە لەخواکانی دیکە. وەك خوای

ئەهوازەکان. هەروەها خوای ئەمان لەگەڵ خوای ئاشوورییەکاندا جیاواز بـووە، ئاشوورییەکان سامین و خواکەشیان وەك ئاشوور.

هورییەکان: خوای خۆیان هەبووە و پاش ئـەوەی بوونـە میتـانی و گـەورە بـوون، بەرامبـەر بـە میسـرییەکان شـەڕیان کـردووە، پاشـان پێکهـاتوون و ئاشتبوونەتەوە. کچی یەکێك لە پاشاکانی میتانی بە ناوی (ئاتوهیباوە) دراوە بە فیرعەونی میسر لە (١٣٠٠)پ.ز. بەم شێوەیە کار وا ڕۆیشتووە، تا هـاتنی ئاینی زەردەشـت، هـەموو ئێـران و کوردسـتانی گرتووەتـەوە. ساسـانییەکان بەڕەسمی ئاینی زەردەشتیان کردە ئاینی ڕەسمی دەوڵەتی ساسانی، پێش زەردەشت پەهلەوییەکان هەمان ئاینیان هەبووە کە زەردەشتییە.

لـە ئـاینی ساسـانییەکاندا- ئـاینی مەسـیحی هـەبووە، بەتایبـەتی لـە ئەرمینیا و دەوروبەری و لە هـەولێریش هـەبووە. ئـاینی زەردەشـتی جارجـارە بەتونـدی بەرهەڵسـتی ئـاینی مەسـیحییەتی کـردووە. ئـاینی زەردەشـتی بەشێوەیەکی فراوان لەکاتی فەرمانڕەوای ساسانییەکاندا هەبووە.

کە ئیسلام هاتن ساڵی (٥٣٧)ز، سەرکەوتن بەسەر ساسـانییەکاندا، ئـەم شەڕ و هەرایە تا ساڵی (٥٤٩)ز خایاند، زۆر بەتوندی دژی ئـاینی زەردەشـتی بوون، ناویان لـێنان مەجوسی- ئاگرپەرست.

بە هەموو توانایانەوە دژایەتییان کردن... ناچار پیـاوانی سـەر بـە ئـاینی زەردەشت چوونە ئێران و پاشان بەرەو هیندستان ڕۆیشتن.

عارەب کە گەیشتنە کوردسـتان، چـییان کـردووە، کوردەکـان پاڵەوانانـە بەرەنگاری عارەب بوونەتەوە، دوای ئەوەی مدائن لە ساڵی (١٦)ك بە دەسـتی

سەعدی کوڕی وەقاس داگیرکرا، یەزدی کوڕی سەرۆکی ساسانی لە تەیسەفونەوە هەڵات و گەیشتە زەهاو. لە هەمان کاتدا سەعد کوڕی وەقاس، هاشمی بن عەتەبەی ئەبی وەقاسی بە دوانزە هەزار کەسەوە نارده سەر سوپای ئێران، لە جەلەولا عارەبەکان شەڕێکی خوێناوییان بەرپاکرد پاش کوشتن و وێرانکردن عارەبەکان سەرکەوتن. لە زەهاو عارەبەکان سەرکەوتن و یەزدی گورد کشایەوە بۆ نهاوەند.

لە ساڵی (١٨)ك. سێ لەشکری عەرەبی نارده سەر جزیرە بە سەرۆکایەتی عەیاض بن غانم، ناوبراو لە ماوەی (١٨) مانگدا شارەکانی سەر زەمینی جزیرەی یەك بەدوای یەکدا گرت. تەنها عین تەمر نەبێت کە نەیانتوانی بیگرن، شارەکانی سنجار، ئورفە، حەران، نەسیبین، ڕەقە، ماردین، دیاربەکر بە دەستی عەیاض گیران و دوای ئەوەش لەشکرێکی نارده سەر مەلاتییە و ئەوانیشی داگیرکرد.

لە ساڵانی (١٨و ٢٣)ك. لەشکری عارەب بە سەرۆکایەتی عەزەرە بن قەیس بەرەو شارەزوور ڕۆیشتن، کوردەکان پاڵەوانانە بەرەنگاریان وەستان، کوشتارێکی زۆریان لە عارەب کرد و ناچار عارەبەکان پاشەکشەیان کرد و کشانەوە. لە ئەهوازیشدا کوردەکان دلێرانە بەرامبەر عارەب وەستان، ناچار بوون لەشکرێکی گەورەتر بە سەرۆکایەتی (عەتەبە بن فرقد السلمی) ڕەوانەی شارەزوور و سامغان بکات، دوای شەڕێکی گەورە و خوێنڕشتنێکی زۆر لە هەردوولا، شارەزوور گیرا بە فەرمانی تایبەتی عەتەبە زۆر بێبەزەییانە لەگەڵ کوردەکاندا ڕەفتاریان دەکرد و لەسەریان دەدان.

بلازەری نووسیویەتی (عەتەبە) لە موسڵدا بە فەرمانی عومەری خەلیفە خاکی کوردەکانی داگیرکرد و قەڵاکانی تێکدان.

کوردەکان دلێرانە لەپێناوی پارێزگاریی خاکی خۆیاندا شەڕیان لەگەڵ عارەبدا کردووە. لە زۆر جێگای کوردستان- گۆڕستان هەیە بە ناوی دۆڵی کافران و دۆڵی ئەسحابەکان، دۆڵی کافران بە گۆڕستانی کوردەکان دەڵێن.

سەلمە بن قەیس الأشجعي، شەڕی لەگەڵ کوردەکانی ناوچەی ماسەبزان و سەیرە لە لوڕستان کردووە و لەم شەڕەدا زۆر لە عارەب کوژراوە.

لە ساڵەکانی (١٨و ٢٣)ك. جاردو عەبدی بۆ داگیرکردنی ناوچەی دارا بەگ دونشا و ئەهواز ڕۆیشتووە. شەڕێکی گەورە بووە، کوردەکان زۆر دلێرانە بەرەنگاریان بوونەتەوە، دوای داگیرکردنی عارەب هیچیان نەهێشت.

لە ساڵی (١٩)ك و (٦٤٠)ز هورافارنی پادشای خورستان داوای یارمەتی لە کوردەکانی موکریان و ئازربایجانییەکان و هەمەدان و کرماشان کرد، لە شەڕێکی قورس لە دزپول لە کوردی موکریان و سێ تیرەی گەورەی کوردی ڕەوەند و شول و زوردلان بوون پێکەوە بەرامبەر بە عارەب شەڕیان کردووە. کوردی شاهید و گیدچە هاواری هورزم نەدەچوون نەوبەخت لە شاهنامەی پەهلەوی-دا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٥، ١١، ٣١) بەدرێژیی لەوە دواوە باسی ئەوانە دەکات.

هورمزان لەو شەڕەدا گیرا و ڕەوانەی مەککە کرا، پاش ساڵێك هورمزان بەدەستی ئەبو حەفسی کوڕی عەمەری خەتاب کوژرا، لەسەر ئەوەی (ابو لؤلؤ) عومەری کوشتبوو.

له شەڕی نەهاوەند دا زۆر گەرم بوو، زۆر له کوردەکان کوژران. لـه سـاڵی (١٦)ك. بەعی بن الافکل و ابن الهرشمه، لەدوای گرتنی موسڵ هێرشیان کرده سەر دانیشتووانی کوردەکان لـه کێوەکـانی ئـەو دەوروبـەرەدا هـەموو قـەڵای کوردەکانیان ڕووخاند. هەموو ئەو جێگایانەیان بووه موڵکی عارەب.

شـەڕی ماسـپیدان ئـازین کـوڕی هـورمز لـه کوردەکـان لەشـکرێکی ڕێکخستبوو، شاری ماسپیدانی کردبـووه جێگـای کۆبوونـەوەی لەشـکرەکەی. لەملاوه ظرار بن الخطاب، به لەشـکرێکی زۆرەوه چـووه سـەر ماسـپیدان لـه دەشتی ماسپیداندا شەڕ دەستی پێ کرد و کوشتارێکی زۆر کرا، ئازین بـەدیل گیرا، ظرار دەستبەجێ سەری بڕی و لەشکر شکا، دوای ئـەوه شـەڕ و کوشـتار کەوته لای سیروانەوه.

رحلات الفتوحات الأسلامیة، جلد-یەك، لاپەڕە (١٣٧)دا دەڵێت:

وقتـل خلقـاً کـثیراً مـن الأکـراد. لـه سـاڵی (٢٣)ك سـاریه بـن رنـیم، لەشکرێکی زۆری برده سـەر کوردەکـان لـه نسـاو دارابـگ، پـاش شـەڕێکی خوێناویی داگیرکران و تاڵان و کوشتنێکی زۆری لێکردن.

سـەیر ئەمەیـه ئـاینی زەردەشـتی یـەك خـوای دەپەرسـت بـه نـاوی (ئاهورامەزدا)و باوەڕیان به ئەهریمەن نییـه، کـه وەك شـەیتان. باوەڕیـان بـه بەهەشت و جەهەنم، به هـەموو کردەوەیـەکی زۆر بـاش و پـاك هەیـه. جگـه لەمانه باوەڕی ئیسلام به جولەکه و مەسیحی که خاوەنی کتابن و به کافریان دانـانێن. لـەملاوه بـه زەراتەشـتی کـه خـاوەنی ئاڤێسـتایه و ئـەو هـەموو

شتانەشیان هەیە، بە کافریان داناون و نەیان هێشتن، لەبەر ئەوەی زەردەشتییەکان ئارین و سامی نین وتیان ئەمانە (مەجوسین) ئاگرپەرستن.

دوابەدوای داگیرکردنی عارەب و هێنانی قورئان بۆیان، کوردستان وای لێهات: ئاینییەکان کە بە وردی نووسراوە. کاکەیی، حەقەکان، عەلی ئیلاهی لەناو کوردەکانی تورکیادا هەیە.

## شەبەك، بجورد:

هەر لایە بۆ خۆی خوایەکی هەبووە، پەرستیویەتی باوەڕیان بە ئیسلام نەبووە. سۆفی و تەریقەت هەردوولا زۆر دژی یەکتر بوون، سەیری مێژووی شێخ مارفی نۆدی خاوەن تەریقەت و مەولانا خالید کە چۆن دژی یەکتربوون، خوێندەواریی و نەزانین وای لەو میللەتە هەژارە کردبوو.

## گوێزانەوەی کورد لە سەرەتاوە:

کۆنترین کرداری زانراوی کۆچاندنی لە مێژوودا تا ئێستا کۆنترین کرداری لەوجۆرە کە زانیاریمان لەو بارەیەوە هەبێت دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاشایانی بنەماڵەی سێیەمی ئورو (٢١١٢-٢٠٠٤)پ.ز لە کۆی پێنج پاشای ئەم بنەماڵەیە سیانیان لەشکرکێشییەکانیان بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان کۆ بووە. ئەو ئۆردووگایانەی لە نزیك شاری (نەیپور)ی کۆندا بوو، ئەو خەڵکە ڕاگوێزراوانە دروستکراون. کە لە ئەنجامی شەڕەکانیاندا ڕایان پێچاون،

ئەمانەش خەڵکانی کوردستان بوون. یەکەمین ڕاگوێزراوان و بەتاڵانبراو بۆ خەڵکی کوردستان دروستکراوە.

## یەکەم پاشای ئاشوور:

سیاسەتی بە کۆمەڵ کۆچکردن و دوورخستنەوەی گرتووەتە بەر، ئاواد نێراوی یەکەم لەساڵی (١٢٧٥-١٣٠٧)پ.ز. لە هێرشەکەیدا بۆ سەرنشینی خانیگالباتی ئەنجامی دا، هۆکەشی جیابوونەوەی سەربەخۆیی هەڵدانی (واساشاتتا)ی پادشای ئەم شانشینە بوو لە وڵاتی ئاشوور. وڵاتەکەی خستە ژێر دەستی خۆی، دەڵێت: (واسشاتتا) خۆی و خێزانی و کوڕی و گەلەکەیم بەدیل گرت و هێنامن.

شالمانسەری یەکەم (١٢٤٥-١٢٧٤)پ.ز. کوڕەکەی بە ناوی توکولتی نینورتای یەکەم (١٢٠٨-١٢٤٤)پ.ز. کوڕی شالمانسەر لەسەر ئەم سیاسەتە بەردەوام بوون.

تیگلات پلایسەری سێیەم (٧٢٧-٧٤٤)پ.ز. لە کۆچاندندا لەوانی پێشتر زیاتر ڕۆیشتووە، تەنها لە یەك لەشکرکێشیدا (٦٥٠٠٠) خەڵکی لە وڵاتی میدیاوە ڕاگواستووە، هەموو وڵاتەکەیان کاول کرد. لە سوریاوە (٢٠٠٠٠) کەسی لەوێوە هێنا بۆ چیاکانی زاگرۆس. لە ڕۆخی چەپی دیجلەوە (١٨٠٠٠) کەسی ڕاگواست بۆ سوریا و (١٥٤٠٠٠) کەسم لە باشووری میزۆپۆتامیاوە ڕاگواست، هەندێ خەڵکی دیکەیانم لە جێگایانی دیکەوە دەهێنا بۆ جێگای کۆچکردووەکان.

سـارگۆنی دووەم: (٧٠٥-٧٢١)پ.ز دەڵێـت: خـەڵکی خاخـار، کیبابـای شارداریان بۆ ئەم شارەم گرت و تالانم کردن، خەڵکی شوێنەکانی تر کە داگیرم کردبوو، هێنامن بۆ ئەوێ.

سەرباری کۆچاندنی دانیشـتووان، ڕەفتـاری سـووتاندنی شـار و ئـاوایی و فەوتاندنی باخ و بێستان و شینایی بۆ ئەوەی نائومێد بن لە گەڕانەوەیان.

## چەکی خواوەندی ئاشوور:

کـارزابو، کارکسـین، کارئـەدەڵ، کارعیشـتار- ئەمانـە هـەمووی نـاوی خواکانی ئاشوورییەکانن.

## سەرچاوەکان:

١- شۆڕشی کوردستانی عێراق، بەشی یەکەم، لە ئەیلوولی ١٩٦١-١٩٦٣.
لەلایەن کۆمیتەی بەرگریی لە مافەکانی گەلی کورد- نووسینی: د.عیسمەت شەریف وائلی (٥٠٠٠٠٠) نیو ملیۆن کم٢.
٢- جەلال تاڵەبانی لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی (٤٩٩٦٥٠کم٢).
درێژییەکەی لە باکوورەوە بۆ باشوور هەزار کیلومەترە.
٣- هەزار مێرد، ژمارە (٥)، ڕەگەزی کورد، د.نەبەز مەجید ئەمین.
٤- العراق فی التأریخ، (٣٦) مامۆستا نووسیویانە.
٥- مێژووی گەلی لوللو.
٦- نەورۆزنامەی کورد، ئەیوبیان.
٧- هەزار مێرد ژمارە (٧) ساڵی دووەم ئازاری ١٩٩٩ .
٨- کەرکوك گۆڤارێکی ڕووناکبیری گشتییە، ژمارە (١)، ساڵی دووەم، هاوینی ٢٠٠٠، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئاسەوارناس عەبدولڕەقیب یوسف.
٩- ڕەشاد میران ، ڕەوشی ئاینی و نەتەوی لە کوردستان ستوکهۆلم ١٩٩٣.
١٠- اليزيديون في حاضرهم وماضيهم، السيد عبدالرزاق الحسني، الطبعة السابعة، ١٤٠٠-١٩٨٠.
١١- ڕەشاد میران ڕەوشی ئاینی بەشێکی دیکە.
١٢- هەزارمێرد ژمارە (١٩) ساڵی پێنجەم ئازاری ٢٠٠٢ نەورۆز ٢٧٠٢ .ئاینی کورد پێش ئیسلام .

١٣- د.مەسعودی گوڵزاری، کرمانشاه ،کوردستان، بەرگی یەکەم.
١٤- حسێن حوزنی لە کتێبەکەیدا.
١٥- ماد میدیا، د. یاکونوف، ترجمة: برهان قانع.
١٦- کورد و کوردستان، جلدی (١،٢،٣)، محەمەد ئەمین زەکی.
١٧- حەسەن پیرنیا، مێژووی ناوی ئاریان لە ئێران.
١٨- تأریخ ایران باستان، جلد(ا)، حەسەن بیرنیا مشیر الدوله.
١٩- کتێبی ژمارە (٥) لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد، بەرگی دووەم، ساڵی ١٩٨٣، شارەزوور و شارەزوورییەکان.
٢٠- پێشەنگ، ژمارە (٢٠)، ساڵی حەوتەم، تەمموزی ١٩٩٠، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مامۆستا کەلیمواللە تەوەحودی، دانەری کتێبی حەرەکەتی کورد، تأریخی کورد بۆ خوراسان.
٢١- تأریخ ئیران ازدەران باستان تا پایانی سەدەی هەژدەیەمی میلادی، دانەری درۆبیکو لاسکایا.
٢٢- العراق في التأريخ، شەش بەشە.
٢٢- فرانتس هیندریك وایباخ، کاردو پیاچوونەوەی د.جەمال ڕەشید ئەحمەد.
٢٣- کوردستان والأکراد، دراسة سیاسیة اقتصادیة، د.عبدالرحمن قاسملو.
٢٤- تأریخ سیاسی ساسانیان، جلدی(١)، دانەری د.محەمەد جەواد مەشکور (پەیکوڵی).
٢٥- اسیای حەفت سەنگ اثر باستانی پارێزی استشارات، دنیای کتاب.

٢٦- ایران از اغاز تا ئیسلام تألیفی گیرشمین، رئیس هەیئەت باستان شوناسی فرنسوی در ایران، ترجمە: د.محمەد موعینی، استاد ادبیـات فـارس دانشـگای تەهران تگا و ترجمەی نشر کتاب تهران، ,١٣٤٤
٢٧- هـەزارمێرد، ژمـارە (٢)، سـاڵی یەکـەم، کـانوونی یەکـەم- ١٩٩٧، شوێنەواری پەیکوڵی، نووسینی: هاوار ئەنوەر.
٢٨- یەزیدییەکان ئاینی یەزیدی، نووسینی: شاکر فەتاح، یەزیدییەکان خـوا ناسن دێوپەرست نین.
٢٩- اسیای حەفت سەنگ آثر باستانی پارێزی، دەربارەی کۆکردنەوەی خەڵکی لە شاری بم.
٣٠- اصل ونسب ودین های ایرانیان باستان، تألیف: عەبدول عضیم رەضائی، زمستان ١٣٤٨، چاپ طلوعی ئازادی.
٣١- ایران در عهد باسـتان و تـأریخ اقـوام و پادشـاهانی پـێش ئیسـلام، د. محەمەد جەواد مەشکور، مامۆستای دانشگا.
٣٢- برسی مختصر از تأریخ اریای کردان، نووسینی: پرۆفیسۆر: تۆفیق وەهبـی و مترجم: جەمالەدین حوسێنی.



پەیکەری سەرێك- وێنەی پاشای گوتییەکان، لە حەوجۆش دروستکراوە




**شوێنی نیشتەجێی کۆمەڵە نەژادەکانی سەرزەمینی ماد**

**لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین**



نووسراوەی کۆنی سەردەمی هەخامەنشینەکان

بە زمانەکانی: پارسی کۆن، عیلامی، بابلی..

کە لەسەر بەردێك نووسراوە.. مۆزەخانەی ئەمیتاج



پەیکەرێك لە هۆرێن و شێخان



بەزۆر کۆچاندنی مادەکان، لەڕووی بەردێکی ئاشوورییەکان لە نەینەوا کێشراوە، سەدەی حەوتەمی پێش زایین



ئاشوورییەکان دیلەکان دەکوژن- لەڕووی نەخشی دەروازەی(بالاوات)ی شەلمانشاری سێیەم وەرگیراوە.. لە سەدەی نۆیەمی پێش زایندا



ئەشکەنجەدانی پێشەوا گیراوەکان، کە دژی ئاشوورییەکان وەستاونەتەوە
لە نەینەوا نەخشکراوە. (سەدەی حەوتەمی) پێش زایین




**شوێنی نیشتەجێی کۆمەڵە نەژادەکانی سەرزەمینی ماد**

**لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین**

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (٢٠١٣)ی
## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئاینی کۆن و کۆچکردن لەکوردستاندا | عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی) | مێژووی | ٩٤٣ |
| ٢ | بیرکردنەوە | عەزیز جەلال عەزیز | زانستی | ٩٤٤ |
| ٣ | سۆشیال دیموکرات و دەوڵەت | دڵشاد تاڵەبانی | لێکۆڵینەوە | ٩٤٥ |
| ٤ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٤ |
| ٥ | دیوانی ع.ح.ب | محەمەد حسین بەرزنجی | شیعر | ٩٤٦ |
| ٦ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٥ |

# Aynî Kon û Koçkirdin le Kurdistanda

## Kokirdnewe û Nûsînî Ebdullla Qeredaxî'

بێگومان مێژووی گەڕاندنەوەی نەژادی کورد بۆ کۆمەڵە کۆنەکانی وەک گۆتی، لۆلۆبی، کاشی، مدی، ئاری و... هتد بۆچوونێکی بەهێزتر دەبێت لە بۆچوونەکانی دیکە و ئەمەش بۆچوونی زۆرێک لە مێژوونااسانە.

لە ڕوویەکی دیکەوە پرۆفیسۆر (کوردیس) پێی وایە، کاردۆخییەکان ناوانی سەرەکی و ڕاستەوخۆی کوردە، هاوچەرخەکان و خودی کاردۆخیش ناولێنانێکی نەتەوە زمانەوانییە و لەیەک کاتدا واتایەکی ئەتنیکیشی هەیە، بەڵگە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ناولێنانی (کارد) ناولێنانێکی نەتەوەیی نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی (کاردا)، کە لە نووسینە مێخییەکاندا ناوی هاتووە.

زینۆفۆن باسی ئەو ناوچەیەی کردووە کە کاردۆخییەکانی تیابوون و (بۆتان)ای ئێستا دیاریکراوە، بە تێگەیشتنی ناوەڕۆکی وشەی (کورد) کە بە مانای (کۆچ-الرحل) دێت.

کورد واتایەکی فراوانتری هەیە، کە چەند کۆمەڵێکی کۆچەری لە نەتەوەکانی تریشی لەخۆگرتووە، بەڵام (کاردۆ) چەمکەکانی فراوان نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دوای ئەوەی کە ئەو ناوچەیەی بە (کاردۆ ناودەبرا، ناوی (جزیرە ابن العمر)ای لێنرا، بەتەواوەتی بەرەو نەمان و ونبوون چوو.

چاپ و بڵاوکردنەوەی

2013